# پاداشتی کارە چاکەکان

## لە قورئانو لە سوننەتە صەحیحەکان

نووسینی

سیروان کاکە أحمد

پێشەکی

پرۆفیسۆر. د. أحمد شێخ مُحَمَّد بالیسانی

ناریین

أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ

﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٌ عَظِيمٞ ٩ ﴾.المائدة

خوا بەڵێنی داوە بەوانەی ئیمانیان هێناوەو کردەوە باشەکانیش ئەنجام دەدەن، لێبوردنێك‌و پاداشتێکی مەزنیان هەیە.

## پاداشتی ئەم کتێبە
## پێشکەش بێ بە:

* دایك‌و بابم، هاوسەرم، کاك سامانی برام، خوشکەکانم، برادەرانم.

* هەر کەسێك کە دەیخوێنێتەوە کاری پێدەکات‌و خەڵکیش فێر دەکات.

## پێشەکی:

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِين، الحَمْدُ للهِ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرَاضِين، الحَمْدُ للهِ كَمَا يَنْبَغِي لِجَلالِ وَجْهِهِ، وَلِعَظِيمِ سُلْطَانِهِ، الحَمْدُ للهِ القَائِل: ﴿ وَذَكِّرْ فَإِنَّ ٱلذِّكْرَىٰ تَنفَعُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥٥﴾ ﴾ الذاريات، وَصَلَّى اللهُ تَعَالَى وَسَلَّمَ، وَبَارَكَ عَلَى سَيِّدِ الْمُرْسَلِينَ، وَخَاتَمَ النبيّينَ مُحَمَّدٍ، وَآلِهِ أَجْمَعِينَ مِنَ الصَّحْبِ، وَالأَزْوَاجِ، وَالقَرَابَةِ، وَالتَّابِعينَ لَهُمْ بِإِحْسَانٍ إِلى يَوْمِ الدِّين، ثُمَّ أَمَّا بَعْدُ..

**لە ژێر ڕۆشنایی ئەم فەرموودەی پێغەمبەری خوا[١] کە دەفەرموێ: یەکێك لە ئێوە بە بڕوادار دانانرێ تاکو چی بۆ خۆی پێ خۆشە، بۆ براو خوشکی[٢] مسوڵمانیشی پێی خۆش نەبێ.**

**هەڵسام بە کۆکردنەوەی چەند ئایەت و فەرموودەیەك لە دوو توێی ئەم کتێبە، کە باسی پاداشتی کارە چاکەکان دەکەن، بۆ ئەوەی زیاتر گەرم و گوڕو سوورتر بین لەسەر ئەنجامدانی کاری چاك و بە دەستهێنانی ڕەزامەندی خوای پەروەردگار.**

---

١) {لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى يُحِبَّ لأَخِيهِ، مَا يُحِبُّ لِنَفسِهِ}، (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٢١٨٧)).

٢) هەرچەندە لە فەرموودەکە باسی خوشك نەکراوە، بەڵام زۆربەی دواندنەکانی پێغەمبەر لەگەڵ پیاوان بووە، بۆیە وای فەرمووە، ئەگەرنا هەر بۆ خۆی ﷺ فەرموویەتی: {إِنَّمَا النِّسَاءُ شَقَائِقُ الرِّجَالِ} (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (١١٣)، وَصَحَّحَهُ العلامة الألباني).

## پێشەكی پرۆفیسۆر. د. أَحْمَد شێخ مُحَمَّد بالیسانی

### بە ناوی خودای گەورەو میهرەبان

شاعیری عەرەبی دەڵێ:

علی قدر أَهْلِ العَزْمِ تَأْتي العَزَائِمُ

وَتَأْتِي عَلَى قدر الكَرِيم المكارم

وا دیارە خاوەنی ئەم كتێبە خاوەن هونەرو هیممەتێكی زۆرە، كە هەڵقوڵاوە لە باوەڕو دینداری بە سۆزی بۆ بەشدار بوون لە ڕۆڵی ڕێڕەوی ڕۆشنبیری ئیسلام.

خزمەتكردنی قورئانو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ گرنگو بەرزە چونكە بەرزترینو بەپیتترین قسە قورئانە، بۆیە خوێندنەوەو فێركردنی خێرێكی گەورەیە، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {مَا مِنْ قَوْمٍ يَجْتَمِعُونَ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللهِ عَزَّوَجَلَّ يَقْرَءُونَ وَيَتَعَلَّمُونَ كِتَابَ اللهِ يَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ، إلاَّ حَفَّتْ بِهِمْ الْمَلائِكَةُ وَغَشِيَتْهُمْ الرَّحْمَةُ، وَذَكَرَهُمْ اللهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ، وَمَا مِنْ رَجُلٍ يَسْلُكُ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ بِهِ الْعِلْمَ إلاَّ سَهَّلَ اللهُ لَهُ بِهِ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ..}[١]، هەروەها پێغەمبەر ﷺ دووعای بۆ ئەو كەسە كردوە كە خەریكی فەرموودەو سوننەتەكانیەتی، وەك فەرمویەتی: {نَضَّرَ اللهُ امْرَأً سَمِعَ مَقَالَتِي فَوَعَاهَا وَحَفِظَهَا وَبَلَّغَهَا فَرُبَّ حَامِلِ فِقْهٍ إِلَى مَنْ هُوَ أَفْقَهُ مِنْهُ..}[٢].

جا ئەم كتێبەی كە خاوەنەكەی نوسیویەتی پێوە ماندوو بووە هیممەتێكی زۆری تیادا خەرج كردوەو، چاوم پێدا خشاند، وا دەركەوت كە كارێكی زۆر تایبەتو نایابەو خزمەتێكی ڕۆشەنبیری دیاری كردوە، سكاڵام

---

١) مسند الإمام أحمد ٢|٤٠٦ الحديث رقم ٩٢٦٣ .

٢) سنن الترمذي ٥|٣٤ الحديث رقم ٢٦٥٨ .

لە خوایە کە سوودێکی زۆری هەبێ بۆ خوێنەوارانی کوردی خۆشەویستو بۆشایێك پڕبکاتەوە لە کتێبخانەکانی کوردستان.

ئیتر خوا پاداشتی بداتەوەو لەو لە ئێمەو خوێنەران خۆش بێت، بە بەهەشتی فیردەوسمان شاد بکات.

## نێوەڕۆکی ئەم کتێبە:

١- پێناسە کردنی ناوونیشانی هەر بەشێك لە ئەسڵی زمانو، لە زاراوی شەرعدا.

٢- سەرەتا نووسینی چەند ئایەتێك دەربارەی ئەو بابەتەی کە کراوە بە ناوونیشان، پاشان نووسینی چەند فەرموودەیەك لەوبارەوە.

٣- دیاریکردنی پلەی (صَحِیح)یو (حَسَن)ی، فەرموودەکان.

٤- مانا کردنی فەرموودەکان دەقاو دەق وەك خۆی.

٥- هەوڵدراوە زۆربەی فەرموودەکان پاداشتەکەیان تێدا باس کرابێ، جاری واش بووە فەرمایشتێك هەرچەندە پاداشتەکەی تێدا باس نەکراوە، بەڵام هاندانێکی چاکی تێدا بووە، بە باش زانراوە کە بهێنرێتە نێو دوو توێی ئەم کتێبەوە.

٦- لە کۆتایی هەندێك بابەت بەسەرهاتێك باسکراوە.

## ڕوونكردنەوەی ناوونیشان

**پاداشتی كارە چاكەكان لە بەرگی كتێب، پایەو پاداشت لە نێوەڕۆك !**

**پاداشت**: بریتیە لە: مەبەست، ئامانج، بەرهەم، دیارە ئینسان كە لە ژیان هەوڵدەدات مەبەستێكی هەیە، ئەویش بریتیە لە گەیشتن بە ئامانج، وە بە دەستهێنانی ئامانجی ئینسانی مسوڵمانیش بریتیە كۆكردنەوەی زۆرترین بەرهەم بۆ بە دەستهێنانی زۆرترین پاداشت، تاكو شوێنێكی بەرزی لە بەهەشت پێ بە دەست بێنێ.

**كار**: وشەی كار لە زمانی عەرەبی واتە: (عَمَل)، وە وشەی: (فعل) واتە: كردار، (قَول)یش، واتە: گوفتار، جا بۆیە وشەی (كار)مان[(**)١] بەكارهێنا، تاكو هەم كردارو، هەم گوفتار بگرێتەوە، چونكە جاری وایە لە فەرموودەیەك پاداشت لەسەر كردارێك وەردەگیرێ، وەك: یارمەتی دانی هەژارێك‌و نەدارێك، جاری واش هەیە بە هۆی گوفتارێك، وەك: زیكری خوا كردن بە زار (زمان).

**چاكەكان**: واتە: لەم كتێبە تەنیا باسی كاری چاك كراوە، نەك كاری خراپ، وە ئەگەر خوا پشتیوان بێ، دوای تەواو بوونی ئەم زنجیرە، زنجیرەی (سزای كارە خراپەكان لە فەرموودە صەحیحەكان) ئامادە دەكەین، هەروەك ئامادە سازیی بۆ كراوە.

---

(**)- بەلگەشمان بۆ ئەو قسەمان ئەم فەرمایشتەیە: {إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**، (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥٠٣٦)، عَنْ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، وە زانایانیش یەكدەنگن مەبەست لەو (أعمال)ە، قسەو كردارە، ئەگەرنا دەیفەرموو: {إِنَّمَا الأَفعَالُ بِالنِّيَّاتِ}، یان دەیفەرموو: {إِنَّمَا الأَقوَالُ بِالنِّيَّاتِ}، كەواتە: وشەی: (عمل) هەم (قَول)و هەم (فعل)یش دەگرێتەوە، هەرچەندە ڕەنگە هەندێ جار بۆ خۆش خوێندنەوەی خوێنەر زۆر پابەندیش نەبووین بەو (زاراو)انەوە.

**دەربارەی نێوەڕۆکیش کە: ( پایەو پاداشت )ی بۆ بەکارهێنراوە، دەڵێین:**

**پایە**: بریتیە لە پلەو پێگەو مەنزڵێکی بەرز، لە زمانی عەرەبی وشەی (فَضْل)ی پێ دەگوترێ، ئەم وشەمان بۆ ئەو فەرموودانە بەکارهێناوە کە ڕاستەوخۆ پاداشتەکەیان تێدا بەیان نەکراوە.

**پاداشت**: پێشتر باسمان کرد مانای چییە، بەڵام لێرەدا هەر دەڵێین: ئەم وشەمان بۆ ئەو فەرموودانە بەکارهێناوە کە ڕاستەوخۆ پاداشتی کارە چاکەکەی تێدا بەیان کراوە.

# بەرچاو ڕوونی

لەبەر ئەوەی هەموو هەوڵی ئێمە بۆ بەدەستهێنانی گەورەترین پایەو پاداشتە، وە گەورەترین پایەش بریتیە لە زیکری خوا سبحانەو تعالی، وەك لەم فەرموودەدا هاتوە: {عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَلا أُنَبِّئُكُمْ بِخَيْرِ أَعْمَالِكُمْ، وَأَزْكَاهَا عِنْدَ مَلِيكِكُمْ، وَأَرْفَعِهَا فِي دَرَجَاتِكُمْ، وَخَيْرٌ لَكُمْ مِنْ إِنْفَاقِ الذَّهَبِ وَالْوَرِقِ، وَخَيْرٌ لَكُمْ مِنْ أَنْ تَلْقَوْا عَدُوَّكُمْ فَتَضْرِبُوا أَعْنَاقَهُمْ وَيَضْرِبُوا أَعْنَاقَكُمْ؟» قَالُوا: بَلَى، قَالَ: «ذِكْرُ اللهِ تَعَالَى»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1].

واتە: ئەبی دەرداء خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا هەواڵتان نەدەمێ: بە چاکترینی کارەکان، وە بە پاکترینی لەلای پادشاتان، کە پلەتان پێی زۆر بەرزبێتەوە، کە چاکتر بێ بۆ ئێوە لە بەخشینی زێڕو زیو، وە چاکتربێ بۆ ئێوە لە پێکگەیشتنتان لەگەڵ دوژمنو لە گەردنیان بدەنو لە گەردنتان بدەن؟ ئەوانیش گوتیان: با هەواڵمان پێ بدە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! فەرمووی: زیکر کردنی خوای بەرز.

بۆیە بە پێویستمان زانی سەرەتای ئەم کتێبە بە باسی پایەو پاداشتی (زیکر) دەست پێ بکەین، دیارە خوای پەروەردگار لە زۆر شوێن لە قورئان باسی گرنگیو گەورەیی زیکری خۆی فەرمووە، چونکە زیکری خوا پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆو پتەو لە نێوان خواو بەندە دروست دەکات، بۆ وێنە: لە سوورەتی (البقرة) دەفەرموێ:

---

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٣٣٧٧)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (١٤٩٣))

﴿ فَٱذۡكُرُونِيٓ أَذۡكُرۡكُمۡ وَٱشۡكُرُواْ لِي وَلَا تَكۡفُرُونِ ﴿١٥٢﴾﴾ واتە: زیکرم بکەن زیکرتان دەکەم، سوپاسگوزاریی و شوکرانە بژێرییم، بکەن سپڵەیی مەکەن.

کەواتە: هەر کاتێك بەندە یادی خوای کرد ئەوە خوای پەروەردگار بەو هەمووە گەورەی و ڕێزو شکۆمەندیەیەوە یادی دەکات، ئەمە لە لایەك، وە هەروەها هەر خودی زیکر کردنیشی بە سوپاسگوزاریی و شوکرانە بژێریی وەسف کردوە، وەك لە سووڕەتی (آل عمران) مەدحی ئەو کەسانە دەکات کە هەمیشە سەرگەرمی زیکری خوا کردنن و بە خاوەن عەقڵان وەسفیان دەکاو دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ رَبَّنَا مَا خَلَقۡتَ هَٰذَا بَٰطِلٗا سُبۡحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾﴾، واتە: ئەوانەی کە بە پێوەو بە دانیشتەوەو لەسەر تەنیشتیان یادی خوا دەکەن و بیر لە دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی دەکەنەوە (دەڵێن) پەروەردگارمان! ئەمەت بە پووچیی (و بێ حیکمەت) دروست نەکردوە، پاکیی بۆ تۆ(لە کاری بێ ئامانج و حیکمەت)، دەجا لە ئازاری ئاگر ڕزگارمان بکەو بمانپارێزە.

وە خوای پەروەردگار کە باسی ئۆقرە گرتن و ئارامگرتنی دڵ و سەکینەت ڕژانە سەر دڵ دەکات تایبەتی دەکات بە زیکری خواوە، وەك: لە سووڕەتی (الرعد) دەفەرموێ: ﴿ ... أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ﴿٢٨﴾﴾، واتە: ئاگاداربن تەنیا بە زیکری خوا دڵەکان ئارام دەگرن و سەکینەتیان بۆ دروست دەبێ.

دیارە گەورەترین زیکریش بریتیە لە قورئان خوێندن، بۆیە سەرەتا بە پایەو پاداشتی خوێندنی قورئان دەست پێدەکەین.

خوای پەروەردگار بە لوتف‌و کەرەمی خۆی لەو کەسانەمان بگێرێ کە هەمیشە سەرگەرمی زیکرو یادی خوا کردنن، لە کاتێك کە بە پێوەو بە دانیشتنەوەو لەسەر تەنیشتیانن‌و ڕاکشاون.

سەرەتا وا باشە پێناسەی قورئان بکەین، ئنجا دواتر بچینە خزمەتی، بۆ زانینی ئەو پایەو پاداشتەی کە لە نێو خۆیدا هەڵیگرتوە، بۆ هەر کەسێك کە دەیخوێنێ‌و لە بەری دەکاو کاری پێدەکاو خەڵکیشی بۆ بانگ دەکات، سەرەنجامیش ئارام دەگرێ لەسەر هەر ناڕەحەتیی‌و سەغڵەتییەك کە لە کاتی بانگەوازی کردنی بۆ ئەم قورئانە دێتە ڕێی.

## پێناسەی قورئان

**لە ئەسڵی زماندا:**

وشەی قورئان لەسەر وەزنی (فُعْلاَن)ە، بە مانای (مَقْرُوْ)، واتە: خوێنراوە، دێ، وە دەشگونجێ بە مانای (قِرَاءَة) خوێندنەوەش بێ، وەك خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾﴾ القیامة، واتە: (فإذا تَلونَاهُ فَاتَّبِع تلاوتَهُ): هەرکات خوێندمانەوە شوێن خوێندنەوەکەی بکەوە، ئەوە ئەگەر (قُرْآن) چاوگ (مَصْدَر) بێ، ئەگەر ناو (إسم)یش بێ، ئەوە ناوە بۆ قورئان، واتە: (مَقْرُوْ) خوێندراو.

**لە زاراوی شەرع دا:**

دیارە زۆر پێناسە کراوە بۆ قورئان، بەڵام زۆربەی زانایان ئاوا پێناسەی قورئانیان کردوە: {الْقُرْآن: هُوَ كَلاَمُ اللهِ الْمُعْجِز، الْمُنَزَّلُ عَلَى النَّبِيّ مُحَمَّد ﷺ، الْمَكتُوبُ فِي الْمَصَاحِف، الْمَنقُولُ عَنْهُ بِالتَّوَاتُر، الْمُتَعَبَّدُ بِتِلاَوَتِهِ}[١].

واتە: قورئان ئەو فەرمایشتە دەستەوسان کەرەیە، کە دابەزیوە بۆ سەر موحەممەد پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە موصحەفەکاندا نووسراوە، کە بە

---

١) (مَباحث في علُوم القُرآن، د. صُبحي الصالح، ص١٢)، تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز.

شێوەی تـەواتور لـە پێغەمبـەرەوە ﷺ گواسـتراوەتەوە، خوێندنەوەكـەی خواپەرستییە.

(تەواتور): واتە كۆمەڵە كەسێك شتێك بگێڕنەوە لە سەرچاوەیەك، وە ئەوانیش بیگێڕنەوە بۆ كۆمەڵێكی دیكەو، ئەوانیش بیگەیەننە كۆمەڵێكی دی ... هتد، كۆمەڵە كەسێكی وابن كە عەقڵ ڕێگە نـەدات ئەوانـە كەسانە لەسەر درۆ كۆببنەوە.

## ئادابەكانی خوێندنی قورئان:

لە ئیسلام هەموو شتێك ئادابی هەیە، بۆ وێنە: ئادابی نوستن، هەڵسان لە خەو، نان خواردن، سـەلام كـردن، كڕین‌و فرۆشـتن، میوانـداریی كـردن، زیكرو یادی خوا كردن، چوونە مزگەوت، هاتنـەدەر لـە مزگـەوت، سـەرئاو كردن، ڕۆیشتن بەڕێگا، گفتوگۆ كردن، بانگەوازی كـردن، سـەفەر كـردن ... هتـد، دیـارە قورئـانیش هەنـدێ ئـادابی تایبـەت بـە خـۆی هەیـە، كـە وا پەسندە ئینسانی قورئان خوێن پێیانـەوە پابەنـد بـێ لـە كـاتی خوێنـدنی قورئان:

١)- دەست نوێژ گرتنێكی جـوان.

٢)- دانیشتن لە شوێنێكی گونجاو.

٣)- ڕوو كردنە قیبلە، ڕووگە.

٤)- سـیواك كردن.

٥)- نواندنی ملكەچی.

٦)- پەنا گرتن بە خوا لە شەیتان.

٧)- هەست كردن بە تەماشا كردنی خوا.

٨)- بیر كردنەوە لە مانای ئایەتەكان.

٩)- گریان لە كاتی خوێندنەوەی قورئان.

ئنجا دەربارەی باش خوێندنەوەی قورئان‌و ڕازاندنەوەو جوانتر کردنی بە هۆی دەنگی خۆشەوە، ئایەت‌و فەرمایشتێك دێنینەوە:

خوای پەروەردگار له سووڕەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَتۡلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ١٢١ ﴾

واتە: ئەوانەی کتێبمان پێداون‌و وەك شایستەیەتی دەیخوێننەوە، ئا ئەوانە (بە تەواوی) بڕوایان پێیەتی، بەڵام هەر کەسێك بڕوای پێنەکات ئەوە زیان باران هەرخۆیانن. زۆر له زانایان دەڵێن: لێرەدا مەبەست له: (يَتۡلُونَهُۥ) جوان خوێندنەوەیەتی، واتە: هەقی هەر پیت‌و وشەیەك بە تەواوی بدرێ.

هەروەها پێغەمبەریش صەڵات‌و سەلامی خوا لەسەربێ دەربارەی جوان خوێندنەوەی قورئان فەرموویەتی: {زَيِّنُوا الْقُرْآنَ بِأَصْوَاتِكُمْ} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: قورئان جوان بکەن‌و بیڕازێننەوە بە دەنگەکانتان، چونکە دەنگی خۆش قورئان خۆشتر دەکات، وا له گوێگر دەکات زیاتر گوێی بۆ بگرێ.

ئێستاش کاتی ئەوە هاتوە بچینە نێو باغ‌و بێستانەکانی قورئانی بەرزو بەڕێزو بزانین چ سوودو بەرهەمێکی بۆ ئینسان له نێو خۆدا هەڵگرتوە؟!!

---

١) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُد: (١٤٧٠)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٧٧١)).

# پایەو پاداشتی
## خوێندنی سوورەتی فاتیحە

{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعِنْدَهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلاَم، إِذْ سَمِعَ نَقِيضًا فَوْقَهُ، فَرَفَعَ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلاَم بَصَرَهُ إِلَى السَّمَاءِ، فَقَالَ: «هَذَا بَابٌ قَدْ فُتِحَ مِنَ السَّمَاءِ، مَا فُتِحَ قَطُّ، قَالَ: فَنَزَلَ مِنْهُ مَلَكٌ، فَأَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: أَبْشِرْ بِنُورَيْنِ أُوتِيتَهُمَا لَمْ يُؤْتَهُمَا نَبِيٌّ قَبْلَكَ: فَاتِحَةِ الْكِتَابِ، وَخَوَاتِيمِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ، لَمْ تَقْرَأْ حَرْفًا مِنْهُمَا إِلاَّ أُعْطِيتَهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[١]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: لە کاتێکدا جبریل سەلامی خوا لێ بێ، لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەنگێکی لە سەرووی خۆیەوە بیست، جبریل سەلامی خوای لەسەر بێ، چاوی بەرەو سەرێ هەڵبڕی‌و گوتی: ئەوە دەرگایەکە لە ئاسمان کرایەوە، کە هەرگیز نەکراوەتەوە، وە فریشتەیەك لێیەوە دابەزی‌و هاتە لای پێغەمبەر ﷺ، گوتی: موژدەت لێ بێ بە دوو ڕۆشنایی کە پێت دراون‌و پێش تۆش بە هیچ پێغەمبەرێك نەدراون، سوورەتی (فاتیحە)و کۆتایی یەکانی سوورەتی بەقەرە، هیچ پیتێکیان لێ ناخوێنی مەگەر ئەوەی داوای دەکەی پێت دەبەخشرێ.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهُ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُول: «قَالَ اللهُ تَعَالَى: قَسَمْتُ الصَّلاَةَ بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي نِصْفَيْنِ، وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ، فَإِذَا قَالَ الْعَبْدُ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، قَالَ اللهُ تعالى: حَمِدَني عَبْدِي، وَإِذَا قَالَ: ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، قَالَ اللهُ تعالى: أَثْنَى عَلَيَّ عَبدِي، فَإِذَا قَالَ: ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾، قَالَ: مَجَّدَني

---

١) (رَوَاهُ النَّسَائِيُّ: (٩١٢) وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح سُنن النَّسائي))

عَبْدِي "وَقَالَ مَرَّةً: فَوَّضَ إِلَيَّ عَبْدِي" فَإِذَا قَالَ: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾، قَالَ: هَذَا بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي، وَلِعَبدِي مَاسَأَلَ، فَإِذَا قَالَ: ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾، قَالَ اللهُ: هَذَا لِعَبْدِي وَلِعَبدِي مَاسَأَلَ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[1]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خوای بەرز دەفەرموێ: نوێژم لە نێوان خۆم و بەندەکەم کردوە بە دوو بەش، بۆ بەندەکەم هەیە هەر شتێك کە لێم داوا بکات، جا کاتێك بەندە گوتی: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، خوا دەفەرموێ: بەندەکەم ستایشی کردم، وە هەرکات گوتی: ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، خوا دەفەرموێ: بەندەکەم مەدحی منی کرد، وە هەرکات گوتی: ﴿مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ﴾، خوا دەفەرموێ: بەندەکەم منی بە خاوەن شکۆو پایە بەرز وەسف کرد، وە هەر جارێك گوتی: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾، خوا دەفەرموێ: ئیش و کاری خۆی بە من سپارد، وە ئەوە لە نێوانی من و بەندەکەم دایەو بەندەکەم هەر شتێکم لێ داوا بکات، بۆی دەبێ (واتە: مادام منی بەو مەدح و وەسفانە وەسف کرد، لەوەو دوا هەر شتێکم لێداوا بکات دەیدەمێ و پێی دەبەخشم) وە هەرکات بەندە گوتی: ﴿ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾، خوا دەفەرموێ: ئەوە بۆ بەندەکەمە، وە بەندەی من هەر شتێکم لێ داوا بکات پێی دەبەخشم.**

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (١٩٠٤))

{عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: انْطَلَقَ نَفَرٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فِي سَفْرَةٍ سَافَرُوهَا، حَتَّى نَزَلُوا عَلَى حَيٍّ مِنْ أَحْيَاءِ الْعَرَبِ، فَاسْتَضَافُوهُمْ، فَأَبَوْا أَنْ يُضَيِّفُوهُمْ فَلُدِغَ سَيِّدُ ذَلِكَ الْحَيِّ، فَسَعَوْا لَهُ بِكُلِّ شَيْءٍ، لاَ يَنْفَعُهُ شَيْءٌ فَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَوْ أَتَيْتُمْ هَؤُلاَءِ الرَّهْطَ الَّذِينَ نَزَلُوا، لَعَلَّهُ أَنْ يَكُونَ عِنْدَ بَعْضِهِمْ شَيْءٌ فَأَتَوْهُمْ فَقَالُوا: يَا أَيُّهَا الرَّهْطُ إِنَّ سَيِّدَنَا لُدِغَ، وَسَعَيْنَا لَهُ بِكُلِّ شَيْءٍ، لاَ يَنْفَعُهُ فَهَلْ عِنْدَ أَحَدٍ مِنْكُمْ مِنْ شَيْءٍ فَقَالَ بَعْضُهُمْ: نَعَمْ وَاللهِ إِنِّي لأَرْقِي، وَلَكِنْ وَاللهِ لَقَدِ اسْتَضَفْنَاكُمْ فَلَمْ تُضَيِّفُونَا، فَمَا أَنَا بِرَاقٍ لَكُمْ حَتَّى تَجْعَلُوا لَنَا جُعْلاً فَصَالَحُوهُمْ عَلَى قَطِيعٍ مِنَ الْغَنَمِ فَانْطَلَقَ يَتْفِلُ عَلَيْهِ وَيَقْرَأُ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، فَكَأَنَّمَا نُشِطَ مِنْ عِقَالٍ فَانْطَلَقَ يَمْشِي وَمَا بِهِ قَلَبَةٌ قَالَ: فَأَوْفَوْهُمْ جُعْلَهُمُ الَّذِي صَالَحُوهُمْ عَلَيْهِ فَقَالَ بَعْضُهُمْ: اقْسِمُوا فَقَالَ الَّذِي رَقَى لاَ تَفْعَلُوا، حَتَّى نَأْتِيَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَنَذْكُرَ لَهُ الَّذِي كَانَ، فَنَنْظُرَ مَا يَأْمُرُنَا فَقَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَذَكَرُوا لَهُ فَقَالَ: وَمَا يُدْرِيكَ أَنَّهَا رُقْيَةٌ؟ ثُمَّ قَالَ: قَدْ أَصَبْتُمْ، اقْسِمُوا وَاضْرِبُوا لِي مَعَكُمْ سَهْمًا فَضَحِكَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)}(١)

**واتە: ئەبوو سەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: هەندێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەچنە سەفەرێك، هەتا لە لای خێڵێکی عەرەبان لادەدەن و داوای میوانداریيان لێ دەکەن، ئەوانیش میوانداریان ناکەن، وە گەورەی ئەم خێڵەش شتێك پێوەی داوە زۆر هەوڵدەدەن بەڵام هیچ شتێك سوودی پێناگەیەنێ، هەندێکیان دەڵێن: بۆ ناچن بۆ لای ئەم کاروانە کە لێرە مەنزڵگایان داناوە، بەڵکو چارەسەر لەلای یەکێکیان هەبێ؟ (دیارە دەچن) دەڵێن: ئەی کاروان (واتە: بانگی هاوەڵان دەکەن) سەرۆك خێڵەکەمان شت پێوەی داوەو بە زۆر شت لەگەڵی هەوڵمان داوە، بەڵام سوودی نیە، ئایا هیچ یەکێك لە ئێوە چارەسەری لەلا نیە؟ یەکێکیان**

---

١) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٢١٥٦))

دەڵێ: با، بە خوا من دووعای (گەزران و پێوەدان دەزانم)، بەڵام بە خوا چونکە ئێمە داوای میوانداریمان لێکردن میوانداریتان نەکردین و ڕازی نەبوون، منیش دووعاتان بۆ ناکەم هەتا شتێکمان پێ نەدەن، ئنجا پێك دێن لەسەر هەندێ مەڕ، پاشان ئەویش لەگەڵیان دەچێ بۆ لای سەرۆك خێڵەکەو لەوێ سووڕەتی: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ی بەسەردا دەخوێنێ و هەندێ تفی لێدەدا، ئیدی شت پێوەدراوە وەك حوشتر لە پەت بەربێ دەست و پێی کرایەوە بەڵای لێ نەما، گوتی: ئەو شتەی کە لەسەری پێکهاتبوون بە تەواوی پێیان دان.

جا هەندێکیان گوتیان: با بەشی بکەین لە نێوان خۆمان، بەڵام ئەو کەسەی دووعاکەی کردبوو گوتی: دابەشی مەکەن تا دەچینەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی ڕوویداوە بۆی باس دەکەین، بزانین چ فەرمانێکمان پێدەکات، کە بۆیان باسکرد، فەرمووی: چۆنت زانی ئەوە دووعایە؟! دوایی فەرمووی: شتێکی چاکتان کردوە، دابەشی بکەن و بەشێکی بۆ منیش دابنێن لەگەڵ خۆتان، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی!!

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِذَا قَالَ الْقَارِئُ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ، فَقَالَ مَنْ خَلْفَهُ آمِينَ، فَوَافَقَ قَوْلُهُ قَوْلَ أَهْلِ السَّمَاءِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێك ئیمام گوتی: ﴿غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾: ئەوانەی لەدوای نوێژ دەکەن بڵێن: ئامین، هەر نوێژکەرێك

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٩٠٤ ١))

ئامین گوتنەکەی ڕێك دەرچێ لەگەڵ هی فریشتەکان، ئەوە هەرچی گوناهی ڕابردوویەتی دەپۆشرێ، (واتە: کاتێ ئیمام دەڵێ ئامین، فریشتەکانیش وا دەڵێن).

{عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا صَلَّيْتُمْ، فَأَقِيمُوا صُفُوفَكُمْ، ثُمَّ لْيَؤُمَّكُمْ أَحَدُكُمْ فَإِذَا كَبَّرَ فَكَبِّرُوا وَإِذَا قَالَ: غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ، فَقُولُوا: آمِينَ. يُجِبْكُمُ اللهُ} **حَدِيثٌ صَحِيح**[1]

واتە: ئەبی مووساری ئەشعەریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: کاتێك هەستان بۆ نوێژ ڕێك ڕاوەستن، وە با یەکێك پێش نوێژیتان بۆ بکات، کە تەکبیری کرد ئێوەش تەکبیر بکەن، وە ئەگەر گوتی: (غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَالضَّالِّين) ئێوە بڵێن ئامین خوا وەڵامتان دەداتەوە.

## سوورەتی فاتیحەو ماناکەی

أَعُوذُ باللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيم: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿١﴾ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٢﴾ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ﴿٤﴾ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴿٥﴾ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ﴿٦﴾ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا الضَّالِّينَ ﴿٧﴾﴾

واتە: پەنا دەگرم بە خوا لە شەیتانی نەفرین لێکراو: (بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە ﴿١﴾ ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکان ﴿٢﴾ بە بەزەیی بەخشندەیە ﴿٣﴾ خاوەنی ڕۆژی سزاو پاداشتە ﴿٤﴾ هەر تۆ

---

١) ((رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٤٠٤))

دەپەرستین‌و یارمەتی بەس لە تۆ دەخوازین ﴿٥﴾ ڕێنمایی مان بکە، بۆ ڕێی ڕاست ﴿٦﴾ ڕێی ئەوانەی چاکەت لەگەڵدا کردوون، نەك لێ تووڕە بووان، وە نەك گومڕایان ﴿٧﴾).

## پایەو پاداشتی خوێندنی
## سوورەتی بەقەرەو ئالی عیمران

{عَنْ أَبُو أُمَامَةَ الْبَاهِلِيّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «اقْرَءُوا الْقُرْآنَ، فَإِنَّهُ يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ، شَفِيعًا لأَصْحَابِهِ، اقْرَءُوا الزَّهْرَاوَيْنِ: الْبَقَرَةَ وَسُورَةَ آلِ عِمْرَانَ، فَإِنَّهُمَا تَأْتِيَانِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، كَأَنَّهُمَا غَمَامَتَانِ، أَوْ كَأَنَّهُمَا غَيَايَتَانِ، أَوْ كَأَنَّهُمَا فِرْقَانِ مِنْ طَيْرٍ صَوَافَّ تُحَاجَّانِ عَنْ أَصْحَابِهِمَا، اقْرَءُوا سُورَةَ الْبَقَرَةِ فَإِنَّ أَخْذَهَا بَرَكَةٌ، وَتَرْكَهَا حَسْرَةٌ، وَلاَ تَسْتَطِيعُهَا الْبَطَلَةُ»} **حديثٌ صَحيح**(1)

واتە: ئەبی ئومامەی باهیلی خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: قورئان بخوێنن، چونکە لە ڕۆژی دوایی دا دێت شەفاعەت بۆ هاوەڵانی دەکات (ئەوانەی کە دەیخوێنن‌و کاری پێدەکەن)، دووچراکان بخوێننەوە، سوورەتی بەقەرەو سوورەتی ئالی عیمران، چونکە لە ڕۆژی دوایی دێن سێبەر لە خاوەکانەکانیان دەکەن وەك دوو هەور، یاخود دوو سەقف، یاخود وەك دوو پۆلی باڵندە کە بە ڕیز دێن باڵیان ڕادەگرن، وە موناقەشە دەکەن‌و بەرگری لە خاوەنەکانیان دەکەن، وە سوورەتی بەقەرە بخوێنن، چونکە وەرگرتن (ی‌و لەبەرکردنی‌و تێگەیشتنی) بەرەکەتە، وە واز لێ هێنانی مایەی پەشێمانییە، (وە هەر

---

1) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (١٩١٠))

کەسێك سووڕەتی بەقەڕەی لەبەر بێ)، جادووگەران ناتوانن کاریگەریان لەسەری هەبێ.

## پایەو پاداشتی خوێندنی

## ئایەتی: ( الکُرسی )

{عَنْ أَبي هُرَيرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهُ، وَكَّلَني رَسُولِ اللهِ ﷺ بِحِفظِ زَكَاةِ رَمَضَانَ، فَأَتَاني آتٍ، فَجَعَلَ يَحثُومِنَ الطَّعَام، فَأخذْتُهُ وقُلْتُ: واللهِ لأرْفَعَنَّكَ إلى رَسُولِ الله، قَالَ: إنِّي مُحتَاجٌ وَعَلَيَّ عِيَالٌ ولي حاجةٌ شديدةٌ، قَالَ: فَخَلَّيتُ عَنهُ، فأصبَحتُ فقالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يا أبَا هُرَيرَةَ ما فَعَلَ أسِيرُكَ البارِحةَ؟»، قَالَ: قُلْتُ: يا رَسول اللهِ ﷺ، شَكا حَاجَةً شَديدَةً، وَعيالاً، فَرَحِمْتُهُ فَخَلَّيتُ سبيلَهُ، قَالَ: «أمَا إنَّهُ كَذَبَكَ، وَسَيَعُود»، فَعَرفتُ أنَّهُ سَيَعُودُ، لِقَولِ رَسُولِ اللهِ ﷺ: «إنَّهُ سَيَعُودُ»...، قَالَ: خلِّني أُعَلِّمْكَ كَلِمَاتٍ يَنْفَعُكَ اللهُ بِهَا قُلْتُ مَا هُوَ؟ قَالَ: إذا أَوَيْتَ إلَى فِرَاشِكَ، فاقرَأْ آيَةَ الكُرْسِيِّ: ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ﴿٢٥٥﴾ ﴾، حتَّى تَخْتِمَ الآيَةَ، فإنَّكَ لَنْ يَزَالَ عَلَيْكَ مِنَ اللهِ حَافِظٌ، وَلاَ يَقْرَبَنَّكَ شَيطَانٌ حَتَّى تُصْبِحَ، فَأَخبر أَبُو هُرَيْرَةَ بِذَلِكَ رَسُولَ الله ﷺ، قَالَ: «أمَا إنَّهُ قَدْ صَدَقَكَ وَهُوَ كَذُوبٌ تَعْلَمُ مَنْ تُخاطِبُ مِنذُ ثَلاثِ لَيَالٍ يا أَبَا هُرَيرَةَ ؟» قَالَ: لاَ، قَالَ: «ذَاكَ شَيْطَانٌ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: ئەبوو هورەیرە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پارێزگاریی کردنی زەکاتی ڕەمەزانی بە من سپاردبوو، کەسێك هات لە خوراکی زەکات بە چەنگ چەنگی لێدەدا لە کۆششی خۆی یان لە شتێکی دەکرد، منیش گرتم‌و گوتم: دەتدەمە دەست پێغەمبەری خوا، ئەویش گوتی: من ئاتاجم‌و منداڵی وردم هەن‌و زۆرم پێویستی پێ هەیە، دەڵێ: منیش وازم لێهێنا، بەیانی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئەبوو هورەیرە دیلەکەی دوێنێ

١) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٢١٨٧))

شەوت چ لێ کرد؟ منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا سکاڵای کرد کە زۆر ئاتاجەو منداڵیشی وردن منیش بەزەییم پێداهاتەوەو بەرمدا، فەرمووی: ئاگاداربە درۆی لەگەڵ کردووی‌و دێتەوە! منیش زانیم کە هەر دێتەوە لەبەر قسەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرمووی: دێتەوە! (جا هەتا سێ شەوان ئەوە دووبارە بۆوە، شەوی سێیەم ئەبوو هورەیرە دەڵێ: گوتم دەتدەمە دەست پێغەمبەری خوا ﷺ) ئەویش گوتی: بەرمدە چەند وشەیەکت فێر دەکەم کە خوا بیانکاتە سوود لێ ببینیت، گوتم: چییە؟ گوتی: هەر کاتێك شەو چوویە سەر جێگا، (آية الكُرسي) بخوێنە چونکە هەتا ڕۆژ دەکەیەوە، خوا پارێزەرێکت بۆ دادەنێ‌و شەیتان توخنت ناکەوێ، ئەبوو هورەیرەش ئەوەی بۆ پێغەمبەر ﷺ گێڕایەوە پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئاگاداربە ڕاستی لەگەڵ کردووی، بەڵام درۆزنیشە، وە فەرمووی: دەزانی ئەوە کێ بوو قسەت لەگەڵدا دەکرد ئەی ئەبوو هورەیرە ئەو سێ شەوە؟! گوتی: نەخێر، فەرمووی: ئەوە شەیتان بوو.

{عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ قَرَأَ آيَةَ الْكُرْسِيِّ دُبُرَ كُلِّ صَلاَةٍ مَكْتُوبَةٍ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ أَنْ يَدْخُلَ الجَنَّةَ إِلاَّ أَنْ يَمُوت، فَإِذَا مَاتَ دَخَلَ الجَنَّةَ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە، خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك ئایەتی (الكُرسي) بخوێنێ، لە دوای نوێژە فەڕزەکان، هیچ شتێك لە نێوان ئەوو بەهەشت نیە کە بچێتە بەهەشت جگە لەوەی کە دەبێ بمرێ، ئەگەر مرد دەچێتە بەهەشت.

---

١) (رَوَاهُ أَبُو نعيم في (الحلية: ج٣، ص٢٢١)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٩٧٢))

{عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْب رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أن النَّبيّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): سَأَلَهُ: «أيُّ آيةٍ مِنْ كِتَابِ اللهِ أَعْظَم؟»، قَالَ: آيةُ الكُرسي، قَالَ: «لِيَهْنِكَ الْعِلْمُ أَبَا الْمُنْذِرِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: ئوبەی کوڕی کەعب خوا لێی ڕازی بێ، پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری لێکرد: چ ئایەتێك لە کتێبی خوا لە هەموو ئایەتەکان گەورەترە؟! گوتی: (آية الكرسي) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەزانیاری خۆت دڵخۆشبە ئەی (أبا المُنذر)، واتە: تۆ زانیارییەکی باشت هەیە، مادام دەزانی کە کام ئایەت لە هەموو ئایەتەکان گەورەترە.

## ئایەتی (الكُرسی) و ماناکەی:

أَعُوذُ باللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيم: ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ۚ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ۚ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَىْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ ۚ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَا ۚ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾ ﴾

واتە: خوا (ی بێ وێنە) جگە لەو هیچ پەرستراوی دی بە هەق نین، زیندووی مشوور گێڕە، نە وەنەوز دەیگرێ نە خەو، هەرچی لە ئاسمانەکان‌و زەوی دایە هی ویە، کێ هەیە بێ مۆڵەتی وی تکای لەلا بکات؟! هەرچی لە پێش دەستیانەوەیەو لە دوایانەوەیە دەیزانێ، وە مەگەر خۆی بیەوێ، ئەگەرنا دەوری هیچ لە زانیاری وی نادەن، کورسییەکەی ئاسمانەکان‌و زەوی گرتۆتە خۆی، وە پاراستنی بۆیان ماندووی ناکات، وە ئەو بەرزی مەزنە.

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (١٩٢١))

# پایەو پاداشتی خوێندنی دوو ئایەتی کۆتایی سوورەتی بەقەرە

{عَنْ أَبِي مَسْعُودِ الأَنْصَارِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ قَرَأَ الآيَتَيْنِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[1]

**واتە: ئەبوو مەسعوودیی ئەنصاریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دوو ئایەتی کۆتایی سوورەتی بەقەرە بخوێنێ لە شەودا بەسیەتی، (واتە: خوای پەروەردگار دەیپارێزی، وە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەگەر ئەو کەسە ئەم شەوە بمرێ، ئەوە بە ئیمانەوە دەچێتە خزمەت خوای بەبەزەیی).**

{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، قَالَ: بَيْنَمَا رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعِنْدَهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامِ، إِذْ سَمِعَ نَقِيضًا فَوْقَهُ، فَرَفَعَ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامِ بَصَرَهُ إِلَى السَّمَاءِ، فَقَالَ: «هَذَا بَابٌ قَدْ فُتِحَ مِنَ السَّمَاءِ، مَا فُتِحَ قَطُّ، قَالَ: فَنَزَلَ مِنْهُ مَلَكٌ، فَأَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: أَبْشِرْ بِنُورَيْنِ أُوتِيتَهُمَا لَمْ يُؤْتَهُمَا نَبِيٌّ قَبْلَكَ: فَاتِحَةِ الْكِتَابِ، وَخَوَاتِيمِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ، لَمْ تَقْرَأْ حَرْفًا مِنْهُمَا إِلاَّ أُعْطِيتَهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[2]

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: لە کاتێکدا جبریل (عَلَيْهِ السَّلَامِ) لای پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەنگێکی لە سەروویەوە بیست، جبریل (عَلَيْهِ السَّلَامِ) چاوی بەرەو سەرێ هەڵبڕی گوتی: ئەوە دەرگایەکە لە ئاسمانێ کرایەوە کە هەرگیز نەکراوەتەوە وە فریشتەیەك لێیەوە دابەزی و هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: موژدەت**

---

١) (رَوَاهُ أَحْمَد: (١٧١٣٧)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع): (٦٤٦٥))

٢) (رَوَاهُ النَّسَائِيُّ: (٩١٢) وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح سُنن النَّسائي))

لێبێ بەدوو ڕۆشنایی کەپێت دراون و پێش تۆش بەهیچ پێغەمبەرێك نەدراون، دەستپێکی کتێب (فاتیحە)و کۆتایی یەکانی سوورەتی بەقەرە هیچ پیتێکیان ناخوێنی مەگەر ئەوەی داوای دەکەی پێت دەدرێ.

## دوو ئایەتی کۆتایی

## سوورەتی بەقەرەو ماناکەی:

أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ: ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ٢٨٥ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَعَلَيۡهَا مَا ٱكۡتَسَبَتۡۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذۡنَآ إِن نَّسِينَآ أَوۡ أَخۡطَأۡنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تَحۡمِلۡ عَلَيۡنَآ إِصۡرٗا كَمَا حَمَلۡتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلۡنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦۖ وَٱعۡفُ عَنَّا وَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَآۚ أَنتَ مَوۡلَىٰنَا فَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٢٨٦﴾ البقرة.

واتە: پێغەمبەرو بڕواداران بڕوایان بەوە هێناوە کە لە پەروەردگارییەوە بۆی نێرراوەتە خوار، هەرکامێکیان بڕوای بە خواو فریشتەکانی‌و کتێبەکانی‌و ڕەوانەکراوانی هێناوە (دەڵێن): جیاوازیی ناخەینە نێوان هیچ کام لە پێغەمبەرانییەوە، وە گوتیان: بیستمان‌و فەرمانبەریمان کرد، پەروەردگارمان لێبوردنت داوا دەکەین سەرەنجام هەر بۆ لای تۆیە . خوا جگە لە توانای لە هیچ کەس داوا ناکات، هەموو کەس لەو چاکانەی دەیانکات بەهرەمەندو لەو خراپانەی دەیانکات زەرەرمەندە، پەروەردگارمان هەرکات لەبیرمان چوو، یان هەڵەمان کرد لێمان مەگرە، پەروەردگارمان! وە قورساییەك وەك ئەوەی خستووتە سەر ئەوانەی پێشوومان، مەخە

سەرشانمان، پەروەردگارمان وە ئەرکێکمان ماوێ سەر کە لە تواناماندا نیە، وە بمانبەخشەو بمانبوورەو بەزەییت پێماندا بێ، هەر تۆ پشتیوانمانی، جا بەسەر کۆمەڵی کافراندا سەرمان بخە.

## پایەو پاداشتی خوێندنو

### لەبەر کردنی سوورەتی کەهف

{عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ حَفِظَ عَشْرَ آيَاتٍ مِنْ أَوَّلِ سُورَةِ الْكَهْفِ، عُصِمَ مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتە: ئەبوو دەرداء خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دە (١٠) ئایەتی سەرەتای سوورەتی کەهف لەبەر بکات، دەپارێزرێ لە فیتنەو ئاشووبی دەججال.**

{عَنْ أَبِي سَعِيْدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ قَرَأَ سُوْرَةَ الْكَهْف فِي يَوْمَ الْجُمُعَةِ، أَضَاءَ لَهُ مِنَ النُّورِ مَا بَيْنَ الْجُمُعَتَيْنِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

**واتە: ئەبوو سەعیدی خودری خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك سوورەتی کەهف بخوێنی لە ڕۆژی هەینی دا، ڕۆشناییەکی بۆ دادەگیرسێ بە ئەندازەی نێوان هەردوو هەینییەکان.**

---

١) (رَوَاهُ أَحْمَد: (٢٧٥٨٠)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (السلسة الصحيحة): (٥٨٢))

٢) (رَوَاهُ البَيْهَقِيُّ: (٥٧٩٢)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع): (٦٤٧٠))

# دە ئایەتی سەرەتای

## سوورەتی کەهف و ماناکەی:

أَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ: بِسْمِ اللهِ الرَّحمَنِ الرَّحِيمْ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ
أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَـٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ﴿١﴾ قَيِّمًا لِّيُنذِرَ بَأْسًا شَدِيدًا مِّن لَّدُنْهُ وَيُبَشِّرَ
ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا حَسَنًا ﴿٢﴾ مَّـٰكِثِينَ فِيهِ أَبَدًا ﴿٣﴾
وَيُنذِرَ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا ﴿٤﴾ مَّا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ وَلَا لِـَٔابَآئِهِمْ ۚ كَبُرَتْ
كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَٰهِهِمْ ۚ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبًا ﴿٥﴾ فَلَعَلَّكَ بَـٰخِعٌ نَّفْسَكَ عَلَىٰٓ
ءَاثَـٰرِهِمْ إِن لَّمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهَـٰذَا ٱلْحَدِيثِ أَسَفًا ﴿٦﴾ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا
لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ وَإِنَّا لَجَـٰعِلُونَ مَا عَلَيْهَا صَعِيدًا جُرُزًا ﴿٨﴾ أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ
أَصْحَـٰبَ ٱلْكَهْفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُوا۟ مِنْ ءَايَـٰتِنَا عَجَبًا ﴿٩﴾ إِذْ أَوَى ٱلْفِتْيَةُ إِلَى ٱلْكَهْفِ
فَقَالُوا۟ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ﴿١٠﴾﴾

**واتە: بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە قورئانی ناردووەتە خوار بۆ سەر بەندەی خۆی (موحەممەد ﷺ)، وە هیچ جۆرە لاریەکی تێدانیە ﴿١﴾ (کتێبێکی) ڕاست و پایەدارە، بۆ ئەوەی (کافران) بترسێنی بە سزایەکی زۆر بەتین لەلایەن خۆیەوە، وە مژدەش بدات بەو بڕوادارانەی کە کردەوە چاکەکان ئەنجام دەدەن بەوەی کە پاداشتێکی چاکیان بۆ هەیە ﴿٢﴾ کە لەو (بەهەشتە)دا بێ بڕانەوە دەمێننەوە ﴿٣﴾ وە (بۆ ئەوەی) کەسانێك بترسێنێ کە دەیانگوت: خوا ڕۆڵەی بۆ خۆی بڕیارداوە ﴿٤﴾ نەخۆیان زانابوون پێی نە باب و باپیرانیان چ قسەیەکی (بوختانێکی) گەورەیە کە لە دەمیان دەردەچێت جگە لە درۆ**

هیچ شتێکی دیکە نالێن ﴿٥﴾ جا لەوانەیە خۆت لە ناوبەری لەبەر کردەوەی ئەوان ئەگەر ئیمان نەهێنن بەم قورئانە لە داخ و حەژمەتا (بمریت) ﴿٦﴾ بەڕاستی ئێمە هەرچی لەسەر زەوییە کردوومانە بە زینەت و جوانی بۆ زەوی تاکو خەڵکی تاقی بکەینەوە کامیان کردەوەی جوانتر و چاکترە؟ ﴿٧﴾ وە بەڕاستی ئەوەی لەسەر زەوییەوەیە ئێمە هەمووی دەکەین بە زەویەکی تەختی وشك و برنگ ﴿٨﴾ ئایا واتزانی کە هاوەڵانی ئەشکەوت و تابلۆ (ئەو بەردەی ناویانی تێدا نووسرا بوو) ئەوان لە ناو نیشانەکانی ئێمەدا سەر سووڕهێنەر بوو؟! ﴿٩﴾ کاتێك کۆمەڵە گەنجێك پەنایان بردەبەر ئەشکەوتەکە گوتیان: ئەی پەروەردگارمان! لەلایەن خۆتەوە بەزەییەکمان پێ ببەخشە، وە فەراهەم بێنە بۆمان لەو کارەی کەوا تێیداین ڕێی ڕاست و ڕزگاری ﴿١٠﴾.

## پایە و پاداشتی خوێندنی

## سووڕەتەکانی: (الْمُسَبِّحَات)

{عَنْ الْعِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) «كَانَ لاَ يَنَامُ حَتَّى يَقْرَأَ: الْمُسَبِّحَاتِ، وَيَقُولُ: فِيهَا آيَةٌ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ آيَةٍ»} **حديثٌ حسَنٌ**[1]

**واتە: عیرباضی کوڕی ساریە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نە دەخەوت تاکو سووڕەتەکانی (مُسَبِّحَات)ی نەخوێندایە (کە بریتین لە: الإِسْرَاء، الحَدِيد، الصَّف، الحَشْر، الجُمُعَة، التَغَابن، الأَعْلَى)، وە دەیفەرموو: ئایەتێکیان تێدایە خێری زیاترە لە هەزار ئایەت.**

---

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٣٤٠٦)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح سُنَن التِّرمِذِيُّ))

# پایەو پاداشتی

## سوورەتی مولك

{عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ : قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «سُورَةُ ﴿تَبَارَكَ﴾، هِيَ الْمَانِعَةُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[١]

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوورەتی تەبارەکە، ڕێگرە لە سزای نێو گۆڕ (بۆ کەسێك کە دەیخوێنێ).**

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «سُورَةٌ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هِيَ إِلاَّ ثَلاَثُونَ آيَةً، خَاصَمَتْ عَنْ صَاحِبِهَا حَتَّى أَدْخَلَتْهُ الْجَنَّةِ، وَهِيَ ﴿تَبَارَكَ﴾»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[٢]

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوورەتێك هەیە لە قورئان، تەنها سی ئایەتە، (لە ڕۆژی قیامەت دێ) موناقەشە دەکاو بەرگری لە خاوەنەکەی دەکات (واتە: ئەو کەسەی کە خوێندوویەتی و کاری پێ کردوە) هەتاکو دەیخاتە بەهەشتەوە، ئەویش سوورەتی تەبارەکەیە.**

---

١) (رَوَاهُ البَيْهَقِيُّ في (الصُغرى): (١٠١١)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١١٤٠))

٢) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ في (الأوسط): (٣٦٥٤)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع): (٣٦٤٤))

{عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ قَرَأَ: ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ﴾، كُلَّ لَيْلَةٍ، مَنَعَهُ اللهُ (عَزَّ وَجَلَّ) بِهَا، مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ»} **حديثٌ حَسَنٌ**[1]

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك سووڕەتی: ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ﴾، بخوێنێ هەموو شەوێك، بەهۆیەوە خوای زاڵی پایەدار، سزای نێو گۆڕی لەسەر قەدەغە دەكات.**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «سُورَةٌ مِنَ الْقُرْآنِ ثَلَاثُونَ آيَةً تَشْفَعُ لِصَاحِبِهَا حَتَّى يُغْفَرَ لَهُ: ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ﴾»} **حديثٌ حَسَنٌ**[2]

**واتە: ئەبوو هوڕەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سووڕەتێك هەیە لە قوڕئان دا، سی ئایەتە، تكاو شەفاعەت بۆ خاوەنەكەی، (هاوەڵەكەی) دەكات، (واتە: ئەو كەسەی دەیخوێنێتەوەو كاری پێدەكات) تاكو دەبوردرێ (لە گوناهەكانی ئەویش سووڕەتی): ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ﴾ە.**

---

١) (رَوَاهُ النَّسَائِيُّ في (الكُبرى): (٧١١)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (١٥٨٩))

٢) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (١٤٠٠)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح سُنَن أَبي دَاوُد): (١٢٦٥))

# پایەو پاداشتی

## سوورەتی ئیخلاص

{عَنْ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ الْجُهَنِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ قَرَأَ: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾، حَتَّى يَخْتِمَهَا عَشْرَ مَرَّاتٍ، بَنَى اللهُ لَهُ قَصْرًا فِي الْجَنَّةِ، فَقَالَ: عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: إِذَنْ أَسْتَكْثِرَ يَا رَسُولَ اللهِ؟! فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): اللهُ أَكْثَرُ وَأَطْيَبُ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[١]

**واتە: موعاذی کوڕی ئەنەسی جوهەنیی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك دە جاران: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾، بخوێنێ و تەواوی بکات، ئەوە خوای بەخشەر قەسرێکی بۆ لە بەهەشت دروست دەکات.**

{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَتْ: أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، بَعَثَ رَجُلاً عَلَى سَرِيَّةٍ وَكَانَ يَقْرَأُ لِأَصْحَابِهِ فِي صَلاَتِهِمْ فَيَخْتِمُ بِـ ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾، فَلَمَّا رَجَعُوا ذَكَرُوا، ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ فَقَالَ: «سَلُوهُ، لأَيِّ شَيْءٍ يَصْنَعُ ذَلِكَ»، فَسَأَلُوهُ؟ فَقَالَ: لأَنَّهَا صِفَةُ الرَّحْمَنِ، وَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَقْرَأَ بِهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَخْبِرُوهُ، أَنَّ اللهَ يُحِبُّهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[٢]

**واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی نارد بۆ سەرپەرشتی کردنی سریەیەك، کاتێك کە نوێژی بۆ هاوەڵەکانی دەکرد بە سوورەتی (ئیخلاص) کۆتایی پێ دەهێنا، کاتێ گەڕانەوە، ئەوەیان باسکرد بۆ پێغەمبەر، فەرمووی: پرسیاری لێبکەن، بۆچی ئەو کارە دەکات؟**

---

١) (رَوَاهُ أَحْمَدُ: (١٥٦٤٨)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٥٨٩))

٢) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (١٩٢٦))

**پرسیاریان لێکرد، گوتی: چونکە ئەوە سیفەتی خوای بەبەزەییە، وە من حەز دەکەم بیخوێنم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەواڵی پێ بدەن، بە دڵنیایی خوای گەورەش خۆشی دەوێ.**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: أَقْبَلْتُ مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَسَمِعَ رَجُلاً يَقْرَأُ: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴿٢﴾﴾، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «وَجَبَتْ»، قُلْتُ: وَمَا وَجَبَتْ؟ قَالَ: «الْجَنَّةُ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[1]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووم، گوێی لە پیاوێك بوو، دەیگوت: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴿٢﴾﴾، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە بۆی واجب بوو، منیش گوتم: چی بۆ واجب بوو؟ فەرمووی: بەهەشت.**

{عَن مِحْجَنَ بْنَ الأَدْرَعِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، حَدَّثَهُ قَالَ: دَخَلَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الْمَسْجِدَ فَإِذَا هُوَ بِرَجُلٍ قَدْ قَضَى صَلاَتَهُ، وَهُوَ يَتَشَهَّدُ، وَهُوَ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ يَا اللهُ الأَحَدُ الصَّمَدُ، الَّذِي لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ، أَنْ تَغْفِرَ لِي ذُنُوبِي، إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ، قَالَ: فَقَالَ النَّبِيّ: «قَدْ غُفِرَ لَهُ قَدْ غُفِرَ لَهُ»، ثَلاَثًا} **حَدِيثٌ صَحِيح**[2]

---

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٢٨٩٧)، وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح سُنَن التِّرمِذِيُّ))

٢) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُد: (٩٨٧)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح سُنَن أبي دَاوُد): (٩٠٥))

میحجەنی کوڕی ئەدرەع (کە یەکێکە لە هاوەڵان) خوا لێی ڕازی بێ، دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چووە مزگەوت، لەو کاتە پیاوێك نوێژی تەواو کردو شایەتمانی دەهێناو دەیگوت: خوایە! من داوات لێدەکەم ئەی خوای تاك و جێی نیازو ئومێد، ئەو خوایەی کەسی لێ نەبووەو لە کەسیش نەبووە، وە هەرگیز هیچ کەس هاوشێوەو هاوتای ئەو نیە، لە گوناهەکانم خۆشبی، چونکە بەڕاستی تۆ لێبوردەو بەبەزەیی، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بە تەئکید بوردرا، بە تەئکید بوردرا (لە گوناهەکانی) وە سێ جاران ئەم وتەیەی دووبارە کردەوە.

## سوورەتی ئیخلاص و ماناکەی:

أَعُوذُ باللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيم: بِسْمِ اللهِ الرَّحمَنِ الرَّحِيمْ:

﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ﴿٤﴾﴾.

واتە: بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، (ئەی موحەممەد ﷺ) (بڵێ: ئەوە، خوای تاك و تەنیا ﴿١﴾ ئەو خوایەی بێ نیازو جێی نیازو ئومێدە ﴿٢﴾ کەسی لێ نەبووەو لە کەسیش نەبووە ﴿٣﴾ وە هەرگیز هیچ کەس هاوشێوەو هاوتای نیە ﴿٤﴾).

# پایەو پاداشتی خوێندنی

## سوورەتی ئیخلاص و کافیرون

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ قَرَأَ: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾، عُدِلَتْ لَهُ بِرُبُعِ الْقُرْآنِ، وَمَنْ قَرَأَ: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾، عُدِلَتْ لَهُ بِثُلُثِ الْقُرْآنِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**(١)

**واته: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾، بخوێنێ پاداشتی یەك لەسەر چواری قورئانی بۆ دەنووسرێ، وە هەر کەسێك ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾، بخوێنێ پاداشتی یەك لەسەر سێی قورئانی بۆ دەنووسرێ، یانی: خێری وەك ئەوە وایە کە دە جوزئی قورئان بخوێنێ!**

{عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّ رَجُلاً قَامَ فَرَكَعَ رَكْعَتَي الْفَجْرِ، فَقَرَأَ فِي الرَّكْعَةِ الأُولَى: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾، حَتَّى انقَضَتِ السُّورَةُ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «هَذَا عَبْدٌ عَرَفَ رَبَّهُ»، وَقَرَأَ فِي الآخِرَةِ: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾، حَتَّى انقَضَتِ السُّورَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «هَذَا عَبْدٌ آمَنَ بِرَبِّهِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(٢)

**واته: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: پیاوێك هەڵساو دوو ڕکاتی سوننەتی بەیانی کرد، لە ڕکاتی یەکەم ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ی خوێند، هەتا سوورەتەکەی تەواو کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو بەندە پەروەردگاری خۆی**

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٢٨٩٣)، وَحَسَّنَهُ العلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع): (٦٤٦٦))
٢) (رَوَاهُ ابْنُ حِبَّانَ: (٢٤٦٠) وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في صفة صلاة النبي ﷺ

ناسیوە، وە لە ڕکاتەکەی دیکە ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ی خوێند هەتا سوورەتەکەی تەواو کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو بەندە بڕوای بە پەروەردگاری خۆی هێناوە.

{عَنْ فَرْوَةَ بْنِ نَوْفَلٍ عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لِنَوْفَلٍ، «اقْرَأْ: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾، ثُمَّ نَمْ عَلَى خَاتِمَتِهَا، فَإِنَّهَا بَرَاءَةٌ مِنَ الشِّرْكِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[1]

واتە: فەروەی کوڕی نەوفەل لە بابی دەگێڕێتەوە خوا لێیان ڕازی بێ، کە پێغەمبەر ﷺ بە نەوفەلی فەرمووە: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾، بخوێنە، پاشان بخەوە، دوای تەواو کردنی، چونکە دەبێتە بەرائەت (پاراستنت) لە هاوبەش دانان (بۆ خوا).

## سوورەتی کافیرون‌و ماناکەی:

أَعُوذُ باللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ: بِسْمِ اللهِ الرَّحمَنِ الرَّحِيمِ:

﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١﴾ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٢﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٣﴾ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ﴿٤﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٥﴾ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ﴿٦﴾﴾،

واتە: بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: ئەی بێ بڕواینە ﴿١﴾ من ئەو (بتان)ە، ناپەرستم کە ئێوە دەیپەرستن ﴿٢﴾ وە ئێوەش ئەو (خوای)ە، ناپەرستن کە من دەیپەرستم ﴿٣﴾ وە من ئەو خوا پەرستیە ناکەم کە ئێوە دەیکەن ﴿٤﴾ وە ئێوەش ئەو خوا پەرستیە ناکەن کە من دەیکەم ﴿٥﴾ ئایینی خۆتان بۆ خۆتان‌و ئایینی خۆم بۆ خۆم ﴿٦﴾.

---

١) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (٥٠٥٥)، وَحَسَّنَهُ العَلَّامَة الألباني في (صحيح الجامع): (٢٩٢))

# پـایەو پـاداشتی خـوێندنی

## سوورەتی ئیخلاص و فەلەق و ناس

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ خُبَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾، وَالْمُعَوِّذَتَيْنِ حِينَ تُمْسِي وَحِينَ تُصْبِحُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، تَكْفِيكَ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[1]

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی خوبەیب لە بابی دەگێڕێتەوە خوا لێیان ڕازی بێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووە: سوورەتی ئیخلاص و فەلەق و ناس بخوێنە سێ جاران لە کاتی ئێواران و بەیانیان بەستە، دەتپارێزێ لە هەموو شتێك.**

## سوورەتی نـاس و ماناکەی:

أَعُوذُ باللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ: بِسْمِ اللهِ الرَّحمَنِ الرَّحِيمْ:

﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ﴿٣﴾ مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ ﴿٤﴾ ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴿٦﴾ ﴾،

**واتە: بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خەڵکی ﴿١﴾ بە پادشای خەڵکی ﴿٢﴾ بە خوای خەڵکی ﴿٣﴾ لە شەڕو خراپەی ئەوەی وەسوەسەو خەتەرەو خەیاڵ دەخاتە دڵەوە (خەناس: بریتیە) لەوەی کە وەسوەسە فڕێ دەداتە سینەو دڵ و دەروونی خەڵکییەوە ﴿٤﴾ لەو شتانەی کە وەسوەسە فڕێ دەداتە ناو سینەو دڵ و دەروونی خەڵکییەوە ﴿٥﴾ لە جن و لە خەڵکی ﴿٦﴾.**

---

١) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (٥٠٨٢)، وَحَسَّنَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٤٤٠٦))

# پایەو پاداشتی باش خوێندنی قـورئان

{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «الْمَاهِرُ بِالْقُرْآنِ مَعَ السَّفَرَةِ الْكِرَامِ الْبَرَرَةِ، وَالَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ وَيَتَتَعْتَعُ فِيهِ، وَهُوَ عَلَيْهِ شَاقٌّ لَهُ أَجْرَانِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتـە: عائیـشە خـوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: کەسـی کارامـە لـە قورئـان (لـە خوێـنـدنیو تێگەیـشتیو کارپێکردنی)دا، ئەوە لەگەڵ فریشتە چاکەکارە بەڕێزەکانی خوان (کە خوا وەحی پێ دەنێری)، وە ئەو کەسەی کە قورئـان دەخوێنی، بـەڵام لەسـەر زمانی تـەواو نـایێ (واتـە: چاك نـایزانی) وە پێـشی ناخۆشـە، ئـەوە دوو پاداشتی هەیە، (پاداشتی خوێندنەکەی، وە پاداشتی ئەوەش کە لەسەر دڵی گرانە، هەرچەند دەکات فێری نابێ).**

## جێگاو پلەی قورئان لەبەر لە بەهەشت

{عَنْ أَبو سَعِيدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ نَبِيُّ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «يُقَالُ: لِصَاحِبِ الْقُرْآنِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِذَا دَخَلَ الْجَنَّةَ، اقْرَأْ وَاصْعَدْ، فَيَقْرَأُ وَيَصْعَدُ، بِكُلِّ آيَةٍ دَرَجَةً، حَتَّى يَقْرَأَ آخِرَ شَيْءٍ مَعَهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

**واتە: ئەبوو سەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبـەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە هـاوەڵی قورئـان دەگـوترێ (واتـە: ئـەو کەسـەی**

---

١) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٤٦٥٣)، وَمُسْلِمٌ: (١٨٩٨))

٢) (رَوَاهُ ابْنُ مَاجَهْ: (٣٧٨٠)، وَصَحَّحَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٢٢٤٠))

قورئانی خوێندوە، یان ئەو کەسەی قورئانی لەبەر کردوە) کە دەچێتە بەهەشت، بخوێنەو بەرز بەوەو سەرکەوە، جا هەر دەخوێنی‌و سەردەکەوێ بە هەموو ئایەتێك پلەیەك، هەتاکو کۆتا ئایەت کە پێیەتی (واتە: کە لەبەریەتی‌و تێگەیشتووەو کاری پێ کردوە).

(إبن القیم) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، دەڵێ: پلەکانی بەهەشت بە ئەندازەی ژمارەی ئایەتەکانی قورئانن، ئینسان چەند ئایەتی لەبەربێ ئەوەندە پلە بەرز دەبێتەوە.

{عَن أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «يَجِيءُ الْقُرْآنُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ! حَلِّهِ فَيُلْبَسُ تَاجَ الْكَرَامَةِ، ثُمَّ يَقُولُ: يَا رَبِّ! زِدْهُ فَيُلْبَسُ حُلَّةَ الْكَرَامَةِ، ثُمَّ يَقُولُ: يَا رَبِّ! ارْضَ عَنْهُ، فَيَرْضَى عَنْهُ، فَيُقَالُ لَهُ: اقْرَأْ وَارْقَ وَتُزَادُ بِكُلِّ آيَةٍ حَسَنَةً»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[1]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە ڕۆژی قیامەت دا قورئان دێ (لەگەڵ ئەو کەسەی خوێندوویەتی لە دنیا) دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! بیڕازێنەوەو خشڵی لەبەر بکەو ئیدی تاجی ڕێزی لەسەر دەنرێ، پاشان دەفەرموێ: زیاتری پێبدە، ئنجا جل‌و بەرگی ڕێزی لەبەر دەکرێ‌و دەڕازێنرێتەوە، ئنجا قورئان دەفەرموێ: ئەی پەروەردگارم لێی ڕازیبە، خواش لێی ڕازی دەبێ، ئنجا بەو کەسە دەگوترێ: قورئان بخوێنەو سەرکەوە (بۆ پلەکانی بەهەشت) وە هەموو ئایەتێك چاکەیەکی بۆ هەیە.

---

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٢٩١٥)، وَحَسَّنَهُ العَلَّامَة الألباني في (صحيح الجامع): (٨٠٣٠))

## قورئان شەفاعەت دەکات

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمر رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «الصِّيَامُ وَالْقُرْآنُ يَشْفَعَانِ لِلْعَبْدِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، يَقُولُ الصِّيَامُ: أَيْ رَبِّ مَنَعْتُهُ الطَّعَامَ وَالشَّهَوَاتِ بِالنَّهَارِ، فَشَفِّعْنِي فِيهِ، وَيَقُولُ الْقُرْآنُ: مَنَعْتُهُ النَّوْمَ بِاللَّيْلِ فَشَفِّعْنِي فِيهِ، قَالَ: فَيُشَفَّعَانِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەڕ خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕۆژوو و قورئان تکا بۆ بەندە دەکەن (لە ڕۆژی دوایی)، ڕۆژوو دەڵێ: پەروەردگار من قەدەغەم کردبوو لە خواردنو ئارەزووەکان بە ڕۆژ، تکای بۆ دەکەم، وە قورئان دەڵێ: قەدەغەم کردبوو لە نووستن بە شەو، فەرمووی: جا تکاو شەفاعەتیان لێ وەردەگیرێ.**

## پایەو پاداشتی خوێندنی یەك پیتی قورئان

{عَنْ عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ قَرَأَ حَرْفًا مِنْ كِتَابِ اللهِ فَلَهُ بِهِ حَسَنَةٌ، وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، لاَ أَقُولُ (أَلَم) حَرْفٌ، وَلَكِنْ أَلِفٌ حَرْفٌ، وَلاَمٌ حَرْفٌ، وَمِيمٌ حَرْفٌ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك پیتێك لە کتێبی خوا (واتە: قورئان) بخوێنێ چاکەیەکی بۆ هەیە، هەر چاکەیەکیش بە دە (١٠) چاکە دەنووسرێ، ناشڵێم (ألم) هەمووی یەك پیتە، بەڵکو ئەلیف پیتێکەو، لام پیتێکەو، میم پیتێکە.**

---

١) (رَوَاهُ الحَاكِمُ: (٢٠٣٦)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (المشكاة): (١٩٦٣))

٢) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٢٩١٠)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٣٣٢٧))

{عَنْ عَبْدَ اللهِ بْنَ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ رَسُوْلُ اللهِ: «اقْرَؤُا الْقُرْآن فَإِنَّكُم تُؤْجَرُونَ عَلَيْهِ، وَكُل حَرْفٍ عَشْر حَسَنَاتٍ، أَمَا إِنِّي لاَ أَقُولُ {ألم} حَرْف، وَلَكِنْ أَلِفٌ عَشْر، وَلاَمٌ عَشْرٌ، وَمِيْمٌ عَشْرٌ، فَتِلْكَ ثَلاَثُونَ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: قورئان بخوێنن، بێگومان ئێوە پاداشت لەسەر خوێندنەکەی وەردەگرن، وە هەموو پیتێك دە (١٠) چاکەیە، بەڵام من ناڵێم: (ألم) هەمووی یەك پیتە، بەڵکو ئەلیف دەیەو، لام دەیەو، میم دەیەو، کەواتە: ئەوە بووە سی چاکە.**

## پایەو پاداشتی
## خوێندنی سێ ئایەت

{عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، وَنَحْنُ فِي الصُّفَّةِ، فَقَالَ: «أَيُّكُمْ يُحِبُّ أَنْ يَغْدُوَ كُلَّ يَوْمٍ إِلَى بُطْحَانَ، أَوْ إِلَى الْعَقِيقِ فَيَأْتِىَ مِنْهُ بِنَاقَتَيْنِ كَوْمَاوَيْنِ فِي غَيْرِ إِثْمٍ، وَلاَ قَطْعِ رَحِمٍ»؟ فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللهِ نُحِبُّ ذَلِكَ، قَالَ: «أَفَلاَ يَغْدُو أَحَدُكُمْ إِلَى الْمَسْجِدِ فَيَعْلَمَ، أَوْ يَقْرَأَ آيَتَيْنِ مِنْ كِتَابِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ نَاقَتَيْنِ وَثَلاَثٌ خَيْرٌ لَهُ مِنْ ثَلاَثٍ، وَأَرْبَعٌ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَرْبَعٍ...»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

**واتە: عوقبەی کوڕی عامیر خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: ئێمە لە صوففە بووین، پێغەمبەری خوا ﷺ، هات بۆ لامان فەرمووی: کامتان پێی خۆشە هەموو ڕۆژێ بچن بۆ شیوی بوتحان، یان بڕۆن بۆ شیوی عەقیق، وە لەوێ دوو حوشتری مێنگەی دوونگ قەڵەو بێننەوە، بێ ئەوەی کە بە هۆی ئەوەوە تووشی گوناح**

---

١) (تاریخ بغداد للخطیب، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٦٦٠))
٢) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (١٩٠٩))

ببن، یان تووشی پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی ببن؟ گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ! هەمووومان حەز دەکەین، فەرمووی: هەر یەکێك لە ئێوە، هەر ڕۆژێك بچێ بۆ مزگەوت دوو ئایەت فێرببێ، یان دوو ئایەت بخوێنێ لە کتێبی خوای زاڵی پایەدار، ئەوە بۆی لە دوو حوشتر باشترە، وە سێ ئایەت لە سێ حوشتر باشترە بۆی، وە چوار ئایەت لە چوار حوشتر باشترە بۆی ... !!

## پایەو پاداشتی خوێندنی

## سەد ئایەت لە شەوێك دا

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ قَرَأَ فِي لَيْلَةٍ مِائَةَ آيَةٍ لَمْ يُكْتَب مِنَ الغَافِلِين، أَوْ كُتِبَ مِنَ القَانِتِين»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(١)

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك لە شەوێکدا، سەد (١٠٠) ئایەت بخوێنی لە بێ ئاگاییان نانووسرێ، یان لە جێبەجێکەرانی فەرمانی خوا دەنووسرێ.**

{عَنْ تَمِيمٍ الدَّارِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ قَرَأَ بِمِائَةِ آيَةٍ فِي لَيْلَةٍ كُتِبَ لَهُ قُنُوتُ لَيْلَةٍ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(٢)

**واتە: تەمیمی داریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك لە شەوێکدا، سەد (١٠٠) ئایەت بخوێنی، بە عیبادەتی ئەم شەوە بۆی دەنووسرێ، یانی: وەك ئەمە وایە ئەم شەوە قورئانی خوێندبێ و شەونوێژی کردبێ.**

---

١) (رَوَاهُ ابْنُ نَصر في (قيام الليل) ص٦٦، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٦٤٣))

٢) (رَوَاهُ أَحْمَدُ: (١٦٩٩٩)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٦٤٤))

## پایەو پاداشتی خوێندنی هەزار ئایەت لە شەوێکدا

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ قَامَ بِعَشْرِ آيَاتٍ لَمْ يُكْتَب مِنَ الْغَافِلِين، وَمَنْ قَامَ بِمِئَةِ آيَةٍ كُتِبَ مِنَ الْقَانِتِين، وَمَنْ قَامَ بِأَلْفِ آيَةٍ كُتِبَ مِنَ الْمُقَنْطَرِين»} **حَدِيثٌ صَحِيح**(١)

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەمرٍ خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك ڕۆژێ دە ئایەتان بخوێنی ئەوە لە بێئاگایان لە زیکری خوا نانووسرێ، وە هەر کەسێك سەد ئایەتان بخوێنی لە گوێڕایەڵان بۆ فەرمانی خواو پێغەمبەر دەنووسرێ، وە هەر کەسێك هەزار ئایەت بخوێنێ ئەوە پاداشتێکی یەکجار زۆری بۆ دەنووسرێ، (بە ئەندازەی ئاسمانەکان‌و زەوی).

## پایەو پاداشتی دانیشتن بۆ قورئان خوێندن

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللهِ تَعَالَى، يَتْلُونَ كِتَابَ اللهِ وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ، إِلاَّ نَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَحَفَّتْهُمُ الْمَلاَئِكَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**(٢)

---

١) (رَوَاهُ أَبُو دَوُدَ: (١٣٩٨)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٦٤٢))

٢ (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٧٠٢٨))

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ کۆمەڵێك نیە دابنیشن لە ماڵێك لە ماڵەکانی خوا قورئان بخوێننو یەکدی فێربکەن، ئەوە حەتمەن خوا فریشتە دەنێرێتە سەریانو، سەکینەتیان بەسەردا دێتە خوار، وە خوا بە ڕەحمەتی خۆی دایان دەپۆشێو چوار دەوریان بە فریشتە دەگرێتو وە باسیشیان دەکات لە لای ئەوانەی لای خۆین (واتە: لە لای فریشتەکان).

## بە هۆی قورئان خوێندنەوە سەکینەتت بەسەر دادەبەزێ

{عَنِ الْبَرَاءِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ رَجُلٌ يَقْرَأُ سُورَةَ الْكَهْفِ، وَعِنْدَهُ فَرَسٌ، مَرْبُوطٌ بِشَطَنَيْنِ، فَتَغَشَّتْهُ سَحَابَةٌ، فَجَعَلَتْ تَدُورُ وَتَدْنُو، وَجَعَلَ فَرَسُهُ يَنْفِرُ مِنْهَا، فَلَمَّا أَصْبَحَ أَتَى النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: «تِلْكَ السَّكِينَةُ تَنَزَّلَتْ لِلْقُرْآنِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: بەڕاء خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێك سوورەتی (کەهف)ی دەخوێند، ئەسپێکیشی لەلا بوو، بە دوو گوریسی درێژ بەسترابۆوە، هەورێك دایپۆشیو هەر بە دەوری خۆی دەسووڕاوەو لێی نیزیك دەبووەوە، ئەسپەکەش لێی دەترساو لێی هەڵدەهات، کە ڕۆژ بوەوە هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ئەوەی ڕووی دابوو باسی کرد، ئەویش فەرمووی: ئەوە سەکینەتو ئارمی (یەکی تایبەت بووە) بە هۆی ئەو قورئان خوێندنەوە دابەزیوە.

---

١ (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (١٨٩٢))

## بە هۆی قورئان خوێندنەوە نوورو ڕووناکیت بۆ پەیدادەبێ

{عَن أَبي ذَر رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ! أُوصِنِي، قَالَ: «عَلَيْكَ بِتَقْوَى اللهِ، فَإِنَّهُ رَأْسُ الأَمْرِ كُلِّهِ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! زِدْنِي، قَالَ: «عَلَيْكَ بِتِلاَوَةِ القُرآنِ، فَإِنَّهُ نُورٌ لَكَ فِي الأَرْضِ وَذُخْرٌ لَكَ فِي السَّمَاءِ»} حَدِيثٌ حَسَنٌ[1]

واتە: ئەبوو زەڕ خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! وەصیەتم بۆ بکە، (واتە: شتێکم پێ بڵێ بیکەم و پاداشتی لەسەر وەربگرم) فەرمووی: پارێزکاری لە خوا بکە، ئەوە چڵەپۆپەی هەموو کارەکانە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! زیاتر، فەرمووی: قورئان بخوێنەوە چونکە بێگومان دەبێتە نوورو ڕووناکی لە دنیاو، لە ئاسمانیش بۆت دەبێتە توویشوو.

## پایەو پاداشتی خوێندنی قورئان و گوێ بۆ گرتنی

{عَنْ خَالِدِ بْنِ مَعْدَانَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ لَهُ أَجْرٌ، وَإِنَّ الَّذِي يَسْتَمِعُ لَهُ أَجْرَانِ»}[2]

واتە: خالیدی کوڕی مەعدان خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێ پاداشتێکی بۆ

---

١) (رَوَاهُ إِبْنُ حِبَّانَ: (٣٦١)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (١٤٢٢))

٢) (رَوَاهُ الدَّارِمِي: (٣٣٦٦) وَقَالَ حُسَيْن سَلِيم أَسَد: لَمْ يَحْكُمْ عَلَيْهِ الْمُحَقِّق)

هەیە، وە ئەو کەسەش کە گوێی بۆ دەگرێ و دەیبیستێ، دوو پاداشتی بۆ هەیە.

تێبینی: دکتۆر (مصطفى ديب البغا) دەربارەی: (الَّذِي يَسْتَمِعُ لَهُ أَجْرَانِ) دەڵێ: دوو پاداشتەکە بریتین لە: پاداشتی گوێ گرتن، وە پاداشتی بیر لێکردنەوە(ی ماناکەی) خواش زاناترە.

(وە منیش حوکی هیچ زانایەکم دەست نەکەوت لەسەر (صحيح)ی و (ضعيف)ی ئەم فەرموودەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی هاندانێکی چاکی تێدایە بۆیە نووسیم).

## پایەو پاداشتی خوێندنی قورئان لەسەر موصحەف

{عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ : قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُحِبَّ اللهَ وَرَسُولَهُ فَلْيَقْرَأ فِي الْمُصْحَفِ» } حَدِيثٌ حَسَنٌ[1]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك حەز دەکات خواو پێغەمبەری خوای خۆش بوێ، با لەسەر موصحەف قورئان بخوێنێ. (واتە: ئەگەر تۆ ئەوانت خۆشویست، ئەوە خۆشویستنی وان بۆ تۆ لە پێشترەو ئەوانیش خۆشیان دەوێی).

---

١) (حلية الأولياء: (٧/ ٢٠٩)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٢٣٤٢))

# پایه‌و پاداشتی قـورئان

## خوێندن‌و کار پێکردنی

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُرَيْدَةَ الأَسْلَمِيِّ، عَنْ أَبِيْهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ وَتَعَلَّمَهُ وَعَمِلَ بِهِ أُلْبِسَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تَاجًا مِنْ نُورٍ، ضَوْءُهُ مِثْلُ ضَوْءِ الشَّمْسِ، وَيُكْسَى وَالِدَيْهِ حُلَّتَانِ، لاَ يَقُومُ بِهِمَا الدُّنْيَا فَيَقُولاَنِ: بِمَا كُسِيْنَا؟ فَيُقَالُ: بِأَخْذِ وَلَدِكُمَا الْقُرْآنَ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[1]

**واته: ئه‌بی بوره‌یده‌ی ئه‌سله‌میی، له بابی ده‌گێڕێته‌وه خوا لێی ڕازی بێ، که گوتوویه‌تی: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: هه‌ر که‌سێك قورئان بخوێنێ‌و فێریبێ‌و کاری پێ بکات، له ڕۆژی قیامه‌ت دا، تاجێکی نوورینی له‌سه‌ر ده‌نرێ، که تیشکه‌که‌ی وه‌ك تیشکی خۆره، وه دایك‌و بابیی ده‌ڕازێنرێنه‌وه‌و خشلیان له‌سه‌ر ده‌نرێ، که له دنیادا پێی هه‌ڵنه‌ستاون، ده‌ڵێن: ئه‌وه به‌چی ڕازێنراینه‌وه؟ پێیان ده‌گوترێ: به هۆی ده‌ستگرتنی منداڵه‌که‌تان به قورئانه‌وه.**

---

١) (رَوَاهُ الْحَاكِمُ، في (المستدرك): (٢٠٨٦)، وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ صَحيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ، وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) : (٢٨٢٩))

## وێنەی ئیماندارێك كه قورئان دەخوێنێ‌و یەكێكیش نایخوێنێ؟!

{عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلُ الأُتْرُجَّةِ، رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا طَيِّبٌ، وَمَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ مَثَلُ التَّمْرَةِ، لاَ رِيحَ لَهَا وَطَعْمُهَا حُلْوٌ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[1]

**واته: ئەبوو مووسای ئەشعەریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: وێنەی ئەو ئیماندارەی كه قورئان دەخوێنێ‌و له هەمان كاتیشدا كاری پێ دەكات وەك لیمۆ وایه، هەم بۆنی خۆشه هەم تامی خۆشه، وه وێنەی ئەو ئیماندارەی كه قورئان ناخوێنی، وەك خورما وایه، هەرچەندە بۆنی نیه بەڵام تامی خۆشه.**

## وێنەی كەسێك قورئان بــه نهێنی دەخوێنێ

{عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «الْجَاهِرُ بِالْقُرْآنِ كَالْجَاهِرِ بِالصَّدَقَةِ، وَالْمُسِرُّ بِالْقُرْآنِ كَالْمُسِرِّ بِالصَّدَقَةِ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[2]

**واته: واته: عوقبەی كوڕی عامیر خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم له پێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو: ئەو كەسەی كه قورئان به دەنگی بەرز دەخوێنێ، وەك ئەوەیه كه خێرو چاكه به ئاشكرا دەكات، وه ئەوەی**

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (١٨٩٦))

٢) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٢٩١٩)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٣١٠٥))

کە قورئان بە دەنگی نـزم دەخوێنێ وەك ئـەوە وایـە کـە خێـرو چاکە بـە پەنهانیی دەکات،

بێگومان جاری وایە وا باشە بە دەنگی بـەرز قورئـان بخوێنـدرێو جاری واش هەیـە وا باشـە بـە دەنگی نـزم، بـۆ وێنـە: ئەگـەر نوێژکـەر لەگـەڵ ئیمامدا نوێژی کرد دەبێ قورئانەکەی بە دەنگی نزم بخوێنێ، وە جاری وا هەیە ئەگەر بە تەنیاش نوێژی کـرد بـۆ نموونـە: شـەونوێژ، سوننەتە کە دەنگ بەرز بکاتەوە، جا وەك چۆن نوێژکردن جاری وایـە بـە دەنگی نـزم دەبێ قورئانەکە بخوێنـدرێو جـاری وایـە بـە دەنگی بـەرزبێ، بـە هـەمان شێوە مـاڵ بەخشینیش جـاری وایـە بـە ئاشکراو جاری واش هەیـە بـە پەنهان.

## پـایەو پـاداشتی
## فێر بوونی قورئان

{عَنْ عُثْمَانَ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[١]

واتە: عوسمانی کوڕی عـەففان خـوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: باشـترینی ئێـوە کەسـێکە کـە قورئـان فێربـێ وە قورئان فێری خەڵکی بکات.

لێرەدا وشـەی (تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ) مەبەسـت بـەس تـەنیا خوێنـدنی نیـە، بـەڵکو مانـای فێربـێو، یاساکانی فێربـێو، چۆنیـەتی کارپێکردنی فێربێو، چۆنیەتی هیدایـەت پێدانی فێربـێ، هـەمووی دەگرێتـەوە، ئـەو کەسە بە باشترین کەس دادەنرێ.

---

١) (رَوَاهُ أَحْمَد: (٥٠٠)، وَالبُخَارِيُّ: (٤٧٣٩))

# پایەو پاداشتی

# دەستگرتن بە قورئان

{عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِالْجُحْفَةِ، فَقَالَ: «أَلَيْسَ تَشْهَدُونَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ ، وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ ، وَأَنَّ الْقُرْآنَ جَاءَ مِنْ عِنْدِ اللهِ»، قُلْنَا: بَلَى، قَالَ: «فَأَبْشِرُوا، فَإِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ طَرَفُهُ بِيَدِ اللهِ وَطَرَفُهُ بِأَيْدِيكُمْ، فَتَمَسَّكُوا بِهِ فَإِنَّكُمْ لَنْ تَهْلِكُوا وَلَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُ أَبَدًا»}[١]

واتە: موحەممەدی کوڕی جوبەیری کوڕی موطعیم خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە جوحفە، پێی فەرموووین: ئایا ئێوە شایەدی نادەن کە هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە خوا، وە منیش پێغەمبەری خوام‌و قورئانیش لەلایەن خواوە هاتوە؟! گوتمان: با، فەرمووی: دە من موژدەتان دەدەمێ، کە ئەم قورئان (دوو بەشە)، بەشێکی بە دەستی خواوەیە، بەشێکی دیکەشی بە دەستی ئێوەوەیە، باش دەستی پێوە بگرن، هەرگیز لەناو ناچن‌و گومڕا نابن.

## ژمارەی پیت‌و وشەو ئایەت‌و سوورەتەکانی قورئان[٢]

دیارە هەر لە زووەوە زانایانی ئیسلام لێکۆڵینەوەو وردەکارییەکی زۆریان دەربارەی قورئان کردوە، ئنجا لەگەڵ ئەو لێ وردبوونەوەیان هەڵساون بە سەر ژمێری کردنی گشت ئایەت، تەنانەت سەر ژمێری هەموو وشەو پیت (حروف)ەکانی قورئان، لە ئەنجام دەڵێن: ژمارەی وشەکانی قورئان بریتین لە: (٧٧٤٣٩) حەفتاو حەوت هەزارو چوارسەدو سی و نۆ وشە، وە ژمارەی پیتەکانی بریتین لە: (٣٤٠٧٤٠) سێ سەدو چل

---

١) (رَوَاهُ الْبَزَّار: (٣٤٢١)، وَصَحَّحَهُ العلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع): (٣٤))

٢) تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، ج١، ص٢٥.

هەزار و حەوت سەدو چل پیت، وە ژمارەی ئایەتەکانی قورئان بریتین لە: (٦٢٣٦) شەش هەزارو دوو سەدو سی و شەش ئایەت، وە ژمارەی سوورەتەکانی قورئان یەك دەنگی زانایانی لەسەرە کە (١١٤)یە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕایەکی ڕیزپەڕ (شاذ) هەیە کە دەڵێ: (١١٣)یە ئەوەش سوورەتی (تەوبە)و (ئەنفال)ی بەیەك داناون بەلگەشیان ئەوەیە کە: (بِسْمِ اللهِ الرَّحمَنِ الرَّحِيم) نەخراوەتە نێوانیان، بەڵام زۆربەی زانایان ئەم ڕایە بەهەڵە دەزانن.

ئنجا با سەرنجی ژمارەی پیتەکانی هەندێ لە سوورەتەکان بدەین، وە پاداشتی هەریەکەیان بە ژمارە دیار بکەین، بەبێ ئەوەی (بِسْمِ اللهِ الرَّحمَنِ الرَّحِيم)ی لەگەڵ حسێب بکەین، سەرەتا دەڵێین: بە گشتی قورئان کە لە (٣٤٠٧٤٠) سێ سەدو چل هەزارو حەوت سەدو چل پیت پێك هاتوە، هەروەك گوتمان: ئەوەیەك دەنگی زانایانی لەسەرە.

کەواتە: هەر کەسێك هەموو قورئان بخوێنێو تەواو (ختم)ی بکات، ئەوە دەبێتە خاوەنی (٣٤٠٧٤٠٠) سێوچوار ملیۆنو حەفتاو چوار هەزار چاکە! ئنجا ئەگەر بێین بە شێوەیەکی تایبەتی هەندێك سوورەت دیاری بکەین، لەگەڵ پاداشتی خوێندنەوەی هەریەکەیان، بۆ نموونە:[1]

خوێندنەوەی: سوورەتی (البقرة) کە (٢٦١٥٢) پیتە، پاداشتەکەی = (٢٦١٥٢٠) چاکە.

خوێندنەوەی: جوزئی یەکەمی (البقرة)، (١٦٩٢) پیتە، پاداشتەکەی = (١٦٩٢٠) چاکە.

خوێندنەوەی: ئایەتی (الكُرسي) کە (١٨٩) پیتە، پاداشتەکەی = (١٨٩٠) چاکە.

---

١) العمل الصالح، ج٢، ص٩.

خوێندنـەوەی: دوو ئایـەتی کۆتـایی (البقـرة) کـە (٣٦٠) پیتـە، پاداشتەکەی = (٣٦٠٠) چاکە.

خوێندنـەوەی: سـوورەتی (السجدة) کـە (١٥٦٣) پیتـە، پاداشـتەکەی = (١٥٦٣٠) چاکە.

خوێندنـەوەی: سـوورەتی (الشمس) کـە (٢٥٣) پیتـە، پاداشـتەکەی = (٢٥٣٠) چاکە.

خوێندنـەوەی: سـوورەتی (الإخلاص) کـە (٤٧) پیتـە، پاداشـتەکەی = (٤٧٠) چاکە.

خوێندنەوەی: سوورەتی (الفلـق) کە (٧١) پیتـە، پاداشـتەکەی = (٧١٠) چاکە.

خوێندنەوەی: سوورەتی (النـاس) کە (٨٠) پیتـە، پاداشـتەکەی = (٨٠٠) چاکە.

خوێندنـەوەی: سـوورەتی (المسد) کـە (٨١) پیتـە، پاداشـتەکەی = (٨١٠) چاکە.

وە ئەگـەر کەسـێك لـە شـەوێکدا تـەنیا سـوورەتی (السَّجْدَةِ) و (تَبَارَكَ) بخوێنێ، کە ئـەوە سـوننەتی پێغەمبـەری خوایـە ﷺ، وەك لـە فەرمایشـتی (صحیح)دا هاتوە: {عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لَايَنَامُ حَتَّى يَقْرَأُ: بِـ ﴿تَنْزِيلُ﴾، السَّجْدَةِ، وبِـ ﴿تَبَارَكَ﴾} حَدِيثٌ صَحِيحٌ[1]

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نەدەخەوت هەتاکو سوورەتی (الْمُلْك) و سـوورەتی: (السجدة)ی دەخوێند

---

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٣٤٠٤)، وَصَحَّحَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٥٨٥))

(ئەوە ئەو کەسە دەبێتە خاوەن (٢٨٧٠٠) بیست‌و هەشت هەزارو حەوت سەد چاکە!)

سُبْحَانَ الله !! بەڕاستی جێی سەرسوڕمانە، وە ئینسان ناتوانێ بە هیچ شێوەیەك تەعبیر لە بەخشندەیی‌و سەخاوەتییەی قورئان‌و خاوەنەکەی بکات، وە وا لەو فەرموودانە دەگات کە خوای بەبەزەیی هەر مەبەستیەتی لە بەندەکانی خۆشبێت‌و بیانخاتە نێو ئەو نازو نیعەمەتە زۆرەی کە بۆی ئامادە کردوون، ئایا ئەوە ئەو پەڕی سۆزو بەخشندەیی‌و لێبوردەیی خوای پەروەردگار نیە بۆ ئێمە؟! با بە دڵنیایی، ئەوە خوای لێبوردەیە کە دەیەوێ لێمان خۆشبێ‌و بمانبورێ، تاکو لەگەڵ بەندە چاکەکانی بمانخاتە نێو بەهەشتی ڕازاوەوە، ئنجا ئایا باغێك کە خوای کاربەجێ بە دەستی خۆی دروستی کردبێ، دەبێ چۆن ڕازابێتەوەو چی تێدا ئامادە کرابێ؟!!

جا ئەگەر ئەوە هەر چاکەیەك بە دەیان بێ، وە ڕەنگە پاداشتەکە چەند بەرانبەر بێتەوە، بۆ بیست هێندە، یان سی هێندە، یان سەد هێندە، یان حەوسەد هێندەو زیاتریش ئەگەر خوا بیەوێ وەك لە فەرمایشتێکی قودسیی دا هاتوە: {قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: قَالَ اللهُ عَزَّ وجَلَّ: إِذَا هَمَّ عَبْدِي بِسَيِئَةٍ فَلاَ تَكْتُبُوهَا عَلَيْهِ، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا سَيِئَةً، وإِذَا هَمَّ بِحَسَنَةٍ فَلَمْ يَعْمَلْهَا فَاكْتُبُوهَا حَسَنَةً، فَإِنْ عَمِلَهَا فَاكْتُبُوهَا عَشْراً} **حَدِيثٌ صَحِيح**[1]

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای زاڵی پایەدار دەفەرموێ: هەر کات بەندەی من بەدڵی داهات خراپەیەك بکات لەسەری مەنووسن، (لەبەر ئەوەی کە بەدڵی داهاتوە) جا ئەگەر کردی، خراپەیەکی

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٣٤٩)، عَنْ أَبِي هُرَيرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

بۆ بنووسن، وە هەرکاتێك چاکەیەکی بە دڵدا هات‌و ئەنجامی نەدا، چاکەیەکی بۆ بنووسن، وە ئەگەر ئەنجامی دا، دە چاکەی بۆ بنووسن.

لێرەدا مەبەست لە خراپە بە دڵ داهاتن، ئەوەیە کە ئینسان بڕیاری لەسەر نەدابێ‌و دڵی لەسەر نەچەسپاندبێ، ئەوەی هەروا بەدڵی دادێت‌و دوایی لێی پەشێمان دەبێتەوە، ئەگەر دڵی لەسەر چەسپاند، یا بەکردەوەش ئەنجامی نەدا، یاخود بە قسەش دەری نەبڕێ، هەر لەسەری دەنووسرێ، چونکە دڵی خۆی لەسەر ساغ کردۆتەوە، وە لەڕاستیدا بناغەی چاکەو خراپە لە دڵدایەو بڕیاری نێو دڵە، هەر کەسێك کە دەیەوێ چاکەیەك بکات، پێشێ بەدڵ بڕیاری لەسەر دەدات، وە ئەگەر بیەوێ خراپەیەك بکات پێشێ بەدڵ بڕیاری لەسەر دەدات، بەڵام خوای پەروەردگار ڕەحمەتی پێش غەزەبی کەوتوەو بەخششی فراوانە، بۆیە کەسێك چاکەیەکی هەر بەدڵیش دابێ خوا دەفەرموێ: چاکەی بۆ بنووسن، وە ئەگەر ئەنجامیشی دا، بدات چاکەی بۆ بنووسن، بەڵگەش بۆ ئەم قسەیە ئەم ئایەتەیە: ﴿وَإِن تُبْدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ ٱللَّهُ...﴾ (٢٨٤) البقرة. واتە: ئەوەی کە لە دڵتاندا هەیە، ئەگەر ئاشکرای بکەن، یاخود پەنهانی بکەن خوا لێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەکات لەسەری.

سوپاس‌و ستایشی بێ حیسابی شایستەو شایەن بۆ خوای بەخشەرو ڕێنماییکەر، لە پێشاندنی ئەو هەموو ڕێگایە بۆ پاکبوونەوەو بەرزبوونەوەو بەرەو خوا چوونە!! وە دەشڵێم: بە ڕاستی زۆر سەیرەو جێی سەرنجە، کەسانێك هەبن، بە پاداشتێکی کەم ڕازیبن‌و هەوڵی بە دەست هێنانی پاداشتی بێ سنووری خوای بەخشندە نەدەن! بەڵکو دەڵێم: مسوڵمانی بەڕێز!

لە هەر قۆناغێکی دینداریی دای (بەس بەوەندە قەناعەت مەکەو، خوا لوتفو بەزەییو بەخششی زۆرو زەوەندەیە، بۆیە بە کەمی واز مەهێنە، دیارە ئاواتی گەورەشە کە پیاوی گەورە دروست دەکات، بەڵام ئاواتو مەبەستی بەرزیش ڕەنجو خەباتێکی لە قەدەر خۆی دەوێ).(١)

## بەرهەم و کاریگەریەکانی دەستگرتن بە قورئان:

لەبەر ئەوەی دەربارەی قورئان زۆر شت باسکراوەو خەڵکیش بە گشتی دەزانن قورئان چییەو، لەسەرەتاش ئێمە بە کورتی پێناسەمان کردوە، بۆیە بە شێوەیەکی کورتو پوخت تەنیا باس لە مانای دەستگرتن بە قورئان دەکەینو دواتریش باسی هەندێك لە بەرهەمو کاریگەریەکانی ئەم دەست پێوە گرتنە دەکەین إن شاء الله.

سەرەتا دەڵێین: دەستگرتن بە قورئان واتە: ئیمان پێ هێنانیو بەڕاست زانینی ئەو بەڵێنو پەیمانانەی کە تێدا هاتوون، وەك: باسو خواسی بەهەشتو دۆزەخو ڕۆژی دواییو بەسەرهاتی پێغەمبەرانو، بەسەرهاتی گەلو هۆزو تیرەکانی پێشوو ... هتد، هەروەها هەوڵدان بۆ تێگەیشتنیو کارپێکردنیو، خەڵك بۆ بانگرتنیو، ئارامگرتن لەسەر ئەو ئازارەی کە لە ئەنجامی کارپێکردنو خەڵك فێرکردنی دێتە ڕێ، هیچ گومانیشی تێدانیە ئەوەش خۆشیەکانی هەردوو دنیا مسۆگەر دەکات، لەبەر ئەوەی ئەو کەسەی دەست بە قورئان دەگرێ، (دەستگرتن بە مانای تێگەیشتنو کارپێکردنو خەڵك فێرکردنی) کەسێکی پارێزکارە بۆ خوای بەرز، وە هیچ کەسیش بەختەوەریی هەردوو دنیا بەدەست ناهێنێ جگە

---

١) ڕێگای صاڵح بوون بەرەو خواچوون چاپی پێنجەم، نووسینگەی تەفسیر.

لە پارێزکاران، بەپێی ئەو بەڵگە ڕاست و دروستانەی کە لە قورئاندا هاتوون وەك:

خوای پەروەدگار فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ۝٢ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمۡرِهِۦۚ قَدۡ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَيۡءٖ قَدۡرٗا ۝٣﴾ الطلاق، واتە: هەر کەسێك پارێزکاربێ خوا دەرووی لێ دەکاتەوە. وە ڕزق و ڕۆزی دەدات لە لایەکەوە کە بە خەیاڵیدا نەهاتوە، وە هەر کەسێ پشت بە خوا ببەستێ ئەوە خوای بەسە بەڕاستی خوا کارو فەرمانی خۆی بە ئەنجام دەگەیەنێ، بێگومان خوا بۆ هەموو شتێك ئەندازەیەکی دیاری کراوی داناوە. پاشان هەر لە هەمان سوورەت دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مِنۡ أَمۡرِهِۦ يُسۡرٗا ۝٤﴾ الطلاق، واتە: هەر کەسێك لە خوا بترسێ و پارێزکاربێ خوا کاروباری بۆ ئاسان دەکات، لە کۆتایی دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يُكَفِّرۡ عَنۡهُ سَيِّـَٔاتِهِۦ وَيُعۡظِمۡ لَهُۥٓ أَجۡرًا ۝٥﴾ الطلاق، واتە: هەر کەسێك لە خوا بترسێ و پارێزکاربێ (ئەوە خوای پەروەردگار) گوناهەکانی بۆ دادەپۆشێ و پاداشتی گەورەی دەداتێ. ئایا چ خێرو خۆشیەکی دنیاو دوارۆژ ماوەتەوە بۆ کەسی موتتەقی و پارێزکار دوای ئەوە هەمووە بەڵێن و وەعدەی کە لە خوای پەروەردگاری خۆی وەری گرتوە، ئەو خوایەی کە هیچ بەڵێنێکی خیلافی تێدانیە؟!

دەربارەی ئەوەش کە بەختەوەریی دنیا بریتی نیە لە کۆکردنەوەی ماڵ و سامان بەڵکو بریتیە لە تەقواو پارێزکاریی یەکێك لە شاعیران دەڵێ:

وَلَسْتُ أَرَى السَّعَادَةَ جَمْعَ مَالٍ ... وَلَكِنَّ التَّقِيَّ هُوَ السَّعِيدُ
وَتَقْوَى اللهِ خَيْرُ الزَّادِ ذُخْراً ... وَعِنْدَ اللهِ لِلأَتْقَى مَزِيدُ
وَمَا لا بُدَّ أَنْ يَأْتِي قَرِيبٌ ... وَلَكِنَّ الَّذِي يَمْضِي بَعِيدُ

بەختەوەری لە کۆکردنەوەی ماڵ نابینم ... بەڵکو ئەوەی پارێزکارە بەختەوەرە

پارێزکاری خوا باشترین زەخیرەی دوارۆژە ... بۆ پارێزکار لە لای خوا زیاتر هەیە

وە ئەوەی کە دێ ئەوەیان نیزیکە ... بەڵام ئەوەی تێپەڕ بووە زۆر دوورە

وە هەر کەسێك بە تەواوایی دەست بە قورئانەوە بگرێو پێوەی پابەندبێ، ئەوە بە دڵنیایی بووەتە خاوەن نووری هیدایەتو سەرکەوتنیشی لە هەموو کارێکدا مسۆگەر کردوە، وەك: خوای زاناو توانا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾﴾ الشوری

واتە: هەر بەو شێوەیە (کە وەحی پێدێ) قورئانمان بۆ تۆ نارد (ئەی موحەممەد ﷺ) بە فەرمانی خۆمان کە تۆ نەتدەزانی کتێب و ئیمان چییە؟ بەڵام ئێمە ئەوەمان کردە ڕووناکییەك یەك ڕێنمایی هەر کەسێکی پێدەکەین کە بمانەوێت لە بەندەکانمان، وە بەڕاستی تۆ (خەڵك) ڕێنمایی دەکەیت بۆ ڕێگای ڕاست.

مسوڵمانی خۆشەویست !

با چاو لە پێشینانی ئەم ئوممەتی ئیسلامە کە هاوەڵانی بەڕێزو شوێنکەوتووانیانن بکەین، کە زۆر بە هەستاریی و هۆشیاری پابەند بوون بە قورئانو هەوڵیانداوە موو بە موو لێی لانەدەن، وە زۆر سەرڕاست بوونو بەڕاستیش شوێنکەوتەی ئەم دینە بوون، بۆیە تەماشا دەکەین خوای پەروەردگار چۆن دەرووی خێری خۆی لێ کردبوونەوە بۆ فەتح کردنو ئازاد کردنی وڵاتان، بە هۆی تەبایی و هاوکاریی و یارمەتی نێو خۆیانەوە توانیان بگەنە ئەو ڕادەیەی کە دەستەڵاتیان بگاتە سەر سەرکردە زاڵمو دەستدرێژکەرانی فارسو ڕۆمو، خەڵکیش لە بەندایەتی

ئینسان بۆ ئینسانه‌وه بگۆڕن بۆ به‌ندایه‌تی خوای په‌روه‌ردگارو به‌دیهێنه‌ر ... هتد.

چونكه بێگومان ته‌نیا خوای پادشاو خاوه‌نی هه‌موو شتێك شایسته‌ی به‌ندایه‌تی بۆ كردنه، وه له‌وباره‌وه خوای په‌روه‌ردگار فه‌رموویه‌تی: ﴿ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَٰلِكَ ٱلْمُلْكِ تُؤْتِى ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلْمُلْكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُ ۖ بِيَدِكَ ٱلْخَيْرُ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٦﴾ ﴾آل عمران

واته: (ئه‌ی محه‌مه‌د ﷺ یان هه‌ر كه‌سێك كه قورئان ده‌خوێنیٚ) بڵێ: ئه‌ی خوایه خاوه‌نی موڵك‌و ده‌سته‌ڵات هه‌ر كه‌سێك بته‌وێ ده‌سته‌ڵاتی پیٚ ده‌ده‌ی‌و هه‌ر كه‌سێكیشت بوێ ده‌سته‌ڵاتی لیٚ ده‌ستێنی، وه هه‌ر كه‌سێكت بوێ زاڵی ده‌كه‌ی‌و هه‌ر كه‌سێكیشت بوێ زه‌بوونی ده‌كه‌ی چاكه هه‌ر به‌ده‌ست تۆیه بێگومان تۆ به هه‌موو شتێك تواناداری.

وه پێغه‌مبه‌ری خواش له فه‌رمایشتێك فه‌رموویه‌تی: {«إِنَّ اللهَ يَرْفَعُ بِهَذَا الْكِتَابِ أَقْوَامًا وَيَضَعُ بِهِ آخَرِينَ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[1]، واته: بێگومان خوای به‌رزو مه‌زن كۆمه‌ڵانێك به‌رزده‌كاته‌وه به هۆی ئه‌م قورئانه‌و، هه‌ندێكیشی پیٚ نزم ده‌كاته‌وه.

خوا له‌و كه‌سانه‌مان بگێڕیٚ كه به هۆی ئه‌م قورئانه به‌رزه‌وه به‌رزده‌بینه‌وه، چ له‌و كاته‌ی له ژیاندایین، چ له‌و كاته‌ی كه ده‌مرین، چ له كاتی زیندوو كردنه‌وه‌مان ئامین.

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (١٩٣٤)، عَنْ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)

# سوودەکانی قورئان خوێندن

بێگومان بە هیچ شێوەیەك ناتوانرێ سوودەکانی قورئان خوێندن‌و لەبەر کردن‌و دەور کردنەوەی بژمێردرێ، بەڵام بەباشمان زانی ئاماژە بە هەندێك لە سوودەکانی بکەین:

١)- لەگەڵ خوێندنی هەر پیتێك دە چاکەت بۆ دەنووسرێ.

٢)- مەلائیکەت دەورت دەدەن، سەکینەتیشت بۆ دادەبەزێ.

٣)- هەمیشە دڵ خۆش‌و سینگ فرەوان دەبی لە دنیا.

٤)- ڕازاوەترین‌و باشترین‌و بەرزترین شوێنت دەبێ لە بەهەشت.

٥)- مەلائیکەت دووعات بۆ دەکەن‌و داوای لێخۆشبوونت بۆ دەکەن.

٦)- هەر لە دنیا خوا پلەو پایەت بەرز دەکاتەوە.

٧)- لە ڕۆژی دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ شایەدیت بۆ دەدات لەلای خوا.

٨)- شەیتان لە خۆت‌و ماڵت دوور دەکەوێتەوە.

٩)- لەگەڵ فریشتە نزیکەکانی خوا حسێب دەکرێی گەر باشی جوانی بخوێنی.

١٠)- ترس‌و خۆشەویستیت لە خوا هەمیشە لە زیادبوون دا دەبێ.

١١)- خوا لەلایەن مەلائیکەتەکانی باست دەکات.

١٢)- ئایەتی کورسیش دەتپارێزێ لە شەیتان‌و جنۆکەکان.

١٣)- لە قیامەت قورئان دێ‌و شەفاعەت‌و تکات بۆ دەکات.

١٤)- سوورەتی مولك بەرگریت لێدەکات تا دەتخاتە نێو بەهەشت.

١٥)- سوورەتەکانی بەقەرەو ناس و فەلەقیش دەتپارێزن لە سیحرو جادوو.

١٦)- دەوڵەمەندیی دڵ و دەروون پەیدا دەکەی، وەك چۆن کەسێك دەوڵەمەندیی پارەو پوولی هەیە، کە بە دڵنیایی دەوڵەمەندی دڵ و دەروون گرنگە نەك دەوڵەمەندیی پارەو پوول، وەك خۆشەویست فەرموویەتی: {لَيْسَ الْغِنَى عَنْ كَثْرَةِ الْعَرَضِ، وَلَكِنَّ الْغِنَى غِنَى النَّفْسِ}.

# بەشی دووەم

# پایەو پاداشتی زیکرو پاڕانەوە

# زیکرو پاڕانەوە

## واتاو پێناسەی (ذكر)

**(أ)- لە ئەسڵی زمان دا:**

زمان زانان بە چەند شێوەیەك پێناسەی وشەی (ذِكْر)یان کردوە، کە وشەیەکی عەرەبییە، بەڵام هەموو پێناسەکان لە نێوەڕۆکدا یەکن، بۆ وێنە:

خاوەنی کتێبی (مُخْتَارُ الصَّحَاح) گوتوویەتی: (الذِّكْرُ و الذِّكْرَى وَالذُّكْرَةَ: ضِدُّ النِّسيَانِ)، واتە: هەرکام لە: (ذِكْرو، ذِكْرى، ذُكرة) دژی لە بیرچوونەوەن، کەواتە: (ذِكْر) یانی: لە بیربوون‌و بیرهاتنەوە.

(رَاغِب الأصْفَهَانِي)یش دەربارەی وشەی (ذِكْر) گوتوویەتی: (الذِّكْرُ: وَتَارَةً يُقَالُ لِحضُورِ الشَّيءِ القَلْب أَو القَوْل، وَلِذَلِكَ قِيلَ: الذِّكْرُ ذِكْرَانُ: ذِكْرُ عَنْ نِسْيَانٍ وَذِكْرُ لاَعَنْ نِسيَانٍ)، واتە: وە جاری وا هەیە (ذِكْر) بە شتێك دەگوترێ کە لە دڵدا یان لەسەر زمان ئامادە دەبێ، بۆیە گوتراوە، یادکردنەوە دووجۆرە: یادی بە دڵ‌و یادی بە زمان، هەر کامێکیشیان دوو جۆرە: یادکردن دوای لەبیرچوونەوە، وە یادکردن بەبێ لەبیرچوونەوە. کەواتە: (ذِكْر) یان باسکردنی شتێکە بە دڵ یان بە زمان، یان بە هەردووکیان.

**(ب)- لە زاراوی شەرعدا:**

دیارە شەرعیش وشەی (ذِكْر)ی هەر لەسەر ئەسڵی واتا زمانییەکەی خۆی بەکارهێناوە، وەك سەرجەم وشەکانی دیکەی وەك: (صَلاَة، وَ صَوْم، وَ زَكَاة، وَ حَجّ، وَ جِهَاد ...الخ)، بەڵام تایبەت‌و بەندار (مُقَيِّد)ی

کردوە بە خوای بێ وێنەو تاكو پاکەوە، کەواتە: پێناسەی (ذِكْر) لە زاراوەی شەرع دا ئاوای لێهاتوە:

(ذِكْر): بریتیە لە بەسەر دڵو زماندا هێنانی یادی خواو سیفەتە بەرزەکانیو ناوە پەسندەکانیو بە پاك گرتنو ستایشکردنو بە گەورەو مەزنو بەرز گرتنیی.

ئەم پێناسەیە پوختەی سەرجەم قسەو شیکردنەوەی زانایانە کە بە مەبەستی زیاتر بەرچاو ڕوونی ئەم چەند نموونەیان لێ دەخەینەوە ڕوو:

١- (سَعِيد بْنِ جُبَيـر)یش گوتوویەتی: هەرکەسێك لە فەرمانبەریی (طاعة)ی خوادا بجووڵێو کاربکات، ئەوە یادی خوای کردوە.

٢- (عَطَـاء)یش گوتوویەتی: کۆڕەکانی زیکر بریتین لە: کۆڕەکانی حەلاڵو حەرام باسکردن، چۆن دەکڕیو دەفرۆشیو نوێژ دەکەیو بەڕۆژوو دەبیو ژن دێنیو تەلاقی دەدەیو حەج دەکەیو ئەو جۆرە شتانە.

٣- (قُرطُبي)یش لەوبارەوە گوتوویەتی: کۆڕی زیکر، یانی کۆڕی زانستو ئامۆژگاری ئەو کۆڕانەی کە قورئانی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی تێدا دەخرێتە ڕوو، هەروەها هەواڵیی پێشینە چاکەکانو پێشەوایانی پێشووی دنیا بە کەمگرتن (کە دوور بوون لە ڕیاکارییو داهێنانو دنیا ویستیو (طەماع)یانمان تێدا دەگێڕڕێتەوە.

خوای پایەدار لە قورئانی پیرۆز لە زۆر شوێن باسی زیکرو یادی خۆی فەرمووە، تەنانەت جاری وایە فەرمانیشی پێکردوە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الإنسان)دا ڕووی لە پێغەمبەر ﷺ، وە هەر کەسێکیش کە مسوڵمانەو شوێن پێ هەڵگری پێغەمبەری خوایە دەکاتو دەفەرموێ: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ تَنزِيلًا ﴿٢٣﴾ فَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تُطِعْ مِنْهُمْ ءَاثِمًا

أَوْ كَفُورًا ﴿٢٤﴾ وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٢٥﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَٱسْجُدْ لَهُۥ وَسَبِّحْهُ لَيْلًا طَوِيلًا ﴿٢٦﴾﴾، واتە: ئێمە بە دابەزاندن قورئانمان دابەزاندۆتە سەر تۆ ﴿٢٣﴾ دەجا بۆ حوكمی پەروەردگارت خۆڕاگربەو، فەرمانبەریی هیچ گوناهبارێكی سپڵەیان مەكە ﴿٢٤﴾ وە بەیانیان‌و ئێواران ناوی پەروەردگارت باس بكە ﴿٢٥﴾ وە لە شەوگاریشدا سەجدەی بۆ ببەو، لە ماوەیەكی درێژی شەوگاردا بە پاكی بگرە ﴿٢٦﴾.

هەروەها لە سوورەتی (طە)شدا دەفەرموێ: ﴿فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا ۖ وَمِنْ ءَانَآئِ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْ وَأَطْرَافَ ٱلنَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرْضَىٰ ﴿١٣٠﴾﴾، واتە: دەجا خۆڕاگربە لەسەر ئەوەی دەیلێن‌و بە ستایش كردنەوە پەروەردگارت بە پاك بگرە، پێش خۆرهەڵاتن‌و پاش ئاوابوونیشی، وە لە كاتەكانی شەوگارو ئەملاولای ڕۆژگاردا بەڵكو - بە هۆی پاداشت درانەوەتەوە ڕازیبی - ﴿١٣٠﴾.

وە فەرمایشتیش دەربارەی پایەو پاداشتی زیكری خوای پەروەردگار زۆر زۆرن، وە كەسانێكی زۆریش لەو هەمووە پایەو پاداشتانە تاكو ئێستا بێبەش بوو ون، جا بە هۆی ئاگادار نەبوونیان بەو هەموو پاداشتەی كە تێیاندا بەدەست دەهێنرێ، یان لەبەر هەر هۆیەكی دیكەبێ، ئنجا تەمەنی ئینسانیش زۆر كەمەو دەرفەتە سوودی لێ وەربگیرێ، وە ئەو كاتانە بە فیرۆ نەدرێن لە شتێك كە ببێتە مایەی پەشیمان بوونەوە، وە ڕەنگە زۆرجار ئینسان بەوەش ڕانەگات كە پەشێمان ببێتەوە، بۆیە دەربارەی بە فیڕۆدانی كات‌و بێ ئاگایی لە زیكری خوای پەروەردگار، عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: {قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مَا مِنْ سَاعَةٍ تَمُرُّ بِـابْنِ آدَمَ، لَمْ يَذْكُرِ اللهَ فِيهَا، إِلاَّ تَحَسَّرَ عَلَيْهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ}[1]

---

١) (رواهُ البَيْهَقِيُّ في (شعب الإيمان) (٥١١)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع): (٥٧٢٠))

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کاتێك نیە کە دەڕوات لە وەچەی ئادەم و زیکری خوای تێدا ناکات، حەتمەن لە ڕۆژی قیامەت لێی پەشێمان دەبێتەوە. کە بێگومان ئەو کاتیش پەشێمانی هیچ سوودێکی بۆی نابێ.

یەکێکیش لە شاعیران دەربارەی ڕێزو پلەو پایەی زیکروشوکر دەڵێ:

لَوْ يَعلَـمُ العَبـدُ ما في الذِّكْرِ مِنْ شَـرَفٍ
أمْضَـى الحـياةَ بتسـبيحٍ وتَـهْلـيـلِ
لَوْ يَعْلَمُ النَّـاسُ مَا في الشُّكْرِ مِنْ شَـرَفٍ
لَمْ يُلْـهِهِم عَنْـهُ تَجْمعُ الـدَّنـانيـرِ
ولـم يُـبـالُـوا بـأوراقٍ ولا ذهبٍ
ولَـو تَـجَـمَّعَ آلافُ القَنـاطِـيـرِ
فَـأَكْـثِرْ ذِكْرهُ في الأرضِ دأبـاً
لِتُـذْكَـرَ في السَّـمـاءِ إذا ذَكَرتَ

**خوشك و برای هۆشیارو بێدارم!**

پێش ئەوەی تووشی پەشێمانی بینەوە، ئەوە ئەو کاتانەی هێشتا لە پێشمان ماون، دەرفەتێکە بۆ ئەوەی خۆمان ڕزگار بکەین لە سزای خوای زاڵی تۆڵەسێنەری دادگەر، کە زیکری گێڕاوە بۆمان بە هۆکاری ڕزگار بوون لە سزای خۆی، وەك لەم فەرمایشتەدا هاتوە: {عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ قَـالَ: قَـالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ): «مَـا عَمِلَ آدَمِيٌّ عَمَلاً قَطُّ أَنْجَى لَـهُ مِنْ عَذَابِ اللهِ مِنْ ذِكْرِ اللهِ»} **حَدِيثٌ صَحيح**[1]

واتە: موعاذی کوڕی جەبەل خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کارێك نیە وەچەی ئادەم بە هۆیەوە ڕزگاری ببێ لە سزای خوا، هەرگیز، وەك زیکری خوا، یانی: زیکری خوا لە هەموو کردەوەیەکی بەنی ئادەم زیاتر بە هانایەوە دێ و ڕزگاری دەکات لە سزا !

١) (رَوَاهُ أَحْمَدُ: (٢٢١٣٢)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٥٦٤٤))

ئنجا دەربارەی ئەوە کە زیکری خوا چاکترینی کارەکانە، ئەم فەرموودەیە هەیە: {عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَلا أُنَبِّئُكُمْ بِخَيْرِ أَعْمَالِكُمْ، وَأَزْكَاهَا عِنْدَ مَلِيكِكُمْ، وَأَرْفَعِهَا فِي دَرَجَاتِكُمْ، وَخَيْرٌ لَكُمْ مِنْ إِنْفَاقِ الذَّهَبِ وَالْوَرِقِ، وَخَيْرٌ لَكُمْ مِنْ أَنْ تَلْقَوْا عَدُوَّكُمْ فَتَضْرِبُوا أَعْنَاقَهُمْ وَيَضْرِبُوا أَعْنَاقَكُمْ؟» قَالُوا: بَلَى، قَالَ: «ذِكْرُ اللهِ تَعَالَى»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: ئەبی دەرداء خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا هەواڵتان نەدەمێ: بە چاکترینی کارەکان، وە بە پاکترینی لەلای پادشاتان، کە پلەتان پێی زۆر بەرزبێتەوە، کە چاکتر بێ بۆ ئێوە لە بەخشینی زێڕو زیو، وە چاکتربێ بۆ ئێوە لە پێکگەیشتنتان لەگەڵ دوژمن و لە گەردەنیان بدەن و لە گەردنتان بدەن؟ ئەوانیش گوتیان: با هەواڵمان پێ بدە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! فەرمووی: زیکر کردنی خوای بەرز.

هەروەها لە وەڵامی پرسیاری پیاوێکی خێڵەکی دەربارەی ئەوە کە ئایا چاکترینی خەڵکی، وە چاکترین کار کامەیە؟ ئەم فەرمایشتە هەیە: {عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ بُسْرٍ الْمَازِنِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيَانِ إِلَى رَسُوْلِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ أَحَدُهُمَا: يَا رَسُوْلَ اللهِ أَيُّ النَّاسِ خَيْرٌ؟ قَالَ: «طُوبَى لِمَنْ طَالَ عُمُرَهُ وَحَسُنَ عَمَلُهُ»، وَقَالَ الآخَرُ: أَيُّ الْعَمَلِ خَيْرٌ؟ قَالَ: «أَنْ تُفَارِقَ الدُّنْيَا وَلِسَانُكَ رَطْبٌ مِنْ ذِكْرِ اللهِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

---

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٣٣٧٧)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (١٤٩٣)).

٢) (حلية الأولياء: (٣٢٨٢) وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٨٣٦)).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بوسری مازینیی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: دوو پیاوی دەشتەکیی هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، یەکێکیان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا کێ چاکترینی خەڵکییە؟ فەرمووی: خۆشیی و سەرفرازی بۆ ئەو کەسەی تەمەنی درێژ و کردەوەی باشن، وە دووەمیان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا کامە کار چاکترینی کارەکانە؟ فەرمووی: ئەوە چاکترینی کارەکانە کە لە دنیا جیاببیەوە، (واتە: بمری) و لەو کاتەشدا زمانت تەڕو پاراو بێ بە زیکری خوا.

## زیکری خوا بکەی خواش زیکرت دەکات

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى الله عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): يَقُولُ: قَالَ اللهُ تَعَالَى: «أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي، وأَنَا مَعَهُ إِذَا ذَكَرَنِي، فإِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفسِهِ ذَكَرتُهُ فِي نَفْسِي، وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلأ ذَكَرتُهُ فِي مَلأ خَيْرٍ مِنْهُمْ، وإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ بِشِبْرٍ تَقَرَّبْتُ إِلَيهِ ذِرَاعًا، وإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ ذِرَاعًا تَقَرَّبْتُ إِلَيهِ بَاعًا، وإِنْ أَتَانِي يَمْشِي أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً»} **حديثٌ صَحيحٌ**[1]

واتە: ئەبوو هوڕەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: خوای بەرز دەفەرموێ: من لەگەڵ بەندەی خۆم دام کاتێک یادم دەکات و باسم دەکات، ئەگەر لە دڵی خۆیدا یادم بکات و باسم بکات منیش لە نەفسیی خۆمدا باسی دەکەم، بە پەنهانیی، بەڵام ئەگەر لە نێو کۆڕێک دا باسم بکات من لە کۆڕێکی باشتردا لە کۆڕەکەی ئەو باسی دەکەم (کە کۆڕی فریشتە نزیکەکانە)، وە ئەگەر بستێک لێم نیزیک بێتەوە من

١) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٦٩٧٠)، وَمُسْلِمٌ: (٦٩٨١))

باسکێك لێی نیزیك دەبمەوەو ئەگەر باسکێك لێم نیزیك بێتەوە، من باڵێك لێی نیزیك دەبمەوە، وە ئەگەر بەڕۆیشتن بەرەو لای من بێ، من بە ڕاکردن بەرەو ڕووی دەچم.

هەڵبەتە[1] ئەوە لێرەدا هەمووی وێناکردنە (تَمْثِيلَ)ە، ئەگەرنا خوای بێ وێنە ڕاکردن‌و وێنەی ئەوانەی نیە، یان وەك لە فەرموودەی قودسی دا هاتوە دەفەرموێ: بەندەی من بە هیچ شتێك ئەوەندە لە من نیزیك نەکەوتۆتەوە وەك جێبەجێکردنی فەڕزەکان، وە بەردەوام بە کردنی سوننەتەکان لێم نیزیك دەبێتەوە تاوەك خۆشم دەوێ، جا ئەگەر خۆشم ویست دەبمە ئەو چاوەی پێی دەبینێ‌و، ئەو گوێیەی پێی دەبیستێ‌و، ئەو دەستەی شتی پێ دەگرێ‌و، ئەو لاقەی پێی دەڕوا. خۆ خوا سبحانه و تعالى نابێتە چاوو دەست‌و گوێ‌و لاق! کەواتە: ئەمە یانی چی؟ یانی: وای لێ دەکەم چاوی تەنیا لە ڕەزامەندیی من حەڕەکە بکات‌و گوێی هەر بۆ ئەو شتانە ڕادێرێ کە من پێم خۆشەو، دەستی تەنیا بۆ ئەو شوێنانە بەکاربێنێ کە من پێم خۆشە، هەروەها بەپێی تەنیا بۆ ئەو شوێنانە بڕوا کە من پێم خۆشە، واتە: ئەندامەکانی لە ڕەزامەندیی من دا نەبێ جمموجۆڵ نەکەن، مەبەست پێی ئەوەیە، وەك گوتم بەڕاستی ئەوە موژدەیەکی خۆشە، کە بە هۆی یادکردنت بۆ خواوە خوا یادت بکات!

---

١) تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز.

# پایه‌و پاداشتی
# زیكری خوا له كـۆڕو مه‌جلیس

{عَنْ سَهْلِ بْنِ حَنْظَلَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَا جَلَسَ قَوْمٌ مَجْلِساً يَذْكُرُونَ اللهَ (عَزَّ وَجَلَّ) فِيهِ فَيَقُومُونَ، حَتَّى يُقَالُ لَهُمْ: قُومُوا قَدْ غَفَرَ اللهُ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ، وَبُدِّلَتْ سَيِّئَاتُكُمْ حَسَنَاتٍ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[١]

**واته: سه‌هلی كوڕی (حَنْظَلَةَ)ه، خوا لێی ڕازی بێ، ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: هه‌ر كۆمه‌ڵه خه‌ڵكێك كه له كۆڕێك دانیشتوون‌و، تێیدا باس‌و یادی خوای زاڵی خاوه‌ن شكۆیان تێدا كرد هه‌ڵناستن، هه‌تا پێیان ده‌گوترێ: هه‌ڵسن، بێگومان بوردران له گوناهه‌كانتان، وه خراپه‌كانیشتان بۆ گۆڕدرا به چاكه‌كان!**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَأَبِي سَعِيدِ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّهُمَا شَهِدَا عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ قَالَ: «لاَ يَقْعُدُ قَوْمٌ يَذْكُرُونَ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ إِلاَّ حَفَّتْهُمُ الْمَلاَئِكَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَنَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[٢]

**واته: ئه‌بوو هوره‌یره‌و ئه‌بوو سه‌عیدی خودری خوا لێیان ڕازی بێ ئاماده بوون له‌وێ كاتێك پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی: هه‌ر كۆمه‌ڵه خه‌ڵكێك دابنیشن زیكرو یادی خوای زاڵ‌و به‌رز بكه‌ن، حه‌تمه‌ن فریشته ده‌وریان ده‌ده‌ن، وه به‌ره‌حمه‌ت داده‌پۆشرێن‌و ئارامی‌و سه‌كینه‌تیان**

---

١) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي (المعجم الكبير): (٦٣٩)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٢٢١٠))

٢) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٧٠٣٠))

دادەبەزێتە سەر، وە خوا باسیان دەکات لەلای ئەوانەی کە لەلای خۆینە، (واتە: لە لای فریشتەکان).

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ صَلَّى الْغَدَاةَ فِي جَمَاعَةٍ، ثُمَّ قَعَدَ يَذْكُرُ اللهَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ: كَانَتْ لَهُ كَأَجْرِ حَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ»، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «تَامَّةٍ تَامَّةٍ تَامَّةٍ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[1]

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك نوێژی بەیانی بکات بە جەماعەت، پاشان دابنیشێو زیکری خوا بکات تاکو ڕۆژ هەڵدێ، پاشان دوو ڕکات نوێژی (سوننەت) بکات، ئەوە پاداشتی ئەنجامدانی حەجو عومرە کردنەکی بۆ هەیە، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بە تەواوی بە تەواوی، (یانی پاداشتەکەی بە تەواوی بۆ دەنووسرێ).

{عَنْ أَبِي أُمَامَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ صَلَّى صَلاَةَ الْغَدَاةِ فِي جَمَاعَةٍ، ثُمَّ جَلَسَ يَذْكُرُ اللهَ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، ثُمَّ قَامَ فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ انْقَلَبَ بِأَجْرِ حَجَّةٍ وَعُمْرَةٍ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ**[2]

واتە: ئەبی ئومامە خوا لێی ڕازیبێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك نوێژی بەیانی بکات بە جەماعەت، پاشان دابنیشێو زیکری خوا بکات تاکو ڕۆژ هەڵدێ، ئنجا هەڵسێو دوو ڕکات نوێژی (سوننەت)یش بکات، کە دەگەڕێتەوە بە پاداشتی حەجو عومرە کردنێك دەگەڕێتەوە.

---

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٥٨٦)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٣٤٠٣)).

٢) (رَوَاهُ الطَّبَرَانيُّ في (المعجم الكبير): (٧٧٤١)، وَقَالَ العَلاَّمَةُ الألباني: حَسَنٌ صَحِيحٌ في (صحيح الترغيب والترهيب): (٤٦٧)).

{عن أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِذَا مَرَرْتُمْ بِرِيَاضِ الْجَنَّةِ! فَارْتَعُوا، قَالُوا: وَمَا رِيَاضُ الْجَنَّةِ؟ قَالَ: حِلَقُ الذِّكْرِ»} **حديثٌ حسَنٌ**[(١)]

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر بە لای باخچەکانی بەهەشت دا ڕۆیشتن، ئیسترِاحەتی لێ بکەن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا باخچەکانی بەهەشت چین؟! فەرمووی: کۆڕو مەجلیسی زیکر.**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ للهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى مَلَائِكَةً سَيَّارَةً فُضُلاً، يَتَتَبَّعُونَ مَجَالِسَ الذِّكْرِ، فَإِذَا وَجَدُوا مَجْلِسًا فِيهِ ذِكْرٌ قَعَدُوا مَعَهُمْ وَحَفَّ بَعْضُهُمْ بَعْضًا بِأَجْنِحَتِهِمْ، حَتَّى يَمْلَئُوا مَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ السَّمَاءِ الدُّنْيَا، فَإِذَا تَفَرَّقُوا عَرَجُوا وَصَعِدُوا إِلَى السَّمَاءِ، قَالَ: فَيَسْأَلُهُمْ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ وَهُوَ أَعْلَمُ بِهِمْ: مِنْ أَيْنَ جِئْتُمْ؟ فَيَقُولُونَ: جِئْنَا مِنْ عِنْدِ عِبَادٍ لَكَ فِي الأَرْضِ يُسَبِّحُونَكَ، وَيُكَبِّرُونَكَ، وَيُهَلِّلُونَكَ، وَيَحْمَدُونَكَ، وَيَسْأَلُونَكَ، قَالَ: وَمَاذَا يَسْأَلُونِي؟ قَالُوا: يَسْأَلُونَكَ جَنَّتَكَ، قَالَ: وَهَلْ رَأَوْا جَنَّتِي؟ قَالُوا: لا أَيْ رَبِّ، قَالَ: فَكَيْفَ لَوْ رَأَوْا جَنَّتِي؟ قَالُوا: وَيَسْتَجِيرُونَكَ، قَالَ: وَمِمَّ يَسْتَجِيرُونَنِي؟ قَالُوا: مِنْ نَارِكَ يَا رَبِّ، قَالَ: وَهَلْ رَأَوْا نَارِي؟ قَالُوا: لا، قَالَ: فَكَيْفَ لَوْ رَأَوْا نَارِي؟ قَالُوا: وَيَسْتَغْفِرُونَكَ، قَالَ: فَيَقُولُ قَدْ غَفَرْتُ لَهُمْ فَأَعْطَيْتُهُمْ مَا سَأَلُوا، وَأَجَرْتُهُمْ مِمَّا اسْتَجَارُوا، قَالَ فَيَقُولُونَ: رَبِّ فِيهِمْ فُلَانٌ عَبْدٌ خَطَّاءٌ إِنَّمَا مَرَّ فَجَلَسَ مَعَهُمْ، قَالَ فَيَقُولُ: وَلَهُ غَفَرْتُ، هُمْ الْقَوْمُ لا يَشْقَى بِهِمْ جَلِيسُهُمْ»} **حديث صَحيح**[(٢)]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوای تبارك وتعالی چەند مەلائیکەتێکی گەڕۆکی زیادەی**

---

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٣٥١٠)، وَحَسَّنَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (صحيح سُنَن الترمذي)).

٢) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِي: (٦٠٤٥)، وَمُسْلِمٌ: (٧٠١٥))

هەن دەگەڕێن لە کۆڕو مەجلیسی زیکر، کاتێك کۆڕێکیان بینی زیکرو یادی خوا دەکەن لەگەڵ وان دادەنیشن‌و بە باڵەکانیان پەرژین دەکەن، هەتا نێوان خۆیان‌و نێوان ئاسمانەکانی دنیا پڕ دەکەن، کاتێك کۆڕەکەیان بڵاوە پێکردو لێك جیابوونەوە مەلائیکەتەکانیش بەرز دەبنەوە بۆ ئاسمان، گوتی: ئنجا خوای زاڵی پایەدار لێیان دەپرسێ‌و لە کاتێك خۆی زاناترە لەوانیش: دەفەرموێ: لە کوێوە هاتن؟ دەڵێن: لە لای چەند بەندەیەکی خۆتەوە هاتووینەوە لەسەر زەوی کە هەمیشە دەیانگوت: (سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ للهِ، وَلاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ)، وە لە تۆش دەپاڕانەوەو داوایان لێ دەکردی، فەرمووی: داوای چیان لێم دەکرد؟ گوتیان: داوای بەهەشتەکەت لێ دەکەن، دەفەرموێ: جا بەهەشتی منیان بینیوە؟ دەڵێن: نەخێر، ئەی پەروەردگار! دەفەرموێ: جا ئەوە چۆن دەبوو ئەگەر بەهەشتەکەیان بینیبوایە؟ دەڵێن: پەناشت پێدەگرن، خواش دەفەرموێ: لە چی پەنام پێ دەگرن؟ دەڵێن: لە ئاگرەکەت، ئەی پەروەردگار! خواش دەفەرموێ: ئایا ئاگرەکەی منیان بینیوە؟ دەڵێن: نەخێر، ئەی پەروەردگار! دەفەرموێ: جا دەبوو ئەگەر ئاگرەکەی منیان بینیبووایە؟ دەڵێن: ئەی خوایە داوای لێخۆشبوونیشت لێدەکەن، خواش دەفەرموێ: ئەوە منیش لێیان خۆشبووم‌و داوای چیشیان کردوە پێیان دەدەم‌و دەشیان پارێزم لەوەی پەنام پێدەدەن لێی، مەلائیکەتەکانیش دەڵێن: ئەی پەروەردگار! فلان کەسیان تێدایە زۆر گوناهبارەو هەر بەلایاندا تێپەڕ بووەو دانیشتووە لەگەڵیان، خوای بەبەزەیی دەفەرموێ: ئەوە لەویش خۆشبووم، ئەوانە کۆمەڵێکن دانیشتوو لەگەڵیان بەدبەخت نابێ. (یانی: کەسێك لەگەڵیان بێ لە گوناهی دەبووردرێ).

# پایەو پاداشتی زیکری

## هەڵسان لە کۆڕو مەجلیس

{عَن أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ جَلَسَ فِي مَجْلِسٍ، فَكَثُرَ فِيهِ لَغَطُهُ، فَقَالَ: قَبْلَ أَنْ يَقُومَ مِنْ مَجْلِسِهِ ذَلِكَ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ الاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ، الاَّ غُفِرَ لَهُ، مَا كَانَ فِي مَجْلِسِهِ ذَلِكَ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دانیشت لە کۆڕێك زۆر قسەی بێ مانای کرد (یان زۆری قسەی بێ مانای تێدا کرا) پێش ئەوەی لەو کۆڕە هەڵستی بڵێ: (سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ الاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ)، حەتمەن دەبوردرێ لە هەرچی لەو کۆڕە بووەو گوتراوە.**

{عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ قَالَ: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ، فَإِنْ قَالَهَا فِي مَجْلِسِ ذِكْرٍ كَانَتْ كَالطَّابِعِ (الختم) يُطْبَعُ عَلَيْهِ، وَمَنْ قَالَهَا فِي مَجْلِسِ لَغْوٍ كَانَتْ كَفَّارَةً لَهُ»} **حديث حسنٌ**[2]

**واتە: جوبەیری کوڕی موطعیم خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بڵێ: (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ) بێگومان هەر کەسێك ئەمە بڵێ: لە مەجلیس‌و کۆڕی زیکری ئەوە بۆی دەنووسرێ‌و مۆرێکی لەسەر دەردێ، وە هەر کەسێك ئەمە بڵێ: لە مەجلیس‌و کۆڕێك کە قسەی بێ سوودو خراپی تێدا گوترابێ، دەبێتە کەفارەت بۆ هەموو گوناهانەی کە لەو مەجلیسەدا کراوەو گوتراوە.**

---

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٣٤٣٣)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (١٥١٦))

٢) (رَوَاهُ الحَاكِمُ: (١٩٧٠)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٨١).

# پایه‌و پاداشتی گوتنی:
# لا إِلهَ إِلاَّ الله

خوای په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رموێ: ﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾﴾ إبراهيم، واته: خوا وێنه دێنێته‌وه به گوفتاری چاك‌و پاك، كه وه‌ك دره‌ختی چاك‌و به‌ردار وایه، ڕه‌گی به توندی داكوتاوه له زه‌ویدا، وه لق‌و پۆپه‌كانیشی بلاوبۆته‌وه به ئاسمان، (ئه‌و دره‌خته) هه‌موو كات‌و، وه‌ختێك به‌روبوومیی (پاك وچاك وبێگه‌رد) ده‌به‌خشێت به مۆڵه‌تی په‌روه‌ردگاری.

وه ده‌رباره‌ی ماناو لێكدانه‌وه‌ی ئه‌م ڕسته قورئانییه موباره‌كه، عه‌بدوڵڵای كوڕی عه‌بباس خوا له خۆی‌و بابی ڕازی بێ، ده‌ڵێ: (الكَلِمَةً طَيِّبَةً) واته: {لاَ إِلَهَ إلاَّ اللهُ}، واته: گوفتاریی چاك وپاك، بریتیه: له‌وه‌ی ئینسان بڵێ: هیچ په‌رستراوێك نیه به هه‌ق جگه له (الله)، پێویسته ئه‌وه‌ش بزانرێ، كه تاكه هۆكاری نێردرانی هه‌موو پێغه‌مبه‌ران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) بریتی بووه له ئیسپات كردنی ئه‌و وشه‌یه له دڵ‌و سینه‌ی ئینسانه‌كان، كه ئه‌سڵ‌و بناغه‌ی ئیمانی له‌سه‌ر داده‌مه‌زرێ، ئنجا زانایان ته‌وحیدیان كردوه به سێ به‌ش:

١)- خوا به‌یه‌كگرتن له په‌رستراوێتی (توحید الألوهیة).
٢)- خوا به‌یه‌كگرتن له په‌روه‌ردگارێتی (توحید الربوبیة).
٣)- خوا به‌یه‌كگرتن له ناوو سیفه‌ته‌كانی (توحید الأسماء والصفات).

وه بێگومان هه‌ر یه‌ك له‌و سێ وشه‌یه، قبووڵی چه‌ندان هه‌زار په‌ڕ ده‌كه‌ن له‌سه‌ریان بنووسرێ، به‌ڵام له‌به‌ر ئه‌وه‌ی بابه‌ته‌كه‌ی ئێمه په‌یوه‌ست نیه به عه‌قیده‌وه، بۆیه زۆر به كورتیی پێناسه‌یان ده‌كه‌ین‌و

دواییش مەرجی قبوولّ بوونی ئەم وشە موبارەکانە ڕوون دەکەینەوە، (بۆ ئەوەی کەس وا نەزانێ هەر کە گوتی: (لاَ إِلَهَ إلاَّ اللهُ)، ئیدی هەر لە دنیا حیساب وکیتابی قیامەتی کۆتایی دێ و ڕاستەوخۆ دەچێتە بەهەشتەوە! چونکە ڕواڵەتی فەمایشتەکان ئەوەیان لێ دەخوێنرێتەوە)، بەڵکو دەچینە سەر ئەسڵی مەبەست، کە ئەویش بریتیە لە: زانینی پاداشتی گوتنی: وشەی خوا بەیەکگرتن: (لاَ إِلَهَ إلاَّ اللهُ).

سەرەتا دەڵێین: ئەگەر ئێمە سەرنجی قورئان بدەین، زۆر بە ڕوونی دەبینین خوای پەروەردگار لە چەندین شوێن لە یەك سوورەتدا باسی هەر سێ جۆری خوا بەیەکگرتن (توحید)ی بۆ کردووین، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الفَاتِحَة)دا فەرموویەتی:

١- ﴿الْحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾: ئەوە خوا بەیەکگرتنە لە پەروەردگاریێتی، وە هەرچی وشەی: (رَبّ) هەیە لە قورئان مەبەست پێی خوا بەیەکگرتنە لە پەروەردگاریێتی، هەرچەندە هەندێ لە زانایان خوا بەیەکگرتن لە ناوو سیفەتەکان لەگەڵ خوا بەیەکگرتن لە پەروەردگاریەتیان بە یەك جۆر تەوحید داناوە، لەبەر ئەوەی ئینسان دوای ئەوەی ناسین (مَعْرِفَة) و زانستیان بە خوای پەوەردگار بۆ پەیدادەبێ، ئنجا دێ ئیسپاتی ئەوە دەکەن بۆ خوا واتە: (الْمَعْرِفَة وَالإِثْبَات) پەیوەستن بەیەکەوە.

٢- ﴿الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ﴾: ئەوەش خوا بەیەکگرتنە لە ناوو سیفەتەکانی خوای بێ وێنە، وە ئەگەر سەرنج بدرێ زۆربەی جار ئەم جۆرەی تەوحید لە کۆتایی ئایەتەکان دا بەدی دەکرێ وەك وشەکانی: (العَزِيزُ، الْحَكِيمُ، الْخَبِيرُ، العَلِمُ، الْمُهَيْمِنُ، القَادِرُ، الْخَالِقُ، الْحَيُّ،...).

٣- ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾: ئەوەش جۆری سێیەمە خوا بەیەکگرتن لە پەرستنی دا، کە بێگومان ئەوە خاڵی مەبەستە، لە ناردنی هەموو پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم)، تەنها خوا بپەرسترێ، هیچ شتی دیکەی لەگەڵ نەبن بە هاوبەش و نەپەرسترێن.

وە پێغەمبەر ﷺ (١٣) ساڵ لە مەککە بانگەوازی کرد، پێش ئەوەی کۆچ بکات بۆ مەدینە، بانگەوازەکەی تەنیا خۆی لە تەوحیدی ئولوهیەت دەبینیەوە، کە ئەمەش بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە تاکە هۆی نێررانی پێغەمبەران بریتی بووە لە چەسپاندنی وشەی: (لاَ إِلَـهَ إلاَّ الله)، وە بێگومان هەرچی پەیوەندی بە پەروەردەو هەڵسوکەوت و ڕەوشتە بەرزو پەسندەکان هەیە لە هەموو بوارەکانی تاکیی، خێزانی، کۆمەلایەتی، ئابووریی و سیاسی و ... هتد، هەر هەموو لە نێو ئەم جۆرەی تەوحید جێی بۆتەوە، کەواتە: ئێمە کە دەڵێین: تاکە هۆکاری نێردرانی پێغەمبەران بریتی بووە لە چەسپاندنی ئەم تەوحیدە لە دڵ و دەروونیی خەڵکی لەبەر ئەوەی گشت لایەن و بوارەکان دەگرێتە نێو خۆی.

هەروەها لە سوورەتی (الناس)یشدا دیسان خوای پەروەردگار دەربارەی جۆرەکانی خوا بەیەکگرتن فەموویەتی:

١- ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾: ئەوە خوا بەیەکگرتنە لە پەروەردگاریێتی دا، وەك پێشتر باسمان کرد، وە هەرچی وشەی (رَب) لە قورئان و سوننەتدا هەیە، مانای ڕبوبیەت دەگەیەنێ.

٢- ﴿مَلِكِ النَّاسِ﴾: ئەوە خوا بەیەکگرتنە لە ناوو سیفەتەکان، وەك دیارە وشەی پادشا (مالك)ی تێدایە، کە یەکێکە لە سیفەتەکانی خوای بێ وێنە.

٣- ﴿إِلَٰهِ النَّاسِ﴾: ئەوەشیان خوا بەیەکگرتنە لە پەروەردگاریّتی.

ئنجا دەربارەی ئولوهیەت، لە هەر شوێنێکی قورئانی بەپێزو سوننەتی پێغەمبەر وشەی: (الله)، یاخود (إلَه) هاتبیّ، ئەوە مەبەست پێی خوا بەیەکگرتنە لە پەرستراوێتی دا.

ئێستاش با بێین زۆر بە کورتیی‌و پوختی بە زمانی عەرەبی وەك لە کتێبی (الجامع الفريد)دا هاتوە: پێناسەی هەر سیّ جۆری تەوحید بکەین:

* **تَوْحِيد الرّبوبية:** {وَهُوَ العِلْمُ والإعتِقَاد بأنَّ الله هُوَ الْمُتفرّد بالْخَلْق وَالرّزق وَالتدبُّر، وَهَذَا النَّوع قَدْ أَقَرَّ بهِ الْمُشْرِكُون، وَلَمْ يدخلهُم فِي الإِسْلاَم وَالدَّلِيلُ قَولِهِ تَعَالَى: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٨٧﴾﴾الزخرف}، واتە: بریتیە لە زانین‌و بڕوا بوون بەوەی کە خوا بە تەنیا دروستکەرو ڕۆزی دەرو مشوورگێڕە، وە بێگومان ئەو جۆرەیان هاوبەش پەرستەکانیش دانیان پێدانابوو، بەلام (ئەو بڕوا بوونەیان) نەیبردنە نێو چوار چێوەی ئیسلام، بە بەلگەی ئەوەی خوا دەفەرموێ: سوێند بە خوا ئەگەر (لەو هاوبەش پەرستانە) بپرسی: کیّ دروستی کردوون؟ ئەوە بە دلنیاییەوە دەلێن: (الله)!!

* **تَوْحِيد الأَسْمَاء وَالصِّفَات:** {وَهُوَ أَنْ يُوصَف الله بِمَا بهِ نَفْسَهُ فِي كِتَابهِ، أَوْ وَصفه بهِ رَسُوله عَلَى اللائِق بِعَظمَتِهِ وَجَلاَلِهِ، وَهَذَا النّوع قَدْ أَقَرَّ بَعض الْمشركُون، وَأَنْكَره بَعْضهُم جَهْلاً أَوْ عِنَاداً}، واتە: بریتیە لە وەسف کردنی خوا بەو سیفەتانەی کە خۆی پیّ وەسف کردوە لە قورئان، یان ئەو وەسفانەی کە پێغەمبەر ﷺ خوای پیّ وەسف کردوە لە فەرمووە ڕاست و دروستەکانی دا، بەو شێوەیەی

که شایستەیه به گەورەو بەرزی خوا، وه ئەو جۆرەی تەوحید هەندێك له هاوبەش پەرستەکان دانیان پێدا ناوه، وه هەندێکیان ئینکاریان کردوه، جا به هۆی نەزانینیانەوه یان به هۆی وەرنەگرتنی هەق‌و عینادی کردنەوه.

* **توحيد الألوهية:** {وَهُوَ إِخْلَاص العِبَادَة لِلّٰهِ وَحْدَهُ لَاشَرِيكَ لَهُ بِجَمِيع أَنوَاع العِبَادَة، كالمحبّه وَالْخَوْف وَالرّجَاء، وَالتوكّل والدّعَاء وَغير ذَلِكَ مِنْ أَنْوَاع العِبَادَة}، واته: بریتیه له خۆ یەکلایی کردنەوەو دڵی خۆ ساغ کردنەوه له پەرستش بۆ خوا به تەنیا، که هیچ هاوەڵێکی نیه، له هەموو جۆرەکانی عیبادەت، وەك: خۆشویستن‌و ترسان‌و پاڕانەوەو پشت پێ بەستن‌و دووعاو جگه لەوانه له هەموو جۆرەکانی عیبادەت.

**ئێستاش با پێکەوه سەرنجی پاداشتی ئەم ڕسته به نرخ‌و بەهاداره بدەین:**

{عَنْ أَبِي ذَرٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُوْلَ اللهِ! أَوْصِنِي قَالَ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إذَا عَمِلْتَ سَيِّئَةً، فَأَتْبِعْهَا حَسَنَةً تَمْحُهَا، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُوْلَ اللهِ! أَمِنَ الْحَسَنَاتِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ؟ قَالَ: هِيَ أَفْضَلُ الْحَسَنَاتِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واته: ئەبوو زەڕی غیففاری خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئامۆژگارییم بکه، فەرمووی ﷺ: ئەگەر کارێکی خراپت کرد، دوای ئەو کاری چاکەت کرد خراپەکەت لێ دەسڕێتەوه، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئایا (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ) له کاره چاکەکان هەژمار دەکرێ؟ فەرمووی: ئەوه باشترینی (کاره) چاکەکانه.

---

١) (رَوَاهُ أَحْمَدُ: (٢١٥٢٥)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٣٧٣))

{عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْتُ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُوْلُ: «أَفْضَلُ الذِّكْرِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَفْضَلُ الدُّعَاءِ الْحَمْدُ للهِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**(١)

**واته: جابیری کوڕی عەبدوڵلا خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لێ بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: چاکترین زیکری خوا کردن گوتنی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)یە، وە چاکترین دووعاش (الْحَمْدُ للهِ)یە. (یانی: گەورەترین پاداشت لەو زیکرو دووعایە دایە).**

{عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُوْلُ: «مَنْ شَهِدَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُوْلُ اللهِ حَرَّمَ اللهُ عَلَيْهِ النَّارَ»} حديثٌ صَحِيحٌ(٢)

**واته: عوبادەی کوڕی صامیت خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لێ بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هەر کەسێك شایەدی بداو (بە دڵ قبووڵی بێ‌و بە زمان) بڵێ: هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە (الله)، وە موحەممەد پێغەمبەری خوایە، خوای بەبەزەیی ئاگری (دۆزەخ)ی لەسەر حەرام دەکات.**

{عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُوْلُ: «إِنِّي لأَعْلَمُ كَلِمَةً لا يَقُولُهَا عَبْدٌ حَقاً مِنْ قَلْبِهِ فَيَمُوتُ عَلَى ذَلِكَ، إِلاَّ حُرِّمَ عَلَى النَّارِ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(٣)

**واته: عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لێ بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: من وشەیەك دەزانم هیچ بەندەیەك نیە بەڕاستی و لە دڵەوە بیڵێ، وە بمرێ لەسەر ئەو حاڵەتە، حەتمەن ئاگری لەسەر حەرام دەبێت، (ئەویش): (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)یە.**

---

١) {رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٣٣٨٣)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٤٩٧)}

٢) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (١٥١))

٣) (رَوَاهُ إِبْنُ حِبَّانَ: (٢٠٤)، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ صَحِيح)

{عَنْ مُعَاذِ بْنِ جبَلٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهُ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ كَانَ آخرُ كَلاَمِهِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، دَخَلَ الْجَنَّةِ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**(١)

**واتە: موعاذی کوڕی جەبەل خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك کۆتا وشەی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ) بێ (لە دنیادا)، دەچێتە بەهەشتەوە.**

{عَنْ أبِي ذَرٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهُ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مَا مِنْ عَبْدٍ قَالَ: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، ثُمَّ مَاتَ عَلَى ذَلِكَ إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةِ»، قُلْتُ: وَإِنْ زَنَى، وَإِنْ سَرَقَ؟ قَالَ: «وَإِنْ زَنَى، وَإِنْ سَرَقَ»، قُلْتُ: وَإِنْ زَنَى، وَإِنْ سَرَقَ؟ قَالَ: «وَإِنْ زَنَى، وَإِنْ سَرَقَ»، قُلْتُ: وَإِنْ زَنَى، وَإِنْ سَرَقَ؟ قَالَ: «وَإِنْ زَنَى، وَإِنْ سَرَقَ عَلَى رَغْمِ أَنْفِ أَبِي ذَرٍّ»، وَكَانَ أَبُو ذَرٍّ إِذَا حَدَّثَ بِهَذَا قَالَ: وَإِنْ رَغِمَ أَنْفِ أَبِي ذَرٍّ} **حَدِيثٌ صَحِيح**(٢)

**واتە: ئەبوو زەڕی غیففاری خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هیچ بەندەیەك نیە، بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)، پاشان بمرێ لەسەر ئەو حاڵەتە ئیللا دەچێتە بەهەشت، گوتم: ئەگەر زینای کردبێ، ئەگەر دزیشی کردبێ؟ فەرمووی: وە ئەگەر زینای کردبێ، ئەگەر دزیشی کردبێ؟ گوتم: ئەگەر زینای کردبێ، وە ئەگەر دزیشی کردبێ؟ فەرمووی: وە ئەگەر زینای کردبێ، ئەگەر دزیشی کردبێ؟ گوتم: ئەگەر زینای کردبێ، ئەگەر دزیشی کردبێ؟ فەرمووی: ئەگەر زینای کردبێ، وە ئەگەر دزیشی کردبێ؟ وە ئەگەر لووتی ئەبوو زەڕ بە خۆڵ دا بچێ، وە ئەبوو زەڕ کاتێك ئەم حەدیسەی دەگێڕایەوە، هەر دەیگوت: وە ئەگەر لووتی ئەبوو زەڕیش بە قوڕ دا بچێ!!**

{عن أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّهُ قَالَ: قِيلَ يَا رَسُولَ اللهِ! «مَنْ أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ

---

١) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (٣١١٦)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٦٤٧٩))

٢) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ: (٥٤٨٩)، وَاللَّفْظُ لَهُ، وَمُسْلِمٌ: (٢٨٣)).

وَسَلَّمَ): لَقَدْ ظَنَنْتُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أَنْ لاَ يَسْأَلُنِي عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ أَحَدٌ أَوَّلُ مِنْكَ لِمَا رَأَيْتُ مِنْ حِرْصِكَ عَلَى الْحَدِيثِ أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ، مَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ خَالِصًا مِنْ قَلْبِهِ أَوْ نَفْسِهِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[١]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازیبێ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! بەختەوەرترین کەس بەشەفاعەت‌و تکای تۆ لە ڕۆژی قیامەتدا کێیە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەبوو هورەیرە خۆشم گومانم هەروابوو کە کەس لە پێش تۆدا ئەوەم لێ نەپرسێ، وە تۆ یەکەم کەس بی ئەو پرسیارەم لێبکەی، چونکە دەتبینم سووریت لەسەر ئەو فەرموودە، (جا دەفەرمویٚ:) بەختەوەرترین کەس بە تکاو شەفاعەتی من ئەو کەسەیە کە بە دڵێکی ساف‌و بێگەرد، یا خود بە سینەیەکی ساف بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ) واتە: هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە (اللە).**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَا قَالَ عَبْدٌ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ قَطُّ، مُخْلِصًا إِلاَّ فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ السَّمَاءِ، حَتَّى تُفْضِيَ إِلَى الْعَرْشِ مَا اجْتَنَبَ الْكَبَائِرَ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[٢]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ بەندەیەك نیە بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ) بە ئیخلاسی‌و بەدڵێکی ساف، ئەوە حەتمەن دەرگاکانی ئاسمانی بۆ دەکرێنەوەو تاکو ئەو قسەیە دەگاتە عەرش، مادام خۆی دوور گرتبێ لە گوناهە گەورەکان.**

{عَنْ عُبَادَةَ بَنِ الصَّامِتَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ شَهِدَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَأَنَّ عِيسَى

---

١) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٩٩)).

٢) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ:: (٣٥٩٠)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (المشكاة): (٢٣١٤))

عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُهُ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ وَالْجَنَّةُ حَقٌّ وَالنَّارُ حَقٌّ أَدْخَلَهُ اللهُ الْجَنَّةَ عَلَى مَا كَانَ مِنَ الْعَمَلِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك شایەتمانی بێنێ بەوە هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە خوا تاکەو هیچ هاوەڵی نین، وە موحەممەد ﷺ نێرراوی خوایە، وە عیسا ﷺ بەندەو نێرراوی خوایە، وە وشەو ڕووح (ێکی تایبەتە) خراوەتە مەریەمەوە، وە (شایەدی بدات) کە بەهەشت ڕاستەو دۆزەخ ڕاستە، ئەوە هەقێکە لەسەر خوا بیخاتە بەهەشتەوە جا ئەگەر هەر کارێکی کردبێ.

{عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحُمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيْر، أَوْ مَنَحَ مَنِيحَةً، أَوْ هَدَى زُقَاقاً، كَانَ كَمَنْ أَعْتَقَ رَقَبَة»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بڵێ: هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە خوا تەنیایەو هیچ هاوەڵی نیە، موڵك هەر بۆ ئەوەو سوپاسو ستایش هەر بۆ ئەوە، دەژیێنیو دەمرێنی، خێرو چاکە بەدەستی ئەوە، وە بەسەر هەموو شتێك بە توانایە، یان حوشترێك ببەخشێت (بۆ ئەوەی خەڵك سوودی لێ ببینن لە شیرەکەی بخۆنەوە، بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، دوایی

١) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٣٢٥٢))
٢) (رَوَاهُ أَحْمَدُ: (١٨٥٥٤)، وَقَالَ: شعيب الأرنؤوط: صَحِيح، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني)

بۆی بگەڕێننەوە، یان ڕێی ڕاست بە کەسێکی ونبوو، یان کوێرێک پێشان بدات (لە پاداشت) وەک ئەو کەسەیە کە کۆیلەیەکی ئازاد کردبێت.

{عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): قَالَ: «مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، عَشْرَ مِرَارٍ، كَانَ كَمَنْ أَعْتَقَ أَرْبَعَةَ أَنْفُسٍ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: ئەبوو ئەییوبی ئەنصاریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دە جاران بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)، (لە پاداشت) وەك ئەو كەسەیە كە چوار كەسی لە نەوەی ئیسماعیل (علیه السلام) ئازاد كردبێت.

{عَنْ عُمَارَةَ بْنِ شَبِيبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَيُمِيتُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِير، عَشْرَ مَرَّاتٍ عَلَى إِثْرِ الْمَغْرِبِ، بَعَثَ اللهُ لَهُ مَسْلَحةً يَحْفَظُونَهُ مِنَ الشَّيْطَانِ حَتَّى يُصْبِحَ، وَكَتَبَ اللهُ لَهُ بِهَا عَشْرَ حَسَنَاتٍ مُوجِبَاتٍ، وَمَحَى عَنْهُ عَشْرَ سَيِّئَاتٍ مُوبِقَاتٍ، وَكَانَتْ لَهُ بِعَدْلِ عَشْرِ رِقَابٍ مُؤْمِنَاتٍ»} **حديث حسنٌ**[2]

واتە: عومارەی كوڕی شەبیب خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك لە دوای نوێژی مەغریب، دە جاران بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَيُمِيتُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِير) خوای پەروەردگار چەند پارێزەرێكی بۆ دەنێرێ دەیپارێزن لە شەیتان تاكو بەیانی، وە خوا دە چاكەی (پێ

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٧٠٢٠))

٢) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٣٥٣٤)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني فـي (صحيح الترغيب والترهيب) (٤٧٣))

چوونە) بەهەشتی بۆ دەنووسیّو، دە گوناهی لە ناوبەری لیّ دەسڕڕیّتەوە، وە پاداشتی بە ئەندازەی ئازاد کردنی دە کۆیلەی ئیمان داری بۆ هەیە.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): قَالَ: «مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ، كَانَتْ لَهُ عَدْلُ عَشْرُ رِقَابٍ، وَكُتِبَتْ لَهُ مِائَةُ حسنهٍ، وَمُحِيَتْ عَنْهُ مِائَةُ سَيِّئَةٍ، وَكَانَتْ لَهُ حِرْزاً مِنَ الشَّيْطَانِ يَوْمَهُ ذَلِكَ حَتَّى يُمْسِي، وَلَمْ يَأْتِي أَحَدٌ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ، إِلاَّ رَجُلٌ عَمِلَ أَكْثَرَ مِنهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**(١)

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك لە ڕۆژێك دا سەد جار بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) ئەوە بە ئەندازەی ئازاد کردنی کۆیلەیەك چاکەی دەست دەکەوێ، وە سەد چاکەی بۆ دەنووسرێ، وە سەد گوناهی لێ دەسڕڕیّتەوە، وە لە شەیتانیش دەپارێزرێ ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە دادێ، وە کەس بە پاداشتی لەو چاکتر نایێ مەگەر کەسێك لەو زیاتر (ئەو زیکرە) بکات.

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحُمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، مِائَتَي مَرَّةٍ فِي يَوْمٍ، لَمْ يَسْبِقْهُ أَحَدٌ كَانَ قَبْلَهُ، وَلاَ يُدْرِكْهُ أَحَدٌ بَعْدَهُ، إِلاَّ بِأَفْضَلَ مِنْ عَمَلِهِ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**(٢)

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك لە ڕۆژێك دا سەد جار بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ)، هیچ کەسێك بە پێشی ناکەوێ کە

---

١) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ: (٣١١٩)، وَاللَّفْظُ لَهُ، وَمُسْلِمٌ: (٧٠١٨))

٢) (رَوَاهُ أَحْمَدُ: (٦٧٤٠)، وَصَحَّحَهُ شعيب الأرنؤوط، وَقَالَ أَحْمَد شاكر: إسنادُهُ صَحِيح)

لە پێشی بووە، وە هیچ کەسێك پێی ناگات (لە پاداشت)، مەگەر کەسێك کە بە کردەوەیەکی باشتر لەو هاتبێ یان لەو زیاتری گوتبێ.

{عَنْ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ فَيُبْلِغُ أَوْ فَيُسْبِغُ الْوضُوءَ ثُمَّ يَقُولُ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُه، إِلاَّ فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَة، يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ»}[١]

واتە: عومەر خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێك نیە لە ئێوە بە جوانیی‌و باشی دەستنوێژ بگرێ‌و، پاشان بڵێ: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُه) ئەوە هەر هەشت دەرگای بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە لە کامەیان بیەوێ دەڕواتە ژوورەوە.

## مەرجەکانی وەرگیران‌و قبوول بوونی:

## (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)

هەروەك پێشتر باسمان کرد، هەر کەسێك گوتی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ) مانای وانیە حیسابی لە دنیاو قیامەت تەواو بووەو شایان‌و شایستەی چوونە بە هەشت بووە! هەروەك هەندێ لە خەڵکی وای لێ حاڵی بوون! بۆ ئەوەی دڵنیابین هەر بەوەندە بەهەشت مسۆگەر ناکەین با گوێ لەو بەسەرهاتە بگرین کە ئیمامی بوخاری بۆمان دەگێڕێتەوە لە کتێبە ڕاست‌و دروستەی خۆی:

{قَالَ الإِمَام البُخَارِيُّ: [بَاب مَا جَاءَ فِي الْجَنَائِزِ وَمَنْ كَانَ آخِرُ كَلامِهِ: لا إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ] وَقِيلَ لِوَهْبِ بْنِ مُنَبِّهٍ: أَلَيْسَ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ مِفْتَاحُ الْجَنَّةِ؟ قَالَ: بَلَى، وَلَكِنْ لَيْسَ مِفْتَاحٌ إِلاَّ لَهُ أَسْنَانٌ، فَإِنْ جِئْتَ بِمِفْتَاحٍ لَهُ أَسْنَانٌ فُتِحَ لَكَ، وَإِلاَّ لَمْ يُفْتَحْ لَكَ}، واتە: ئیمامی بوخاریی دەربارەی ئەوە کە هەر کەسێك کە کۆتا وشەی (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ) بێ پێش مردن

---

[١] (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٥٧٦))

دەچێتە بەهەشت، دەڵێ: بە (وَهْبِ بْنِ مُنَبِّهٍ) گوترا: ئایا (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ) کلیلی بەهەشت نیە؟ گوتی: با، بەڵام هیچ کلیلێك نیە ددانی نەبێ، جا ئەگەر هاتیو کلیلێکت پێ بوو ددانی هەبوو ئەوە بۆت دەکرێتەوە، ئەگەر نا بۆت ناکرێتەوە.

## ئنجا با بزانین ددانەکانی ئەم کلیلە چین؟

١)- زانست: هەموو وشەیەك واتای هەیە، کەوابوو دەبێ واتای (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ) بزانیت بەبێ ئەوەی لە واتاکەیدا نەزانیت هەبێ، ئەو وشەیە خوایەتی دەدا بە خواو نەفی دەکات لە غەیری ئەو، واتە: هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە بپەرسترێت جگە لە (الله)، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلۡحَقِّ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ٨٦﴾ الزخرف، واتە: مەگەر کەسانێك شایەدی دەدەن بە هەقو زانیاریشیان هەیە (بە ماناو مەبەستو پێویستیەکانی) هەروەها پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: {مَنْ مَاتَ وَهُوَ يَعْلَمُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: هەر کەسێك مردو زانی هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە (الله) دەچێتە بەهەشت.

٢)- یەقین: (چەسپاوی و دامەزراوی): یەقینی تەواوت هەبێ ئەم وشەیە چی دەگەیەنێ، بێ هیچ گومانو دوو دڵییەك، خوای گەورەش وەسفی ئیمانداران دەکاتو دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ١٥﴾ الحجرات

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (١٤٥) عَنْ عُثْمَانَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)

واتە: ئیمانداران ئەوانەن کە ئیمانیان بە خواو پێغەمبەر هێنا بەبێ دوو دڵیو بە ماڵو نەفسی خۆیان جیهادیان لە پێناو خودا کرد، ئەوانە بەڕاستی ڕاستگۆن، چونکە گوزارشتی زمان بەس نیە، بەڵکو دەبێ یەقینی دڵی لەگەڵ دابێ، ئەگەر وا نەبوو ئەوە نیفاقە، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: {أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللهِ لاَ يَلْقَى اللهَ بِهِمَا عَبْدٌ غَيْرَ شَاكٍّ فِيهِمَا إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: شایەدی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە (الله)و من پێغەمبەری خودام، هەر کەسەو بەو حاڵەوە بچێتەوە خزمەت خواو گومانیشی نەبێ دەچێتە بەهەشتەوە.

٣)- __قبووڵ کردن__: دوای زانستو یەقین دەبێ ئەو زانستە یەقینیە شوێنەواری خۆی هەبێ بەوەی کە هەر شتێك ئەو وشە دەیخوازێ قەبوڵ بکرێ بە زمانو دڵ، کەوابوو هەر کەس بانگەوازی یەکخواپەرستیی ڕەت کردەوە لەبەر هەر هۆکارێکی وەك: خۆبەزلزانینو ئینکاریو حەسوودی بێبڕوا دەبێ، خوای گەورەش باسی ئەو بێبڕوایانە دەکات، کە بانگەوازیان ڕەت کردۆتەوە، بە هۆی خۆ بەزلزانینەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُمْ كَانُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ٣٥﴾ الصافات، واتە: بێگومان هەرکات پێیان بگوترایە هیچ پەرستراوێکی بە هەق نیە جگە لە (الله)، لە خۆ بە گەورەزانیندا قەبوڵیان نەدەکرد.

٤)- __پابەند بوون__: پابەند بوون بە یەك خواپەرستیەوە سەنگی مەحەکەو سەلماندنی ئیمانە بە عەمەلی، ئەمەش بە شوێنکەوتنی حەڵاڵو

---

[1] (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (١٤٧)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)

وازهێنان لە حەڕام، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٢٢﴾ ﴾ لقمان، واتە: هەر كەس ڕووی تەسلیمی خوا بكات بە نیەتی پاك و چاكەكاریش بێ، ئەوە دەستی گرتوە بەو پەیمانە مەحكەمەی كە ناشكێت، هەموو شتێكیش بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە، ئەمەش پابەندبوونی تەواوە.

٥)- **ڕاستگۆیی:** ڕاستگۆ بێ لە گوتن و كردەوەی دا بە شێوەیەك گومانی تێدا نەبێ، چونكە هەر بە زمان بڕواهێنان و بە دڵ بڕوانەهێنان نیفاقە، خوای گەورەش دەفەرموێ: ﴿ يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِى قُلُوبِهِمْ ﴿١١﴾ ﴾ الفتح، واتە: (مونافیقەكان) بە زمان شتێك دەڵێن، (دەڵێن: بڕوادارین، كەچی ئەم بڕوایە) لە دڵیاندا نیە.

٦)- **خۆشویستن:** مسوڵمان ئەو وشە (لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ)ی خۆش دەوێ، پێی خۆشە كار بە واتاكەی بكات و ئەوانەی كاری پێدەكەن خۆشی دەوێن، نیشانەی خۆشویستنی بەندە بۆ خودا خۆشویستنی ئەو شتانەیە كە خودا خۆشی دەوێ ئەگەر لەگەڵ ئارەزووی خۆشیدا نەگونجێ، هەروەها پشتیوانی و لایەنگری كەسانێك دەكات كە پشتیوان و لایەنگری خواو پێغەمبەریان كردوە، وە دژایەتی ئەو كەسانەش دەكات كە دوژمنی خودان، وە شوێن پێغەمبەرەكەی دەكەوێ و شوێن پێشی هەڵدەگرێ و هیدایەتەكەشی وەردەگرێ.

٧)- **نیەت پاكی:** بەوەی كە نیازو مەبەستی لەم وشەیە تەنیا ڕەزامەندی خودا بێ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ

﴿البينة ٥﴾، واتە: فەرمانی ئەوەیان پێكراوەكە عیبادەتی خوا بكەن، بە نیەت پاكی‌و (یان واتە: فەرمانیان پێنەكراوە تەنیا بە عیبادەت كردنی خوا بە دڵسۆزیی‌و نیەت پاكی نەبێ)، وە پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: {إِنَّ اللهَ قَدْ حَرَّمَ عَلَى النَّارِ مَنْ قَالَ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ، يَبْتَغِي بِذَلِكَ وَجْهَ اللهِ} حَدِيثٌ صَحِيحٌ[1]

واتە: خوای گەورە كەسێكی حەڕام كردوە لە ئاگر (بیسوتێنێ) كە گوتوویەتی: (لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ).

## بەسەرهاتێك لەم بارەیەوە[2]

- عەبدوڵڵای كوڕی عەمری كوڕی عاص، خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە ڕۆژی قیامەتێ خوا (عَزَّوَجَلَّ) بانگی یەكێك لە بەندەكانی دەكات لە نێو هەموو دروستكراوەكانی، ئەو بەندەیە نەوەدو نۆ لیستی هەیە هەر یەكەی چەندی چاو ببینێ درێژن، (واتە: لیستی كردەوە خراپەكانی) ئنجا پێی پێشان دەدرێ‌و پێی دەفەرموێ: ئایا هیچ شتێكی تێدایە نكوولیی لێ بكەی؟ ئایا مەلائیكەتەكانی من هیچ ستەمێكیان لێكردووی؟ بەندەكەش دەڵێ: نەخێر، ئەی پەروەردگار! خواش پێی دەفەرموێ: ئایا هیچ پاساوت هەیە بۆ ئەنجامدانی ئەو گوناهانەت؟ یان هیچ چاكەیەكت هەیە ئەنجامت دابێ؟ كابرا بێ دەنگ دەبێ‌و توانای قسە كردنی نامێنێ، دوایی دەڵێ: نەخێر، ئەی پەروەردگارم! هیچ پاساوم نیەو هیچ چاكەیەكیشم نیە،

---

١) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٤١٥)، وَمُسْلِمٌ: (١٥٢٨)، عَنْ عِتْبَانَ بْنَ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)

٢) (رَوَاهُ أَحْمَد: (٦٩٩٤)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (١٣٥).

خواش ده‌فه‌رموێ: با، تۆ له لای ئێمه چاکه‌یه‌کت هه‌یه، ئه‌مڕۆ تۆ هیچ سته‌مێکت لێ ناکرێ، پلیت (بطاقة)یه‌کی بۆ ده‌ردێنن، تێیدا نووسراوه: (أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ) خوا ده‌فه‌رموێ: ئه‌م چاکه‌یه‌ی ئاماده بکه‌ن، کابراش ده‌ڵێ: ئه‌ی په‌روه‌ردگارم! جا ئه‌م بلیته چییه له‌گه‌ڵ ئه‌و هه‌مووه لیسته پڕ گوناهانه‌م؟! پێی ده‌گوترێ: تۆ ئه‌مڕۆ سته‌مت لێ ناکرێ، ئنجا بۆی ده‌پێورێ، هه‌ر نه‌وه‌دو نۆ لیستی بۆ له لایه‌کی ته‌رازوو داده‌نێن‌و، پلیته‌که‌شی بۆ له‌لایه‌ك داده‌نێن، که‌چی لای پلیته‌که زۆر قورستر ده‌بێ. (به‌و هۆیه‌وه خوای به‌به‌زه‌یی ده‌یخاته به‌هه‌شته‌وه).

## پایه‌و پاداشت له‌سه‌ر
## ناوو سیفه‌ته‌کانی خوای پاك‌و تاك

بێگومان ناسین‌و لێ تێگه‌یشتن‌و ته‌فاعول له‌گه‌ڵدا کردنی ناوو سیفه‌ته به‌رزو بێ وێنه‌کانی خوای بێ وێنه، هۆکاری پاکبوونه‌وه‌ی ئینسانی مسوڵمان‌و به‌رز بوونه‌وه‌ین بۆ لای خوای به‌رزو بێ هاوتا.

به‌ڵێ خوێنه‌ری به‌ڕێز..

باس کردن‌و تێوه ڕامانی ناوو سیفه‌ته به‌رزو په‌سنده‌کانی خوا، چ له کاتی زیکرو پاڕانه‌وه‌داو، چ له حاڵه‌تی ئاساییدا، گه‌وره‌ترین ده‌وری هه‌یه، له ساف بوونه‌وه‌ی دڵ‌و ده‌روونی ئینسان داو، جوان بوونی خوو ڕه‌وشتی داو، له خوا نیزیك که‌وتنه‌وه‌ی دا، وه به ده‌ستهێنانی پایه‌و پاداشتێکی زۆرو بێ حیساب، ئنجا خوای به‌رزو مه‌زن له‌م باره‌یه‌وه فه‌رموویه‌تی:

﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ﴿١٨٠﴾﴾ الأعراف.

پێغەمبەری خۆشەویستیشمان دەربارەی ناووسیفەتەکانی خوای بەرزﷺ فەرموویەتی: {إِنَّ للهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ إِسْماً مِائَةً إِلاَّ وَاحِداً، مَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ، إِنَّهُ وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: بێگومان خوای بەرز نەوەدو نۆ (٩٩) ناوی هەن، سەد جگە لە یەکێك، هەر کەسێك بیانزمێرێ دەچێتە بەهەشتێ، بێگومان ئەو تاکەو تاکی خۆش دەوێ.

ئنجا پێغەمبەرمان ﷺ لە فەرموودەیەکی دیکەدا کە (ترمذي وابن حبان وابن خزيمه وحاكم وبيهقى وابن ماجه) گێڕاویانەتەوە ئەو (٩٩) ناوەی باس کردوە کە ئێمە لێرەدا دەیاننوسینو بە کوردیش مەعنایان لێك دەدەینەوە:

﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾ ﴿٢٢﴾ الحشر.

| | |
|---|---|
| ١. الرَّحْمَنُ | بەبەزەیی |
| ٢. الرَّحِيمُ | بەخشندە |
| ٣. الْمَلِكُ | سەرۆك، پاشا |
| ٤. الْقُدُّوسُ | پاك |
| ٥. السَّلامُ | بێ عەیب، بێ پەڵە |
| ٦. الْمُؤْمِنُ | دڵنیاکەر، بەڕاستدانەر |
| ٧. الْمُهَيْمِنُ | بەسەرڕاگەیشتوو |
| ٨. الْعَزِيزُ | زاڵ، دەستەڵاتدار |
| ٩. الْجَبَّارُ | باڵادەست، ناچار کەر |

---

١) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٢٥٨٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٩٨٦)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، ئەم بابەتە دەقو دەق لە کتێبی (ڕێگای صالح بوونو بەرەو خوا چوونی) مامۆستا علی باپیر، وەرگیراوە.

| | |
|---|---|
| ١٠. الْمُتَكَبِّرُ | خۆ بەگەورە زان |
| ١١. الْخَالِقُ | دروست کەر، بنیاد نەر |
| ١٢. الْبَارِيءُ | بەدیهێنەر |
| ١٣. الْمُصَوِّرُ | وێنە کێش |
| ١٤. الْغَفَّارُ | لێبووردە |
| ١٥. الْقَهَّارُ | گەردن کەچکەر |
| ١٦. الْوَهَّابُ | بەخشەر |
| ١٧. الرَّزَّاقُ | ڕۆزی دەر |
| ١٨. الْفَتَّاحُ | دەروو کەرەوە |
| ١٩. الْعَلِيمُ | زانا |
| ٢٠. الْقَابِضُ | لێ گرەوە، وێك هێنەر |
| ٢١. الْبَاسِطُ | لەدوودەر، فراوانکەر |
| ٢٢. الْخَافِضُ | دانەوێن، نەوی کەر |
| ٢٣. الرَّافِعُ | بڵند کەر |
| ٢٤. الْمُعِزُّ | زاڵکەر، عیززەت بەخش |
| ٢٥. الْمُذِلُّ | زەبوونکەر، مل پێ کەچکەر |
| ٢٦. السَّمِيعُ | بیسەر |
| ٢٧. الْبَصِيرُ | بینەر |
| ٢٨. الْحَكَمُ | فەرمانڕەوا، حوکمڕان |
| ٢٩. الْعَدْلُ | دادگەر |
| ٣٠. اللَّطِيفُ | چاکە کاری پەنهان، وردبین |
| ٣١. الْخَبِيرُ | شارەزا، هەواڵ دەر |
| ٣٢. الْحَلِيمُ | هێدی، ئارام |
| ٣٣. الْعَظِيمُ | مەزن |

٣٤. الْغَفُورُ
لێ بوردە، گوناح پۆش
٣٥. الشَّكُورُ
ستایشکەر، سوپاس گوزار
٣٦. الْعَلِيُّ
بەرز
٣٧. الْكَبِيرُ
گەورە
٣٨. الْحَفِيظُ
پارێزەر
٣٩. الْمُقِيتُ
بژێو گەیێن، دەستەڵاتدار
٤٠. الْحَسِيبُ
لێپرسەرەوە
٤١. الْجَلِيلُ
سیفەت بەرز، پایە بەرز
٤٢. الْكَرِيمُ
بەڕێز، ڕێزگر
٤٣. الرَّقِيبُ
چاودێر
٤٤. الْمُجِيبُ
وەڵامگۆ
٤٥. الْوَاسِعُ
فراوان
٤٦. الْحَكِيمُ
کاربەجێ، لێزان
٤٧. الْوَدُودُ
بەندە دۆست، خۆشویستراو
٤٨. الْمَجِيدُ
پایە بەرز، خاوەن شکۆ
٤٩. الْبَاعِثُ
زیندوکەرەوە، نێرەر
٥٠. الشَّهِيدُ
ئاگادار، ئامادە
٥١. الْحَقُّ
پایەدار، ڕاست، حەق
٥٢. الْوَكِيلُ
کارپێ سپێرراو، پشت و پەنا
٥٣. الْقَوِيُّ
بەتوانا
٥٤. الْمَتِينُ
بەهێز، قایم
٥٥. الْوَلِيُّ
دۆست، یاریدەدەر
٥٦. الْحَمِيدُ
سوپاس کراو، شایستەی سوپاس
٥٧. الْمُحْصِي
ژمێرەر

٥٨. الْمُبْدِئُ پەیداکەر

٥٩. الْمُعِيدُ گێڕەرەوە، زیندو کەرەوە

٦٠. الْمُحْيِي ژیێنەر

٦١. الْمُمِيتُ مرێنەر

٦٢. الْحَيُّ زیندوو

٦٣. الْقَيُّومُ مشورگێڕ، ڕاوەستاو

٦٤. الْوَاجِدُ هەبوو

٦٥. الْمَاجِدُ خاوەن پایەی بەرز

٦٦. الْوَاحِدُ یەك

٦٧. الأَحَد تاك، تەنیا

٦٨. الصَّمَدُ بێ نیازو جێی نیاز

٦٩. القَادِر توانادار

٧٠. الْمُقْتَدِر خاوەن سەرچاوەی توانا

٧١. الْمُقَدِّمُ پێشخەر

٧٢. الْمُؤَخِّرُ دواخەر

٧٣. الأَوَّلُ یەکەمین

٧٤. الآخِرُ دوامین

٧٥. الظَّاهِرُ دیار، ئاشکرا

٧٦. الْبَاطِنُ ون، پەنهان

٧٧. الْوَالِي سەرپەرشتی کەر

٧٨. الْمُتَعَالِي زۆربەرز، خۆبەرزگر

٧٩. الْبَرُّ چاکەکار

٨٠. التَّوَّابُ
تۆبە وەرگر

٨١. الْمُنْتَقِمُ
تۆڵە ستێن

٨٢. الْعَفُوُّ
چاوپۆشی كەر

٨٣. الرَّءُوفُ
میهرەبان

٨٤. مَالِكُ الْمُلْك
خاوەن موڵك

٨٥. ذُو الْجَلالِ وَالإِكْرَامِ خاوەن پایەی بەرزو ڕێز

٨٦. الْمُقْسِطُ
دادپەروەر

٨٧. الْجَامِعُ
كۆكەرەوە

٨٨. الْغَنِيُّ
دەوڵەمەند

٨٩. الْمُغْنِي
دەوڵەمەندكەر، بێ نیاز كەر

٩٠. الْمَانِعُ
بەرگر، پێشگیری كەر

٩١. الضَّارُّ
زیان گەیێن بە دوژمن و ناحەزانی

٩٢. النَّافِعُ
سوودگەیێن بە دۆست‌و خۆشەویستەكانی

٩٣. النُّورُ
ڕووناكی

٩٤. الْهَادِي
ڕێ پیشاندەر

٩٥. الْبَدِيعُ
داهێنەر، بێ وێنە

٩٦. الباقِيّ
هەرماو

٩٧. الوَارِثُ
میراتگر

٩٨. الرَّشِيدُ
كارزان، شارەزا كەر

٩٩. الصَّبور
ئارامگر.

## چەند ئاگاداری یەك دەربارەی ناوو سیفەتەکانی خوا (تبارك و تعالى):

١- وەك لەو فەرموودانە کە ڕابردن دەردەکەوێ وشەی بەرزو پیرۆزی (الله) لە ڕیزی نەوەدو نۆ (٩٩) ناوەکان نەژمێرراوە، دەنا دەبوونە سەد (١٠٠)، جا بێگومان هەر واشە، چونکە فەرموودەکە ئاوایە: (إنَّ للهِ..) کەواتە: ئەو نەوەدو نۆیە هەموویان سیفەتی (الله)نو، ئەویان پێ وەسف کراوە.

٢- مەبەست لە ڕستەی: {فمَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ}، لەسەر ڕای زۆربەی زانایان لەبەر کردنو تێگەیشتنو بیر لێکردنەوەی هەموو ئەو ناوو سیفەتە چاكو پەسندانەو، کار پێکردنو لەخۆداهێنانەدی مەعناو نێوەرۆکی هەندێکیانە کە بۆ ئینسان دەشێنو دەگونجێن.

٣- کاریگەری ئەو ناوو سیفەتە بەرزو چاکانە لە چاککردنی ئینسانو لە خوا نزیك خستنەوەیدا لەو ڕووەوەیە کە خوای بێ وێنە پێی خۆشە بە ناوو سیفەتە هەرە چاکەکانی مەدحو ستایشی بکەین، وە هەتا زیاتر ئەو ناوو سیفەتانەی خوای بێ هاوەڵ لە دڵو مێشکی مرۆڤدا جێگیربنو پتر بیریان لێ بکاتەوە، زیاتر کار دەکەنە سەر دڵو دەروونیو خونچەی خەسڵەتو ئاکارە بەرزو جوانەکانی زیاتر تێدا دەپشکوون.

خوا لەو کەسانەمان بگێڕێ کە لە کاتی هاتنەوە یادی سیفەتەکانی خوا هەوڵدەدەن لە قەدەر خۆیان ئەو سیفەتانە لە خۆیاندا بەرجەستە بکەن.

# پـایەو پـاداشتی
# زیکری چوون بۆ بازار

{عَنْ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللهِ فَحَدَّثَنِي عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ دَخَلَ السُّوقَ فَقَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ حَيٌّ لاَ يَمُوتُ بِيَدِهِ الْخَيْرُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ كَتَبَ اللهُ لَهُ أَلْفَ أَلْفِ حَسَنَةٍ، وَمَحَا عَنْهُ أَلْفَ أَلْفِ سَيِّئَةٍ، وَرَفَعَ لَهُ أَلْفَ أَلْفِ دَرَجَةٍ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[1]

**واتە: سالمی کوڕی عەبدوڵلا لە باپیری دەگێڕێتەوە (واتە: عومەری کوڕی خەتتاب) کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك چووە بازاڕو گوتی: هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە (الله)، تاکی بێ هاوڵە، بۆ ئەوەو هی ئەوە موڵك (هەمووی)، وە سوپاس‌و ستایش بۆ ئەوە، دەژێنی‌و دەمرێنی، وە ئەو (خوا) زیندووەو نامرێ، چاکە هەر بەدەست ئەوەو بەسەر هەموو شتێك بە توانایە، ئەوە خوا هەزار هەزار چاکەی بۆ دەنووسێ، وە هەزار هەزار گوناهی لێ دەسڕێتەوە، وە هەزار هەزار پلەش بەرز دەبێتەوە (بۆ لای خوا).**

# پایەو پاداشتی گوتنی:
# لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ

{عَنْ سَعْدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «دَعْوَةُ ذِي النُّونِ إِذْ دَعَا وَهُوَ فِي بَطْنِ الْحُوتِ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ، فَإِنَّهُ لَمْ يَدْعُ بِهَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ فِي شَيْءٍ قَطُّ إِلاَّ اسْتَجَابَ اللهُ لَهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

---

[1] (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٣٤٢٨)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٣١٣٩))

[2] (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٣٥٠٥)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (المشكاة): (٢٢٩٢))

واتە: سەعد خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دووعای ذین نون (واتە: پێغەمبەر یونس عیله السلام)، کاتێك لە نێو زگی حووت بوو، (ئەمە بوو): (لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ) واتە: هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە تۆ (ئەی خودایە!) پاکیی‌و بێگەردی بۆ تۆ وە من لە ستەمکاران بووم، وە بێگومان هیچ ئینسانێکی مسوڵمان نیە کە دووعای پێ بکات بۆ هەر شتێك، مەگەر خوای پەروەردگار وەڵامی دەداتەوە.

## پایەو پاداشتی گوتنی:

## سُبْحَانَ اللهِ الْعَظِيْمِ وَبِحَمْدِهِ

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ قَالَ حِيْنَ يُصْبِحُ: سُبْحَانَ اللهِ الْعَظِيمِ وَبِحَمْدِهِ مِائَةَ مَرَّةٍ، وَإِذَا أَمْسِي كَذَلِكَ، لَمْ يُوافِ أَحَدٌ مِنَ الْخَلَائِقِ بِمِثْلِ مَا وَافَى»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[١]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك کاتێ بەیانی دەکاتەوەو سەد (١٠٠) جار بڵێ: (سُبْحَانَ اللهِ الْعَظِيمِ وَبِحَمْدِهِ) واتە: پاکیی‌و بێگەردیی بۆ خواو ستایش بۆ وی، وە هەروەها کاتێك ئێوارەش دەکاتەوە (وای گوتەوە): ئەوە هیچ کەسێك لە دروستکراوەکان پاداشتی بەو وێنەی ئەو پێ نادرێ!

{عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ قَالَ: سُبْحَانَ اللهِ الْعَظِيمِ وَبِحَمْدِهِ، غُرِسَتْ لَهُ نَخْلَةٌ فِي الْجَنَّةِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[٢]

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بڵێ: (سُبْحَانَ اللهِ الْعَظِيمِ وَبِحَمْدِهِ)، واتە: پاکیی‌و بێگەردیی بۆ خوای گەورەو ستایش بۆ وی، ئەوە دار خورمایەکی لە بەهەشت بۆ دەڕوێنرێت.

---

١) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (٥٠٩١)، وَصَحَّحَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (صحيح سُنَن أبي داود))
٢)(رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٣٤٦٤)، وَصَحَّحَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٦٤))

# پایەو پاداشتی گوتنی:

## سُبْحَانَ اللهُ وَبِحَمْدِهِ

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ وَحِينَ يُمْسِي: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ، مِائَةَ مَرَّةٍ، لَمْ يَأْتِ أَحَدٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ، إِلاَّ أَحَدٌ قَالَ مِثْلَ مَا قَالَ، أَوْ زَادَ عَلَيْهِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك کاتێ بەیانی دەکاتەوەو کاتێك ئێوارە دەکاتەوە سەد (١٠٠) جار بڵێ: (سُبْحَانَ اللهِ الْعَظِيمِ وَبِحَمْدِهِ) واتە: پاکیی بێگەردی بۆ خواو ستایش بۆ وی، ئەوە لە ڕۆژی دوایی دا هیچ کەس کردەوەیەکی لە هی ئەو چاکتر ناهێنی، مەگەر کەسێك وەك وی گوتبێ یان زیاتری لەو گوتبێ.**

{عَنْ أَبِي ذَرٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَلاَ أُخْبِرُكَ بِأَحَبِّ الْكَلاَمِ إِلَى اللهِ»؟ قُلْتُ: يَا رَسُوْلَ اللهِ! أَخْبِرْنِي بِأَحَبِّ الْكَلاَمِ إِلَى اللهِ، فَقَالَ: «إِنَّ أَحَبَّ الْكَلاَمِ إِلَى اللهِ، سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

**واتە: ئەبوو زەڕی غیففاری خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ئایا هەواڵت پێنەدەم بە خۆشەویسترینی وشەکان لە لای خوا ؟ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا هەواڵم پێبدە، بە خۆشەویسترینی وشەکان لە لای خوا، فەرمووی: بێگومان خۆشەویسترینی وشەکان لە لای خوا، بریتین لە: (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ).**

{عَنْ أَبِي أُمَامَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ هَالَهُ اللَّيلُ أَنْ يُكَابِدَهُ، أَوْ بَخِلَ بِالْمَالِ أَنْ يُنفِقَهُ، أَوْ جَبُنَ عَنِ الْعَدُوِّ أَنْ يُقَاتِلَهُ، فَلْيُكْثِرْ مِنْ سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمدِهِ، فَإِنَّهَا أَحَبُّ إِلَى اللهِ مِنْ جَبَلِ ذَهَبٍ يُنْفِقُهُ فِي سَبِيلِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[3]

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٧٠١٩))

٢) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٧١٢٠))

٣) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ في (الكبير): (٧٨٠٠)، وَ صَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (١٥٤١))

واتـە: ئـەبی ئومامـەی بـاهیلی خـوا لێـی ڕازی بـێ دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك تەنبەڵی بکاو بێ ئاگابێ لە شەونوێژان، یـان ڕەزیلی بکات لـە ماڵ بەخشین دا، یاخود ترسنۆك بێ لە کاتی جەنگو جیهاد لە بەرانبەر دوژمنـدا، ئـەوە با زۆر زیکری (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ) بکات، لەبەر ئەوەی ئەو زیکرە زۆر خۆشەویسترە لـە لای خوا لە بەخشینی زێڕێك ئەگەر بە ئەنـدازەی چیایەك زۆربـێ کـە دەبەخشرێ لـە پێناوی خوا (عَزَّوَجَلَّ).

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِي الْمِيزَانِ، حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحْمَنِ، سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ اللهِ الْعَظِيمِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دوو وشە هەن زۆر سووکن لە سەر زمان، گرانو قورسن لە تـەرازوو (ی کردەوەکان)، خۆشەویستن لە لای ڕەحمان (واتە: خوا)، کە بـریتین لـە: (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ سُبْحَانَ اللهِ الْعَظِيمِ)، واتە: پاکیی و بێگەردیی و ستایش بۆ خوای گەورەو مەزن.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ قَالَ: سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ فِي يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ، حُطَّتْ عَنْهُ خَطَايَاهُ، وَإِنْ كَانَتْ مِثْلُ زَبَدِ الْبَحْرِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: هـەر کەسێك لـە ڕۆژێکدا، سـەد جار بڵێ: (سُبْحَانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ)، واتـە: پـاکیی و بێگـەردیی و ستایش بۆ خوا، ئەوە گوناهەکانی لێ دەسڕڕێنەوە، ئەگەر بە وێنەی کەفی دەریاش بێ.

---

١) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ: (٦٠٤٣)، وَمُسْلِمٌ: (٧٠٢١))

٢) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ: (٦٠٤٢)، وَمُسْلِمٌ: (٧٠١٨))

# پـایەو پـاداشتی گـوتنی:

## سُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ لله وَلاَ إلهَ إلاَّ اللهُ وَاللهُ اكبَر

{عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ، قَـالَ: قَـالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ): «أَحَبُّ الْكَلاَمِ إِلَى اللهِ أَرْبَعٌ: سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ للهِ، وَلاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ، واللهُ أَكْبَرُ، لاَ يَضُرُّكَ بِأَيِّهِنَّ بَدَأْتَ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتـە: سـەمورەی کوڕی جونـدب خـوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتی: خۆشەویستترینی وشـەکان لای خوا چوارن: (سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُللهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، واللهُ أَكْبَرُ)ن، وە بە هەر کامێکیان دەست پێبکەی زیانی بۆت نیە.**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ، قَـالَ: قَـالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ): «لأَنْ أَقُولَ: سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ للهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ، أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

**واتـە: ئـەبوو هورەیرە خوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغەمبـەر خـوا ﷺ دەیفـەرموو: ئەگەر بڵێم: (سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ للهِ، وَلاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ)، خۆشترە لـە لام لـە هەموو ئەو شتانەی کە خۆر بەسەریاندا هەڵدێ.**

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ، أَنَّ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ)، مَرَّ بِشَجَرَةٍ يَابِسَةِ الْوَرَقِ فَضَرَبَهَا بِعَصَاهُ فَتَنَاثَرَ الْوَرَقُ، فَقَالَ: «إِنَّ الْحَمْدَ للهِ، وَسُبْحَانَ اللهِ، وَلاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ، لَتُسَاقِطُ مِنْ ذُنُوبِ الْعَبْدِ، كَمَا تَسَاقَطَ وَرَقُ هَذِهِ الشَّجَرَةِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[3]

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خـوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـە لای دارێك تێپەڕبوو گەڵاکانی وشك بوو بوون، بـە گۆچانەکەی لێیداو گـەڵاکانی هـەڵوەرین و**

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٥٢٢٤))
٢) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٧٠٢٢))
٣) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٣٥٣٣)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (١٥٧٠))

بلاوبوونەوە، فەرمووی: بێگومان، (گوتنی): (الْحَمْدَ للهِ وَسُبْحَانَ اللهِ وَلاَ إِلَـهَ إلاَّ اللهُ وَاللهُ أَكْبَـرُ) گوناهـەکانی ئینسان هەڵـدەوەرێنن، وەك: چـۆن ئـەو گەڵایانـە لـەم درەختـە هەڵدەوەرێن.

{عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ، قَـالَ: قَـالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ): «لَقِيْتُ إِبْرَاهِيمَ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِي، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ! أَقْرِئْ أُمَّتَكَ مِنِّي السَّلاَمَ، وَأَخْبِرهُمْ أَنَّ الْجَنَّةَ طَيِّبَةُ التُّرْبَةِ، عَذْبَةُ الْمَاءِ، وَأَنَّهَا قِيْعَانٌ، وَأَنَّ غِرَاسَهَا: سُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ للهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَاللهُ اكْبَرُ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**(١)

واتە: ئیبنو مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فـەرمووی: لـەو شەو ڕۆیيەی کە پێم کرا، گەیشتم بە پێغەمبەر ئیبراهیم (علیه السلام) فەرمووی: ئـەی موحەممەد! سەلامی من بە ئوممەتەکەت بگەیەنـە، وە هـەواڵیان پـێ بدە کـە بەهەشت خۆڵەکـەی پاكو بـە پێزە، ئاوەکـەی زۆر سازگارەو زەویەکەشی چۆڵاییو نـەرماییـە، وە دەرختەکانی بریتین لە: (سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ للهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ).

{عَنْ مُصْعَبِ بْنِ سَعْدٍ، عَنْ أَبِيـهِ رَضِـيَ اللهُ عَنْهُمَـا، أَنَّ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَـالَ لِجُلَسَائِهِ: «أَيَعْجَزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَكْسِبَ أَلْفَ حَسَنَةٍ؟ فَسَأَلَهُ سَائِلٌ مِنْ جُلَسَائِهِ: كَيْفَ يَكْسِبُ أَحَدُنَا أَلْفَ حَسَنَةٍ؟ قَالَ: يُسَبِّحُ أَحَدُكُمْ مِائَـةَ تَسْبِيحَةٍ تُكْتَبُ لَـهُ أَلْفُ حسنةٍ، وَتُحَطُّ عَنْـهُ أَلْفُ سَيِّئَةٍ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(٢)

واتە: موصعەبی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص خوا لێـی ڕازی بـێ، لە بابی دەگێڕێتەوە، کە: پێغەمبەری خوا ﷺ بەو کەسانەی فـەرموو کە لە مەجلیسەکەی دانیشتبوون، ئایا کـەس هەیـە لـە ئێوە نـەتوانێ هەموو

---

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٣٤٦٢) وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع): (٥١٥٢)).

٢) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٢٦٩٨)، وَالتِّرمِذِيُّ: (٣٤٦٣) وَاللَّفظُ لَـهُ، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صَحيح سُنَن التِّرمِذِيُّ)).

ڕۆژێك هەزار چاکە بۆ خۆی بە دەستبێنێ؟ یەکێك کە لە مەجلیسەکە دانیشتبوو پرسیاری لێکردو گوتی: چۆن یەکێك لە ئێمە دەتوانێ (هەموو ڕۆژێك) هەزار چاکە بە دەستبێنێ؟ فەرمووی: هەر یەکێك لە ئێوە سەد جار (سُبْحَانَ الله) بکات هەزار چاکەی بۆ دەنووسرێ، وە هەزار گوناهی لێ دەسڕڕێنەوە.

{عَنْ أُمِّ هَانِئٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: مَرَّ بِي ذَاتَ يَوْمٍ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقُلْتُ: يَا رَسُوْلَ اللهِ! إِنِّي قَدْ كَبُرتُ وَضَعُفتُ، فَمُرْنِي بِعَمَلٍ أَعْمَلُهُ وَأَنَا جَالِسَةٌ، قَالَ: «سَبِّحِي اللهَ مَائَةَ تَسْبِيْحَةٍ، فَإِنَّهَا تَعْدِلُ لَكِ مَائَةَ رَقَبَةٍ تُعْتِقِيْنَهَا مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيل، وَأَحْمَدُي اللهَ مَائَةَ تَحْمِيْدَةٍ تَعْدِلُ لَكِ مَائَةَ فَرَسٍ مُسْرَّجَةٍ مُلْجَمَةٍ تَحْمِلِيْنَ عَلَيْهَا فِي سَبِيلِ اللهِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[1]

واتە: ئوممو هانيء خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ بە لامدا تێپەڕی، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! من گەورەبوومەو بێ هێز بوومە، ڕێم پێشانبدە لەسەر کردنی کارێك کە (بتوانم) بەدانیشتنەوە بیکەم، فەرمووی: سەد جار (اللهُ أَكْبَر) بکە، پاداشتی ئازاد کردنی سەد کۆیلەت لە وەچەی ئیسماعیل بۆ دەنووسرێ، وە سەد جار بڵێ: (الحَمْدُلله) پاداشتی سەد سواری لغاو کراو کە بجەنگن لە ڕێی خوات بۆ دەنووسرێ.

---

١) (رَوَاهُ أَحْمَد: (٢٦٧٩)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٣١٦))

# پایەو پاداشتی گوتنی:

## رَضِيتُ بِاللهِ رَبّاً وَبِالإِسْلاَمِ دِيناً، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً

{عَنْ الْمُنْذِرِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَنْ قَالَ إِذَا أَصْبَحَ رَضِيتُ بِاللهِ رَبّاً وَبِالإِسْلاَمِ دِيناً، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيّاً فَأَنَا الزَعِيمُ لآخذن بِيَدِهِ حَتَّى أُدْخِلَهُ الجَنَّةَ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[1]

**واتە: مونذیر خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: هەر مسوڵمانێك لە كاتی بەرەبەیاندا گوتی: ڕازیم خوا پەروەردگارم بێ، ئیسلام ئایین‌و بەرنامەم بێ، موحەممەدیش پێغەمبەرم بێ، ئەوە من گرەنتی ئەوەی دەدەمێ دەستی بگرم هەتا دەیبەمە نێو بەهەشتێ.**

{عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ قَالَ: رَضِيتُ بِاللهِ رَبّاً وَبِالإِسْلاَمِ دِيناً، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً، وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

**واتە: ئەبوو سەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر مسوڵمانێك بڵێ: ڕازیم خوا پەروەردگارم بێ، ئیسلام ئایین‌و بەرنامەم بێ، موحەممەدیش پێغەمبەرم بێ، (چوونە) بەهەشتی بۆ واجب دەبێ.**

{عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ «مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ الْمُؤَذِّنَ، وَأَنَا أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ رَضِيتُ بِاللهِ رَبّاً وَبِالإِسْلاَمِ دِيناً، وَبِمُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَسُولاً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[3]

---

١) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ: (٨٣٨)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٣٣٤))

٢) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (١٥٣١)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٣٣٤))

٣) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (١٦٠)، وَأَبُو دَاوُدَ: (٥٢٥)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني)

واتــە: سـەعدی کـوڕی ئـەبی وەقـاص خـوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك کاتێ گوێی لە بانگ بوو، گوتی: وە منیش شایەدی دەدەم کە جگە لە خوا هیچ پەرستراوی دیکە بە هەق نیەو هیچ هاوبەشیشی نیە، وە بێگومان موحەممەدیش بەندەو نێردراوی خوایە، وە ڕازیم خوا پەروەردگارم بێ، ئیسلام ئایین‌و بەرنامەم بێ، موحەممەدیش پێغەمبەرم بێ، ئەوە لە گوناهەکانی ڕابردووی دەبووردرێ.

{عَنِ الْعَبَّاس بْن عَبْد المطلب رَضِيَ الله عَنْهُ، قَالَ سَمِعْتُ رَسُوْل اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُوْلُ: «ذَاقَ طَعْمَ الإيمَانِ مَنْ رَضِيَ بِاللهِ رَبّاً وَبِالإِسْلامِ دِيناً وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيّاً»}[1]

واتە: عەبباسی کوڕی عەبدولموتەلیب خوا لێی ڕازی بێ (واتە: مامی پێغەمبەر ﷺ)، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: تامی ئیمانی چێژتوە، ئەوەی بڵێ: ڕازیم خوا پەروەردگارم بێ، ئیسلام ئایین‌و بەرنامەم بێ، موحەممەدیش پێغەمبەرم بێ.

## پایەو پاداشتی گوتنی:

## الْحَمْدُ لله

{عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَا أَنْعَمَ اللهُ عَلَى عَبْدٍ نِعْمَةً، فَقَالَ: الْحَمْدُ للهِ إلاَّ كَانَ الَّذِي أَعْطَاهُ أَفْضَلُ مِمَّا أَخَذَ»} **حديثٌ حَسَنٌ**[2]

واتــە: ئەنەسـی کـوڕی مالیـك خـوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ نیعمەتێك نیە کە خوا بیدات بە بەندەیەك، بڵێ: (الْحَمْدُ للهِ) مەگەر خوا باشتری پێدەبەخشێ لەوەی کە پێشتر پێی دراوە.

---

[1] ((رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (١٦٠))

[2] ((رَوَاهُ ابْنُ مَاجَة: (٣٨٠٥)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع): (٥٥٦٢))

{عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، يَقُولُ: «أَفْضَلُ الذِّكْرِ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَفْضَلُ الدُّعَاءِ: الْحَمْدُ لِلهِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**(١)

**واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: باشترین زیکر: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)یە، وە باشترین دووعاش: (الْحَمْدُ للهِ)یە.**

{عَنْ سَهْلِ بْنِ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ أَكَلَ طَعَاماً، ثُمَّ قَالَ الْحَمْدُ للهِ الَّذِي أَطْعَمَنِي هَذَا الطَّعَامَ، وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي، وَلاَ قُوَّةٍ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ، وَمَا تَأَخَّرَ، قَالَ وَمَنْ لَبِسَ، ثَوْبًا فَقَالَ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي كَسَانِي هَذَا الثَّوْبَ وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي، وَلاَ قُوَّةٍ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**(٢)

**واتە: سەهلی کوڕی موعاذی کوڕی ئەنەس لە بابی دەگێڕێتەوە خوا لێی ڕازی بێ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك خواردنێکی خوارد، پاشان گوتی: ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئەم خواردنەی دامێ‌و ڕزق‌و ڕۆزی دام بەبێ گۆڕان‌و توانای خۆم، وە هەر کەسێك پۆشاکێکی پۆشی‌و پاشان گوتی: ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئەم پۆشاکەی پۆشیم‌و پێی بەخشیم، بەبێ هیچ گۆڕان‌و توانای خۆم، ئەوە خوا لە گوناهەکانی ڕابردووی خۆش دەبێ (لە ڕیواتەکە هاتوە: کە لە گوناهی داهاتووشی دەبودرێ، بەڵام شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی خوای لێبێ، ئەو زیادەیەی فەرموودەکەی بە لاواز داناوە).**

---

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٣٣٨٣)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٤٩٧))

٢) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (٤٠٢٣)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (المشكاة): ((٤٣٤٣))، دون زيادة (وما تأخر) في الموضعين)

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ اللهَ لَيَرْضَى عَنِ الْعَبْدِ أَنْ يَأْكُلَ الأَكْلَةَ أَوْ يَشْرَبَ الشَّرْبَةَ فَيَحْمَدهُ عَلَيْهَا»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا بەوە لە بەندەکەی ڕازی دەبێ، کە خواردنێك بخواتو ستایشی بکات لەسەری، وە خواردنەوەیەك بخواتەوەو ستایشی بکات لەسەری.

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ قَالَ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ: الْحَمْدُ للهِ الَّذِي كَفَانِي وَأَوَانِي، وَالْحَمْدُ للهِ الَّذِي أَطْعَمَنِي وَسَقَانِي، وَالْحَمْدُ للهِ الَّذِي مَنَّ عَلَيَّ فَأَفْضَلَ، فَقَدْ حَمِدَ اللهَ بِجَمِيعِ مَحَامِدِ الْخَلْقِ كُلِّهِم»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[2]

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك کاتێك چووە سەر جێگاکەی پێش (نووستن)، بڵێ: ستایش بۆ ئەو خوایەی پێویستی نەخستینە غەیری خۆیو، جێنشینی کردم، وە ستایش بۆ ئەو خوایەی تێر خواردنو خواردنەوەی کردم، وە ستایش بۆ ئەو خوایەی گەورەترین منەتی نایە سەرم، بە دڵنیایی ئەو کەسە بە ئەندازەی هەموو دروستکراوەکانی خوا سوپاسو ستایشی خوای پەروەردگاری کردوە.

{عَنْ أَبِي مَالِكٍ الأَشْعَرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهُ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «الطُّهُورُ شَطْرُ الإِيمَانِ وَالْحَمْدُللهِ تَمْلأُ الْمِيزَانَ، وَسُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ للهِ تَمْلآنِ (أَوْ تَمْلأُ) مَا بَيْنَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، وَالصَّلاَةُ نُورٌ، وَالصَّدَقَةُ بُرْهَانٌ، وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ، وَالْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَكَ أَوْ عَلَيْكَ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[3]

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٧١٠٨))
٢) (رَوَاهُ الحَاكِمُ: (٢٠٠١)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٣٤٤٤))
٣) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٥٥٦))

واتە: ئەبوو مالیکی ئەشعەریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پاكو خاوێنی بەشێکی ئیمانە، (الْحَمْدُ لله) تەرازوو پڕ دەکات، (سُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ للهِ) نێوانی ئاسمانەکانو زەوی پڕ دەکەن، نوێژ نوورە، خێر کردن ڕاستی بڕوو گوێڕایەڵی بۆ خوا سەلماندنە، ئارامگرتن ڕووناکییە، قورئانیش بەلگەیە بۆت یان لەسەرت، خەڵکی هەموو بەیانیان زوو دەڕۆن خۆیان دەفرۆشن جا یان خۆی ڕزگار دەکات.

{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، تَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّهُ خُلِقَ كُلُّ إِنْسَانٍ مِنْ بَنِي آدَمَ عَلَى سِتِّينَ وَثَلَاثِمَائَةِ مَفْصِلٍ، فَمَنْ كَبَّرَ اللهَ، وَحَمِدَ اللهَ، وَهَلَّلَ اللهَ، وَسَبَّحَ اللهَ، وَاسْتَغْفَرَ اللهَ، وَعَزَلَ حَجَرًا عَنْ طَرِيقِ النَّاسِ، أَوْ شَوْكَةً أَوْ عَظْمًا عَنْ طَرِيقِ النَّاسِ، وَأَمَرَ بِمَعْرُوفٍ، أَوْ نَهَى عَنْ مُنْكَرٍ، عَدَدَ تِلْكَ السِّتِّينَ وَالثَّلَاثِمِائَةِ السُّلَامَى فَإِنَّهُ يَمْشِي يَوْمَئِذٍ وَقَدْ زَحْزَحَ نَفْسَهُ عَنِ النَّارِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو ئینسانێك لە وەچەی ئادەم کە دروست کراوە، لە سێ سەدو شەست جومگە پێك هاتووە، جا هەر کەسێك (اللهُ أَكْبَر و الْحَمْدُلله، لاَ إِلَهَ إلاَّ اللهُ، سُبْحَانَ الله، أَسْتَغْفِرُالله) بکات، یان بەردێك لەسەر ڕێگای خەڵکی لابدات، یان دڕکێك، یان ئازارێك لەسەر ڕێگای خەڵکی لابدات، یان فەرمان بە چاکە بکات، یاخود ڕێگری خراپەیەك بکات، بە ئەندازەی ئەو سێ سەدو شەست جومگانە ئەو ڕۆژە خۆی لە ئاگری دۆزەخ لاداوەو دوور خستۆتەوە.

{عَنْ أَبِي ذَرٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ نَاسًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالُوا: لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): يَا رَسُولَ اللهِ! ذَهَبَ أَهْلُ الدُّثُورِ بِالأُجُورِ يُصَلُّونَ كَمَا نُصَلِّي، وَيَصُومُونَ كَمَا نَصُومُ،

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٢٣٧٧))

وَيَتَصَدَّقُونَ بِفُضُولِ أَمْوَالِهِمْ، قَالَ: «أَوَلَيْسَ قَدْ جَعَلَ اللهُ لَكُمْ مَا تَصَدَّقُونَ؟ إِنَّ بِكُلِّ تَسْبِيحَةٍ صَدَقَةً، وَكُلِّ تَكْبِيرَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلِّ تَحْمِيدَةٍ صَدَقَةٌ، وَكُلِّ تَهْلِيلَةٍ صَدَقَةٌ، وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ صَدَقَةٌ، وَنَهْيٌ عَنْ مُنْكَرٍ صَدَقَةٌ، وَفِي بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ أَيَأتِي أَحَدُنَا شَهْوَتَهُ وَيَكُونُ لَهُ فِيهَا أَجْرٌ قَالَ: «أَرَأَيْتُمْ لَوْ وَضَعَهَا فِي حَرَامٍ أَكَانَ عَلَيْهِ فِيهَا وِزْرٌ فَكَذَلِكَ إِذَا وَضَعَهَا فِي الْحَلاَلِ كَانَ لَهُ أَجْرٌ»} **حديث صَحيح**(١)

**واتە: ئەبوو زەڕ خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: هەندێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بە پێغەمبەریان گوت: ئەی پێغەمبەری خوا! دەوڵەمەندەکان هەرچی پاداشت هەیە بردوویانە بۆ خۆیان، وەکو ئێمە نوێژ دەکەن، وەکو ئێمە ڕۆژوو دەگرن، هەندێك لە ماڵ و سامانەکانیشیان دەکەن بەخێر، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: باشە مەگەر خوا شتی بە ئێوە نەبەخشیوە تا بیکەن بەخێر؟! دڵنیابن کە هەموو (سُبْحَانَ اللهِ) گوتنێك چاکەیەکە، هەموو (اللهُ أَكْبَر)ێك چاکەیەکە، هەموو (الْحَمْدُ لله)ێك چاکەیەکە، هەموو (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ)یەك چاکەیەکە، فەرمان بە شتی پەسند چاکەیە، ڕێگری کردن لە شتی ناپەسند چاکەیە، یەکێك لە ئێوە دەچێتە لای خێزانی پاداشتی هەیە، گوتیان: ئەی پێغەمبەر ﷺ یەکێك لە ئێمە ئارەزووی خۆی جێبەجێ دەکات چۆن پاداشتی بۆ هەیە؟! فەرمووی: ئەگەر ئەو ئارەزووەی لە حەرامدا جێ بەجێ بکات گوناهی ناگات؟ گوتیان: با، فەرمووی: دەجا ئەگەر لە حەڵاڵیش دا جێبەجێی بکات پاداشتی هەیە.**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): قَالَ: «إِنَّ لِلطَّاعِمِ الشَّاكِرِ مِنَ الأَجْرِ مِثْلُ مَا لِلصَّائِمِ الصَّابِرِ»} **حَديثٌ صَحيح**(٢)

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٢٣٧٦))

٢) (رَوَاهُ الحَاكِمُ: (٧١٩٥)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٢١٧٩))

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان کەسێك کە نان دەخواو سوپاسگوزاری خوای لەسەر دەکات، هەمان پاداشتی ڕۆژووەوانیی ئارامگری بۆ هەیە.**

{عَنْ عِمْرَانَ بن حُصَيْنٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: «إِنَّ أَفْضَلَ عِبَادِ الله يَوْمَ الْقِيَامَةِ الْحَمَّادُونَ، ثُمَّ لا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ مَنْ نَاوَأَهُمْ مِنْ أَهْلِ الشِّرْكِ حَتَّى يُقَاتِلُونَ الدَّجَّالَ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[١]

**واتە: عیمرانی کوڕی حوصەین خوا لێی ڕازی بێ، لە پێغەمبەر خوا ﷺ دەگێڕێتەوە، کە فەرموویەتی: بێگومان باشترینی بەندەکانی خوا لە ڕۆژی قیامەت، ئەوانەن کە زۆر حەمدی خوایان کردوە، پاشان بەردەوام تاقمێك لە ئوممەتەکەم جەنگ دەکەن لەگەڵ ئەوانەی دژایەتییان دەکەن لە ئەهلی هاوبەش دانەران، هەتاکو جەنگ لەگەڵ دەجالیش دەکەن.**

{عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِذَا مَاتَ وَلَدُ الْعَبْدِ، قَالَ اللهُ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى لِلْمَلائِكَةِ: أَقَبَضْتُمْ وَلَدَ عَبْدِي؟ قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: أَقَبَضْتُمْ ثَمَرَةَ فُؤَادِهِ؟ قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: فَما قَالَ؟ قَالُوا: اسْتَرْجَعَ وَحَمِدَكَ، قَالَ: ابْنُوا لَهُ بَيْتاً فِي الْجَنَّةِ، وَسَمُّوهُ بَيْتَ الْحَمْدِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[٢]

**واتە: ئەبوو مووسای ئەشعەریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێك منداڵی بەندەیەکی خوا مرد، خوای پاك و بەرز بە فریشتەکان دەفەرموێ: گیانی منداڵی بەندەکەی منتان کێشا؟ دەڵێن: بەڵێ، دەفەرموێ: ئایا بەرهەمی دڵەکەیتان وەرگرت؟ دەڵێن: بەڵێ، دەفەرموێ: چی گوت بەندەی من؟ دەڵێن: گەڕاوە لای تۆو ستایشی**

---

١) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ في (الكَبير): (٢٥٤)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع): (١٥٧١))

٢) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٩٦٩)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٧٩٥))

کردی، دەفەمویَ: خانوویێکی بۆ دروست بکەن لە بەهەشت‌و ناوی بنێن خانووی حەمد.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: إِذَا قَالَ الإِمَامُ: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ)، فَقُولُوا: «اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ، فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ قَوْلُهُ قَوْلَ الْمَلاَئِكَةِ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئیمام گوتی: (سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ) ئێوە بڵێن: (اللَّهُمَّ رَبَّنَا لَكَ الْحَمْدُ)، چونکە بێگومان هەر کەسێك قسەکەی لەگەڵ قسەی مەلائیکەتەکان ڕێك بکەوێ، لە گوناهی ڕابردووی دەبوردرێ.**

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): قَالَ: «التَّأَنِّي مِنَ اللهِ وَالْعَجَلَةُ مِنَ الشَّيْطَانِ، وَمَا مِنْ شَيْءٍ أَحَبُّ إِلَى اللهِ مِنَ الْحَمْدِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[2]

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لەسەرخۆیی لە خواوەیە، وە پەلە کردن لە شەیتانەوەیە، وە بەڕاستی هیچ شتێك بە ئەندازەی ستایش (الحمدلله) کردن لە لای خوا خۆشەویستتر نیە.**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَأَبِي سَعِيدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): قَالَ: «إِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ اصْطَفَى مِنَ الْكَلاَمِ أَرْبَعاً: سُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ للهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَاللهُ أَكْبَرُ، قَالَ: وَمَنْ قَالَ: سُبْحَانَ اللهِ كُتِبَتْ لَهُ بِهَا عِشْرُونَ حَسَنَةً وَحُطَّ عَنْهُ عِشْرُونَ سَيِّئَةً، وَمَنْ قَالَ: اللهُ أَكْبَرُ فَمِثْلُ ذَلِكَ، وَمَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ فَمِثْلُ ذَلِكَ، وَمَنْ قَالَ: الْحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ،

---

١) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٧٦٣)، وَمُسْلِمٌ: (٩٤٠))

٢) (رَوَاهُ أبو يعلى: (٤٢٥٦)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٢٦٧٧))

مِنْ قِبَلِ نَفْسِهِ كُتِبَ لَهُ بِهَا ثَلاَثُونَ حَسَنَةً، وَحُطَّ عَنْهُ ثَلاَثُونَ سَيِّئَةً»} **حَديثٌ صَحيحٌ**[١]

**واتە: ئەبوو هورەیرەو ئەبوو سەعیدی خودری خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوای پایەدار، لە نێو وشەکاندا چواری هەڵبژاردوون: (سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ للهِ، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَاللهُ أَكْبَرُ)، وە هەر کەس گوتی: (سُبْحَانَ اللهِ) بیست چاکەی بۆ دەنووسرێ‌و، بیست خراپەشی لێ دەسڕدرێنەوە، وە هەر کەس گوتی: (اللهُ أَكْبَرُ)، ئەویش وەك ئەو (پاداشتی بۆ دەنووسرێ)، وە هەر کەس گوتی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ) هەروەك ئەو (پاداشتی بۆ دەنووسرێ)، وە هەر کەس گوتی: (الْحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ) لە دڵی خۆی، سی چاکەی بۆ دەنووسرێ‌و سی خراپەشی لێ دەسڕدرێنەوە.**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِذَا رَأَى أَحَدكُمْ مُبْتَلَي، فَقَالَ: الْحَمْدُ للهِ الَّذِي عَافَانِي مِمَّا ابْتَلاَكَ بِهِ، وَفَضَّلَنِي عَلَيْكَ، وَعَلَى كَثِيرٍ مِنْ عِبَادِهِ تَفْضِيلا، كَانَ شَكَرَ تِلْكَ النِّعْمَةَ»} **حَديثٌ حَسَنٌ**[٢]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە کەسێکی تووش بوو بە بەڵایەکی بینی، گوتی: سوپاس‌و ستایش بۆ ئەو خوایەی منی پاراست لەوەی تووشی تۆی کردوە، وە فەزڵی منی داوە بەسەر زۆربەی بەندەکانی، ئەوە سوپاسگوزاریی‌و شوکرانە بژێری ئەو نیعمەتەی کردوە.**

---

١) (رَوَاهُ أَحْمَدُ: (٨٠٧٩)، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِمٍ، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع) برقم: (١٧١٨)).

٢) (رَوَاهُ البَيْهَقِيُّ في (شعب الإيمان): (٤٤٤٣) وحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع): (٥٥٥)).

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ رَأى مُبْتَلَى فَقَالَ: الْحَمْدُ للهِ الَّذِي عَافَانِي مِمَّا ابْتَلاَكَ بِهِ، وَفَضَّلَنِي عَلَى كَثِيْرٍ مِمَّنْ خَلَقَ تَفْضِيلاً، لَمْ يُصِبْهُ ذَلِكَ الْبَلاَءُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[(١)]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە کەسێکی تووش بوو بە بەڵایەکی بینی، گوتی: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی منی پاراست لەوەی تووشی تۆی کردوە، وە فەزڵی منی داوە بەسەر زۆربەی دروستکراوەکانی، ئەوە لەو بەڵایەی تووش نابێ، (واتە: خوای بەبەزەیی تووشی ئەم بەڵایەی ناکات).

## پایەو پاداشتی سوپاسگوزاریی کردنی خـوا

{عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشْيرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «التَّحَدُّثُ بِنِعْمَةِ اللهِ شُكْرٌ وَتَرْكُهَا كُفْرٌ، وَمَنْ لاَ يَشْكُرُ الْقَلِيلَ لاَ يَشْكُرُ الْكَثِيرَ، وَمَنْ لاَ يَشْكُرُ النَّاسَ لاَ يَشْكُرُ اللهَ، وَالْجَمَاعَةُ بَرَكَةٌ وَالْفُرْقَةُ عَذَابٌ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[(٢)]

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باسکردنی نیعمەتی خوا سوپاسگوزایی کردنیەتی، وە باس نەکردنی کوفر کردن و سپڵەییە، وە هەر کەسێك سوپاسگوزاریی لەسەر شتی کەم نەکات سوپاسگوزاریی زۆریش ناکات، وە هەر کەسێك سوپاسگوزاریی خەڵکی نەکات (کاتێك کە چاکەیان لەگەڵ کردوە) ئەوە سوپاسگوزاریی خواش ناکات، وە بەرەکەت لە جەماعەتە، وە سزاش لە پارچە پارچەیی و دووبەرەکییە.

---

(١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٣٤٣٢)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع): (٦٢٤٨))

(٢) (رَوَاهُ البَيْهَقِيُّ في (شعب الإيمان): (٤٤٤٣)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع): (٣٠١٤))

{عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ صُنِعَ إِلَيْهِ مَعْرُوفٌ، فَقَالَ لِفَاعِلِهِ: جَزَاكَ اللهُ خَيْراً، فَقَدْ أَبْلَغَ فِي الثَّنَاءِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[١]

**واتە: ئوسامەی کوڕی زەید خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك کە چاکەیەکی لەگەڵ کرا، بە کابرای چاکەکاری گوت: (جَزَاكَ اللهُ خَيْراً)، ئەوە بەباشترین شێوە سوپاسو ستاییشی کردوە.**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: «لاَ يَشْكُرِ اللهَ مَنْ لاَ يَشْكُرِ النَّاسَ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[٢]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سوپاسگوزاریی خوای نەکردوە، ئەو کەسەی کە سوپاسی خەڵکی ناکات.**

{عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: «مَنْ أُبْلِيَ بَلاَءً فَذَكَرَهُ فَقَدْ شَكَرَهُ، وَإِنْ كَتَمَهُ فَقَدْ كَفَرَهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[٣]

**واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك چاکەیەکی لەگەڵ کرا باسی (چاکەکە) بکات ئەوە سوپاسگوزاریی کردوە، وە ئەگەر بیشارێتەوەو باسی نەکات ئەو کوفرانەی ئەو چاکەیەی کردوەو سپڵەیی کردوە.**

---

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٢٠٣٥) وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٢٠٣٥))

٢) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (٤٨١١)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٧٧١٩))

٣) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (٤٨١٤)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٦١٨))

# پایەو پاداشتی گوتنی:

## لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ

{عَنْ أَبِي مُوسَى رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ لِي رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «يَا أَبَا مُوسَى أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى كَلِمَةٍ مِنْ كَنْزِ الْجَنَّةِ»، قُلْتُ: مَا هِيَ يَا رَسُولَ اللَّهِ! قَالَ: «لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**(١)

**واتە: ئەبوو مووسا خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ئایا ڕێنماییت نەکەم بۆ گوتنی: وشەیەك کە لە کەنزی بەهەشتە؟! گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەم وشەیە چییە؟ فەرمووی: (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ)، چونکە بێگومان کەنزێکی بەهەشتە.**

{عَنْ قَيْسِ بْنِ سَعْدِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى بَابٍ مِنْ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ»؟ قُلْتُ: بَلَى، قَالَ: «لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**(٢)

**واتە: قەیسی کوڕی سەعد خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا ڕێنماییت نەکەم بۆ دەرگایەك لە دەرگاکانی بەهەشت؟ گوتم: با، فەرمووی: (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ).**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: «أَلاَ أُعَلِّمُكَ أَوْ قَالَ: أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى كَلِمَةٍ مِنْ تَحْتِ الْعَرْش مِنْ كَنْزِ الْجَنَّةِ، تَقُولُ: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ، فَيَقُولُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: أَسْلَمَ عَبْدِي وَاسْتَسْلَمَ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**(٣)

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا وشەیەکت فێرت نەکەم، یان فەرمووی: ڕێنماییت نەکەم بۆ گوتنی: وشەیەك کە لە ژێر**

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٧٠٣٩)

٢) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٣٥٨١)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٧٤٦))

٣) (رَوَاهُ الحَاكِمُ: (٥٤)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٢٦١٤))

عەرشەو لە کەنزی بەهەشتە؟! بڵێ: (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِـاللهِ)، خوای زاڵی پایەدار دەفەرموێ: بەندەکەم ملکەچ بووو سەلامەت‌و گوێڕایەڵ بوو.

{عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَكْثِرُوا مِنْ غِرْسِ الْجَنَّةِ فَإِنَّهُ عَذْبٌ مَاؤُهَا، طَيِّبٌ تُرَابُهَا، فَأَكْثِرُوا مِنْ غِرَاسِهَا: لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[1]

واتە: ئیبنو عومەر خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: زۆر داری بەهەشت بڕوێنن، چونکە ئاوەکەی سازگارەو خۆڵەکەی پاکە، دەرختەکەشی بریتیە لە: (لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ).

## پایەو پاداشتی
## داوای لێخۆشبوون کردن

خوای پەروەردگار دەربارەی پلەو پایەو پاداشتی ئەو کەسانەی دوای ئەوەی گوناح‌و تاوانێك دەکەن، پەشێمان دەبنەوەو تۆبە دەکەن زۆر فەرمایشتی فەرموون، لە سوورەتی (آل عمران) فەرموویەتی:

﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُواْ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَجَنَّٰتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ﴿١٣٦﴾﴾

واتە: ئەوانەی هەرکات کارێکی ناقولایان کرد یان ستەمیان لە خۆیان کرد یادی خوا دەکەن‌و یەکسەر بۆ گوناهەکانیان داوای لێبوردن دەکەن، جا ئایا

---

١) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِـيُّ (١٣٣٥٤)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَـةُ الألبـاني فـي (صـحيح الجـامع): (١٢١٣))

جگە لە خوا کێ لە گوناهان دەبووری؟ وە لە کاتێکدا کە دەزانن (گوناهو خراپە چەند زیانبەخشن) لەسەر ئەو (خراپە)ی دەیکەن پێداگیریی ناکەن. ئەوانە پاداشتیان لێبوردنە لە پەروەردگاریانەوەو چەند بەهەشتێك کە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن و تێیاندا هەمیشەیین، وە باشترین پاداشتی ئەنجامدەرانی کردەوە چاکەکانە، وە هەروەها لە سووڕەتی (هود) ئایەتی (٣)دا فەرموویەتی: ﴿وَأَنِ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ يُمَتِّعْكُم مَّتَٰعًا حَسَنًا إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَيُؤْتِ كُلَّ ذِى فَضْلٍ فَضْلَهُۥ... ﴿٣﴾﴾، واتە: (ئەی خەڵکینە) داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان بکەن، پاشان بگەڕێنەوە بۆ لای وی، ئەو کاتە بە چاکی دەتانژیێنێ بە ژیانێکی چاك تا کاتێکی دیاریکراو، وە پاداشتی هەموو خاوەن چاکەیەك بە زیادەوە دەداتەوە...

ئنجا پێغەمبەری خواش ﷺ لەوبارەوە فەرموودەی زۆرن، بۆ وێنە: لە فەرمایشتێکدا کە زیاتری مەبەستیەتی ئێمەی گوناهبارو تاوانبارو پڕ کەمو کورتی پەندی لێ وەربگرین و ئارەزوومان بۆ داوای لێ بووردن کردن و تۆبەکردن بچێ فەرموویەتی، ئەگەرنا بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ لەوپەڕی پاکیی و چاکیی و سوپاسگوزاریی و بە پاك و تاك گرتنی خوای بێ وێنەدا بووە بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا فەرموویەتی: {وَاللهِ إِنِّي لَأَسْتَغْفِرُ اللهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ فِي الْيَوْمِ أَكْثَرَ مِنْ سَبْعِينَ مَرَّةً} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: سوێند بە خوا من لە ڕۆژێك دا زیاتر لە حەفتا جار داوای لێبوردن لە خوا دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لای وی، وە لە کۆتایی دا ئەم فەرموودەیە دێنمەوە بۆ زیاتر بەرچاو ڕوونیی و هاندانی زیاتر بۆ گوتنی: ئەم زیکرە پڕ خێرو بەرەکەتە: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ لَمْ تُذْنِبُوا

---

١) (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ: (٥٩٤٨)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)

لَذَهَبَ اللهُ بِكُمْ وَلَجَاءَ بِقَوْمٍ يُذْنِبُونَ فَيَسْتَغْفِرُونَ اللهَ فَيَغْفِرُ لَهُمْ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واته: ئه‌بوو هوره‌یره خوا لێی ڕازی بێ، ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: سوێند به‌و كه‌سه‌ی كه گیانی منی به‌ده‌سته، ئه‌گه‌ر گوناح نه‌كه‌ن ئه‌وه خوا له‌ناوتان ده‌بات، وه گه‌لێكی تر دێنێت كه گوناح بكه‌ن‌و داوای لێ خۆشبوون له خوا بكه‌ن‌و ئه‌ویش لێیان خۆش ده‌بێت.

كه‌واته: ئه‌نجامدانی گوناح‌و سه‌رپێچی له‌لایه‌ن به‌نده‌كانه‌وه سوننه‌تێكی جێگیری خوای دادگه‌رو كاربه‌جێیه، وه خوای په‌روه‌ردگاریش حه‌ز ده‌كات هه‌میشه به‌نده‌كانی به‌ندایه‌تیی بۆ پێشان بده‌ن‌و ئه‌ویش به‌چاوی سۆزو ڕه‌حمه‌ت‌و لێبوردنه‌وه سه‌یریان بكات‌و لێیان ببورێ.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا أَخْطَأَ خَطِيئَةً نُكِتَتْ فِي قَلْبِهِ نُكْتَةٌ سَوْدَاءُ، فَإِذَا هُوَ نَزَعَ وَاسْتَغْفَرَ وَتَابَ سُقِلَ قَلْبُهُ، وَإِنْ عَادَ زِيدَ فِيهَا حَتَّى تَعْلُوَ قَلْبَهُ، وَهُوَ الرَّانُ الَّذِي ذَكَرَ اللهُ: ﴿كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾﴾ المطففين»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

واته: ئه‌بوو هوره‌یره خوا لێی ڕازی بێ، ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: كاتێك به‌نده گوناهێكی كرد خاڵێكی ڕه‌ش له‌سه‌ر دڵی په‌یدا ده‌بێت، جا ئه‌گه‌ر وازی لێ هێناو داوای لێبوردنی كردو گه‌ڕاوه (بۆ لای خوا)و تۆبه‌ی كرد، دڵی سپی ده‌بێته‌وه، وه ئه‌گه‌ر گوناهه‌كانی به‌رده‌وام بوون خاڵه ڕه‌شه‌كان زیاد ده‌كه‌ن هه‌تا ده‌بێته ژه‌نگ به‌سه‌ر دڵیه‌وه‌و ته‌واو

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٢٧٤١))

٢) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٣٣٣٤)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٢٤٦٩))

کەمەڕی لەسەر دەبەستی ئەوە ئەوەیە کە خوای پەروەردگار باسی فەرموە: ﴿كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾﴾ المطففين، واتە: نەخێر ڕاست ناکەن، بەڵکو دڵیان بە هۆی گوناهەکانەوە کەمەڕی بەستووەو ژەنگیان هێناوەو داخراوە.

{عَنْ عَبْدَ اللهِ بْنَ بُسْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «طُوبَى لِمَنْ وَجَدَ فِي صَحِيفَتِهِ إِسْتِغْفَارًا كَثِيرًا»} **حديثٌ صَحيحٌ**[1]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی بوسر خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خۆشیی‌و بەختەوەری بۆ ئەو کەسەی، کە لە دەفتەری (کردەوەکانی) داوای لێبوردن کردنی زۆر هەبێ.

{عَنْ يَسَارِ بْنِ زَيْدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أن النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَنْ قَالَ أَسْتَغْفِرُ اللهَ الَّذِي لاَ إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ، وَأَتُوبُ إِلَيْهِ، غُفِرَ لَهُ وَإِنْ كَانَ فَرَّ مِنَ الزَّحْفِ»} **حديثٌ صَحيحٌ**[2]

واتە: یەساری کوڕی زەید خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بڵێ: داوای لێبوردن لە خوای مەزن دەکەم، (ئەو خوایەی) جگە لەو هیچ پەرستراوی دیکە نین بەهەق، زیندوو و ڕاگرە، وە تۆبە دەکەم‌و دەگەڕێمەوە بۆ لای وی، ئەوە لە گوناهەکانی دەبوردرێ ئەگەر لە جەنگیش ڕای کرد بێت.

---

١) (رَوَاهُ ابْنُ مَاجَهْ: (٣٨١٨)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٣٩٣٠))

٢) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُد: (١٥١٩)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح سُنَن أبي دَاوُد))

{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما: عَنْ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «قَالَ اللهُ عَزَّوَجَلَّ مَنْ عَلِمَ أَنِّي ذُو قُدْرَةٍ عَلَى مَغْفِرَةِ الذُّنُوبِ، غَفَرْتُ لَهُ وَلاَ أُبَالِي مَا لَمْ يُشْرِك بي شَيْئاً»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[1]

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای زاڵی بەرز فەرموویەتی: هەر کەسێک بزانێو بڕوای وابێ من خاوەن توانای لێبوردنم لە گوناهان، ئەوە لێی خۆش دەبمو باکیشم نیە مادام هاوبەشی بۆ پەیدا نەکردبم.**

{عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): قَالَ اللهُ تَعَالى: «يَا ابْنَ آدَمَ! مَهْمَا عَبَدتَنِي وَرَجَوتَنِي وَلَمْ تُشْرِكْ بِي شَيْئاً غَفَرْتُ لَكَ عَلَى مَا كَانَ فِيكَ، وَإِنْ اسْتَقْبَلْتَنِي بِمِلءِ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ خَطَايَا وَذُنُوباً اسْتَقْبَلْتُكَ بِمِلْئِهِنَّ مِنَ الْمَغْفِرَةِ وَأَغْفِرُ لَكَ وَلاَ أُبَالِي»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

**واتە: ئەبوو دەرداء خوا لێ ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا فەرموویەتی: ئەی وەچەی ئادەم! هەرچەند تۆ بەندایەتی بکەی بۆم وە تکام لێبکەی، وە هیچ هاوەڵێکم بۆ پەیدانەکەی، ئەوە منیش هەرچی تۆ کردبت (لە گوناح) لێت دەبوورم، وە ئەگەر پڕ بە ئاسمانو زەوی لە گوناح تاوان بێیتەوە بۆ لام، منیش بە پڕی ئاسمانو زەوی لە لێبوردن پێشوازیت لێ دەکەم، وە لێت دەبوورمو هیچ باکم نیە.**

{عَنْ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَا مِنْ رَجُلٍ يُذْنِبُ ذَنْبًا ثُمَّ يَقُومُ فَيَتَطَهَّرُ، ثُمَّ يُصَلِّي، ثُمَّ يَسْتَغْفِرُ اللهَ الاَّ غَفَرَ لَهُ»، ثُمَّ قَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿وَالَّذِينَ إِذَا

---

١) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي (الكَبير): (١١٦١٥)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٤٣٣٠))

٢) (رَوَاهُ البَيْهَقِيُّ فِي (شعب الإيمان): (١٠٤٠)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٤٣٤١))

فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلُوا۟ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ ﴾ آل عمران ﴿} **حديثٌ حسنٌ**[1]

واتە: ئەبو بەکر خوا لێ ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ، دەیفەرموو: هیچ پیاوێك نیە گوناهێك ئەنجام بدات، دوایی هەستێو خۆی پاك کاتەوە (واتە: دەست نوێژ بگرێ، وەکو لە فەرموودەی دیکە هاتوە) ئنجا دوو ڕکات نوێژان بکات، بێگومان خوا دەیبورێو لێی خۆشدەبێ، پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلُوا۟ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ ﴾ آل عمران

واتە: ئەوانەی هەر کات کارێکی ناقولأیان کرد یان ستەمیان لە خۆیان کرد یادی خوا دەکەنو یەکسەر بۆ گوناهەکانیان داوای لێبوردن دەکەن، جا ئایا جگە لە خوا کێ لە گوناهان دەبووری؟ وە لە کاتێکدا کە دەزانن (گوناهو خراپە چەند زیانبەخشن) لەسەر ئەو (خراپە)ی دەیکەن پێداگیریی ناکەن.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، يَقُوْلُ: «وَاللهِ! إِنِّي لأَسْتَغْفِرُ اللهَ وَأَتُوبُ إِلَيهِ فِي الْيَوم أَكْثَرَ مِن سَبْعِينَ مَرَّةً»} **حديثٌ صحيحٌ**[2]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: بیستم کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: وەڵلاهی! من لە ڕۆژێکدا، زیاتر لە سەد جار داوای لێ خۆشبوون دەکەمو دەگەڕێمەوە بۆ لای خوا.

---

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٣٥٧٧)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةَ الألباني في (المشكاة): (١٣٢٤))

٢) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٥٩٤٨))

{عَنِ الزُّبَيرِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: «مَنْ أَحَبَّ أَنْ تَسُرَّهُ صَحِيفَتَهُ فَلْيُكْثِر فِيهَا مِنَ الاسْتِغفَارِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**(١)

**واته: زوبەیر خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك حەز دەکات دڵخۆش بێ بە دەفتەری (کردەوەکانی لە ڕۆژی دوایی) با زۆر داوای لێ خۆشبوون و لێبوردن لە خوای پەروەردگار بکات.**

{عَنْ بِلاَلِ بْنِ يَسَارِ بْنِ زَيْدٍ مَوْلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): حَدَّثَنِي أَبِي: عَنْ جَدِّي رَضِيَ اللهُ عَنْهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، يَقُولُ: مَنْ قَالَ: «أَسْتَغْفِرُ اللهُ الْعَظِيمَ الَّذِي لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ، غُفِرَ لَـهُ وَإِنْ كَانَ فَرَّ مِنَ الزَّحْفِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(٢)

**واته: بیلالی کوڕی یەساری کوڕی زەید لە بابی ئەویش لە باپیریەوە خوا لێی ڕازی بێ، دەگێڕێتەوە کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، فەرموویەتی: هەر کەسێك بڵێ: (أَسْتَغْفِرُ اللهُ الْعَظِيمَ الَّذِي لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ)، لە گوناهەکانی دەبوردرێ، ئەگەر بێت و لە جەنگیش ڕای کردبێ.**

{أَنَّهُ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: لأَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: الشِّرْكُ فِيكُمْ أَخْفَى مِنْ دَبِيبِ النَّمْلِ وَسَأَدُلُّك عَلَى شَيْءٍ إِذَا فَعَلْتَـهُ أَذْهَبَ عَنْك صِغَارَ الشِّرْكِ وَكِبَارَهُ تَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِك أَنْ أُشْرِكَ بِك وَأَنَا أَعْلَمُ وَأَسْتَغْفِرُك لِمَا لا أَعْلَمُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(٣)

**واته: پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبوو بەکری صیددیقی خوا لێی ڕازی بێ، فەرمووە: شیرك بۆ خوا دانان لە نێوتان زۆر نادیارو پەنهانە، نادیارترە لە ڕۆیشتنی مێروولەش، وە من ڕێنماییت دەکەم بۆ ئەنجامدانی کارێك (لێرە مەبەست گوفتارە، چونکە بە زار**

---

١) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي (الأوسط): (٨٣٩)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٥٩٥٥))

٢) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٣٥٧٧)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (١٦٢٢))

٣) (رَوَاهُ الحكيم (ج٤، ص١٤٢)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٣٧٣١))

دەگوترێ) کە دەتانپارێزێ لە شیرکی گچکەو شیرکی گەورە، بڵێیی: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أُشْرِكَ بِكَ وَأَنَا أَعْلَمُ وَأَسْتَغْفِرُكَ لِمَا لا أَعْلَمُ)، واتە: ئەی خوایە! پەنا بە تۆ دەگرم لە هەر هاوبەش پەیداکردنێك کە دەیزانم، وە داوای لێ خۆشبوونت لە هەر هاوبەش پەیداکردنێك لێ دەکەم کە نایزانم.

{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «قَالَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ مَنْ عَلِمَ أَنِي ذُو قُدْرَةٍ عَلَى مَغْفِرَةِ الذُّنُوبِ غَفَرْتُ لَهُ وَلاَ أُبَالِي مَا لَمْ يُشْرِكْ بِي شَيْئاً»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[1]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوای زاڵی پایەدار فەرموویەتی: هەر کەسێك بزانێ من خاوەن توانا و لێ خۆشبوونی گوناهم، لێی خۆش دەبم‌و هیچ باکم نیە، مادام هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیار نەدابم.

{عَنْ أَبِي أُمَامَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنْ رَسُوْلِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: «إِنَّ صَاحِبَ الشِّمَالِ لَيَرفَعُ الْقَلَمَ سِتَّ سَاعَاتٍ عَنِ الْعَبْدِ الْمُسْلِمِ الْمُخْطِئِ أَوْ الْمُسِيءِ، فَإِنْ نَدِمَ وَاسْتَغْفَرَ اللهَ مِنْهَا أَلْقَاهَا، وَإِلاَّ كُتِبَتْ وَاحِدَةً»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[2]

واتە: ئەبی ئومامە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خاوەنی لای چەپ (واتە: مەلائیکەی سەر شانی چەپ) تاکو شەش کات قەڵەم هەڵدەگرێ لەسەر بەندەی گوناهکار یان خراپەکار، ئەگەر پەشیمان بۆوەو داوای لێخۆشبوونی کرد، ئەوە لەسەری نانووسرێ، ئەگەر (ئەوەی نەکرد، واتە: پەشیمان نەبۆوە) ئەوە تەنها یەك گوناهی بۆ دەنووسێ.

---

١) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ في (الكبير): (١١٦١٥)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٤٣٣٠))

٢) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ في (الكبير): (٧٧٦٥)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٢٠٩))

## دووبارە کردنەوەی تـۆبەو

## داوای لێخۆش بـوون

{عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: «إِنَّ الشَّيْطَانَ قَالَ: وَعِزَّتِكَ يَا رَبِّ لاَ أَبْرَحُ أُغْوِي عِبَادَكَ مَا دَامَتْ أَرْوَاحُهُمْ فِي أَجْسَادِهِمْ، فَقَالَ الرَّبُّ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: وَعِزَّتِي وَجَلاَلِي لاَ أَزَلُ أَغْفِرُ لَهُمْ مَا اسْتَغْفَرُونِي»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**(١)

**واتە: ئەبوو سەعیدی خودری خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شەیتان گوتی: سوێند بە عیززەتت ئەی پەروەردگارم دەست هەڵناگرم لە گومڕاو سەرگەردان کردنی بەندەکانت، هەتاکو ڕووح لە جەستەیان دا مابێت، پەروەردگار (تَبَارَكَ وَتَعَالَى) فەرمووی: بە عیززەت‌و بە گەورەیی خۆم منیش بەردەوام لێیان دەبوورم‌و لێیان خۆش دەبم، هەتاکو داوای لێبوردن‌و لێخۆشبوونم لێ بکەن.**

{عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّ رَجُلاً جَاءَ إِلَى رَسُوْلِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ: أَحَدُنَا يُذْنِبُ قَالَ: «يُكْتَبُ عَلَيْهِ»، قَالَ: ثُمَّ يَسْتَغْفِرُ مِنْهُ وَيَتُوبُ قَالَ: «يُغْفَرُ لَهُ وَيُتَابُ عَلَيْهِ»، قَالَ: فَيَعُودُ فَيُذْنِبُ قَالَ: «يُكْتَبُ عَلَيْهِ»، قَالَ: ثُمَّ يَسْتَغْفِرُ مِنْهُ وَيَتُوبُ قَالَ: «يُغْفَرُ لَهُ وَيُتَابُ عَلَيْهِ، وَلاَ يَمَلُّ اللهُ حَتَّى تَمَلُّوا»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(٢)

**واتە: عوقبەی کوڕی عامیر خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: یەکێك لە ئێمە گوناهێك دەکات، فەرمووی: لەسەری دەنووسرێ، گوتی: داوای لێبوردن دەکاو دەگەڕێتەوە، فەرمووی:**

---

١) (رَوَاهُ أَحْمَدُ: (١١٢٥٥)، وَحَسَّنَهُ العَلَّامَة الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٠٤))

٢) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ في (الأوسط): (٨٦٨٩)، والحَاكِمُ: (٧٦٥٨)، وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيح عَلَى شَرْطِ الشيخين وَلَمْ يخرجَاهُ، وَوَافَقَهُ الذَّهبي في (التلخيص))

لێی دەبووردرێ‌و گەڕانەوەی لێ وەردەگیرێ، گوتی: دەگەڕێتەوە سەری‌و گوناهەکە دەکات، فەرمووی: لەسەری دەنووسرێ، گوتی: داوای لێبوردنی لێ دەکاو دەگەڕێتەوە، فەرمووی: لێی دەبووردرێ‌و گەڕانەوەی لێ وەردەگیرێ، وە خوا بێزار نابێ (لە لێ خۆشبوونی بەندەکەی) تاکو ئەو بێزار دەبێ (لە گوناح کردن)!!

{عَنْ أَبِي مُوسَى رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «يَدُ اللهِ بَسطَان لِمُسِيء اللَّيْل لِيَتُوبَ بِالنَّهَارِ، وَلِمُسِيء النَّهَارِ لَيَتُوبَ بِاللَّيْلِ، حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِن مَغْرِبِهَا»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[(١)]

واتە: ئەبوو مووسا خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ دەستی خوای بێ وێنە کراوەیە بۆ کەسانێك کە شەو گوناهیان ئەنجام داوە، بە ڕۆژ پەشێمان ببنەوەو تۆبە بکەن، وە بۆ کەسانێك کە بە ڕۆژ خراپەیان ئەنجام داوە بە شەو پەشێمان ببنەوەو تۆبە بکەن، تا ئەو کاتەی کە ڕۆژ لە ڕۆژ ئاواوە هەڵدێ.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ لَيَرْفَعُ الدَّرَجَةَ لِلْعَبْدِ الصَّالِح فِي الْجَنَّةِ، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ! أَنَّى لِي هَذِهِ؟ فَيَقُولُ: بِاسْتِغْفَارِ وَلَدِكَ لَكَ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[(٢)]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی خوای زاڵی پایەدار پلەی بەندەی صاڵح بەرز دەکاتەوە لە بەهەشت، (ئەویش) دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! ئەوە لە کوێوە بۆ من هاتوە، پێی دەگوترێ: بە هۆی داوای لێخۆشبوون کردنی مندالەکەتە کە دووعای کردووی.

---

١) (الزهد لابن السري: (٨٨٥)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٣٥١٣))

٢) (رَوَاهُ أَحْمَدُ: (١٠٦١٨)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٥٩٨))

# پایەو پاداشتی
## داوای لێخۆشبوون کردن بۆ بڕواداران

{عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): يَقُولُ: «مَنِ اسْتَغْفَرَ لِلْمُؤْمِنِيْنَ وَالْمُؤْمِنَاتِ، كَتَبَ اللهُ لَهُ بِكُلِّ مُؤْمِنٍ وَمُؤْمِنَةٍ حَسَنَةً»} **حديثٌ حسنٌ**[(١)]

**واتە: عوبادەی کوڕی صامیت خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێك داوای لێ خۆشبوون بکات بۆ ئیماندارانی پیاوو ئافرەت، خوا بە هەموو ئیماندارێکی پیاوو ئافرەت چاکەیەکی بۆ دەنووسێ.**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فِيمَا يَحْكِي عَنْ رَبِّهِ عَزَّ وُجَلَّ قَالَ: «أَذْنَبَ عَبْدُ ذَنْباً، فَقَالَ: اللَّهُمَّ! اغْفِرِ لِي ذَنْبِي، فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْباً، فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ، وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ، ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ، فَقَالَ: أَيْ رَبِّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي، فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: عَبْدِي أَذْنَبَ ذَنْباً، فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ، وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ، ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ، فَقَالَ: أَيْ رَبِّ: اغْفِرْ لِي ذَنْبِي، فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْباً، فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ، وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ، اعْمَلْ مَا شِئْتَ فَقَدْ غَفَرتُ لَكَ»} **حديثٌ صَحيحٌ**[(٢)]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەو شتانەی کە لە پەروەردگاری زاڵی پایەدار دەیگێڕێتەوە، فەرمووی: بەندەیەك گوناهێکی کرد، پاشان گوتی: خوایە لە گوناهەکەم خۆشبە، خوای (تَبَارَكَ وَتَعَالى) فەرمووی: بەندەکەم گوناهێکی کرد، زانی کە پەروەردگارێکی هەیە لە گوناح خۆش دەبێت، لەسەر گوناح سزای دەدات، پاشان گوناهێکی دیکەی کردەوە، گوتی: ئەی پەروەردگار لە گوناهەکەم خۆشبە، خوای (تبارك وتعالى) فەرمووی: بەندەکەم گوناهێکی کرد، زانی پەروەردگارێکی**

---

١) (مُسْنَد الشاميين: (٢١٥٥)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع): (٦٠٢٦))

٢) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ: (٧٠٦٨)، وَمُسْلِمٌ: (٧١٦٢) وَاللَّفْظُ لَهُ)

هەیە لە گوناح خۆش دەبێت، سزای دەدات لەسەر گوناح، پاشان دیسان گوناهێکی دیکەی کردەوە، گوتی: پەروەردگار لە گوناهەکەم خۆشبە، خوای (تبارك وتعالى) فەرمووی: بەندەکەم گوناهێکی کرد، زانی کە پەروەردگارێکی هەیە لە گوناح خۆش دەبێت و سزای دەدات لەسەر گوناح کردن، پاشان جارێکی دیکە گوناهێکی دیکەی کردەوە، دیسان گوتی: پەروەردگار لە گوناهەکەم خۆش بە، خوای (تبارك وتعالى) فەرمووی: بەندەکەم گوناهێکی کرد زانی کە پەروەردگارێکی هەیە لە گوناح خۆش دەبێتو سزای دەدات لەسەر گوناح چی دەکەیت بیکە ئەوا من لێت خۆش بووم (بێزار نابم لەوە کە داوای لێبوردنت لێ قبووڵ بکەم).

{عَنْ ثَوبَان رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: «إِنَّ الْعَبْدَ لَيَلْتَمِسُ مَرضَاةِ اللهِ وَلاَ يَزَالُ بِذَلِكَ، فَيَقُولُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ لِجِبْرِيل: إِنَّ فلاناً عَبْدِي يَلْتَمِسُ أَنْ يُرضِيْنِي، أَلاَ وَإِنَّ رَحْمَتِي عَلَيْهِ، فَيَقُولُ جِبْرِيلُ: رَحْمَةُ اللهِ عَلَى فُلاَنٍ، وَيَقُولُهَا حَمَلَةُ الْعَرشِ، وَيَقُولُهَا مَنْ حَوْلَهُمْ، حَتَّى يَقُولُهَا أَهْلُ السَّمَاوَاتِ السَبْعِ، ثُمَّ تُهْبَطُ لَهُ إِلَى الأَرْضِ»} **حديثٌ حَسَنٌ**[1]

واتە: ئەوبان خوا لێی ڕازی بێ، دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی بەندە داوای ڕەزامەندیی خوای پەروەردگار دەکاتو بەردەوام دەبێ لەسەر ئەوە، خوای زاڵی پایەدار بە جبریل دەفەرموێ: فلانە بەندەم داوا دەکات لێی ڕازیبم، ئاگاداربە ئەوە ڕەحمەتی منی ڕژا سەر، یانی: بەزەییم ئەوی گرتەوە (جبریل)یش دەڵێ: ڕەحمەتی خوا لەسەر فلان بێ، وە هەڵگرانی عەرش، هەروا دەڵێن، وە ئەوانەی بە دەوریانەوەن وادەڵێن، هەتاکو خەڵکی هەر حەوت ئاسمانەکانیش وا دەڵێن، پاش ئەو (ڕەحمەتەی) بۆ دێتە سەر زەوی واتە: خەڵکی سەر زەویش دووعای بۆ دەکەن، (کە لێرە مەبەست پێی ئیماندارەکانن).

{عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: «سَيِّدُ الاسْتِغْفَارِ أَنْ تَقُولَ: (اللَّهُمَّ! أَنْتَ رَبِّي لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَعُوذُ بِكَ

---

[1] (رَوَاهُ أَحْمَد: (٢٢٤٥٤)، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ حَسَن)

مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي، فَإِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، قَالَ: وَمَنْ قَالَهَا مِنَ النَّهَارِ مُوقِناً بِهَا، فَمَاتَ مِنْ يَوْمِهِ قَبْلَ أَنْ يُمْسِيَ، فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، وَمَنْ قَالَهَا مِنَ اللَّيْلِ وَهُوَ مُوْقِنٌ بِهَا، فَمَاتَ قَبْلَ أَنْ يُصْبِحَ، فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(١)

واتە: شەددادی کوڕی ئەوس خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: گەورەترینو چاکترین پاڕانەوەی داوای لێخۆش بوون ئەوەیە، کە (بەندە) بڵێ: ئەی خودایە، تۆ پەروەردگاری منی جگە لە تۆ هیچ پەرستراوی دیکە نیە (بەهەق)، وە تۆ منت دروست کردووەو من بەندەی تۆم، وە من تا بتوانم لەسەر بەڵێنو پەیمانەکەمم کە بە تۆم داوە، پەنا دەگرم بە تۆ لە خراپەی کردەوەی خۆم، وە دان دەنێم بە نیعمەتەکانت لەسەرمو دان دەنێم بە گوناهەکانم دا، لێم خۆشبە، بێگومان جگە لە تۆ کەس (بۆی نیە گوناهی بەندەکانت) خۆشبێ، وە هەر کەسێك لە ڕۆژدا ئەوە بڵێ، وە بەدڵیش باوەڕی تەواوی پێی هەبێت وە پێش هاتنی شەو لەو ڕۆژەدا بمرێ ئەو کەسە بەهەشتیە. وە هەرکەس لە شەوەدا ئەوە بڵێ، وە بەدڵیش باوەڕی تەواوی پێی هەبێت، وە پێش هاتنی ڕۆژ لەو شەوەدا بمرێ ئەوە بەهەشتییە.

{عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الأَنْصَارِيِّ، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: «النَّدَمُ تَوْبَةٌ، وَالتَّائِبُ مِنَ الذَّنْبِ كَمَنْ لاَ ذَنْبَ لَهُ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**(٢)

---

١) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٥٩٤٧))

٢) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي (الكَبِيرِ): (٧٧٥)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٦٨٠٣))

واتە: ئەبوو سەعیدی ئەنصاریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پەشیمانی: تۆبەکردنو گەڕانەویە لە گوناح، وە ئەو کەسەی تۆبە دەکاتو دەگەڕێتەوە لە گوناح وەك ئەو کەسە وایە کە هیچ گوناهی نەکردوە.

## بەسەرهاتێك لەم بارەیەوە [١]

ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە، کە فەرموویەتی: دوو پیاو لە بەنی ئیسرائیل هەبوون، یەکێکیان گوناهکار بوو، ئەویدیکەشیان بەردەوام سەرگەرمی خواپەرستی بوو، وە ڕۆژێك پیاوە گوناهکارەکەی دەبینێ لە کاتی ئەنجامدانی گوناح، پێی گوت: وازبێنە، بەسە هیچکە گوناح مەکە، گوناهکارەکەش پێی گوت: وازم لێ بێنە بۆ پەروەردگارم، ئەو بۆ خۆی زیندووم دەکاتەوەو بەسەریشم چاودێرە، کابرای خواپەرستیش گوتی: وەڵلاهی هەرگیز خوا لە تۆ خۆشنابێو لێت نابووری، یان هەرگیز خوا ناتخاتە نێو بەهەشت، کە هەردووکیان ڕووحیان کێشراو مردن، بردرانە بەردەستی خوای دادگەر، خوا بەو پیاوەی خواپەرست بوو، فەرمووی: ئایا تۆ بەوەی من دەمەوێ بیکەم زانای (واتە: ئایا تۆ غەیب زانی) یاخود ئەوەی لە ژێر دەستی من دایە تۆ توانات بەسەری دا هەیە (واتە: ئایا تۆ لە جیاتی من دەتوانی خەڵکی ببوری، یان نەیانبوری)؟! بۆیە: بە پیاوە گوناهکارەکەی گوت: بڕۆ بەهەشت بە هۆی ڕەحمەتو بەزەیی منەوە، وە بە پیاوەکەی دیکەشی فەرموو: بڕۆ نێو ئاگرەوە.

جا ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، کە ئەو بەسەرهاتەی دەگێڕاوە، دەیگوت: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە تەنیا یەك وشەی گوت: دنیاو دوارۆژی لە دەست چووا!!

---

[١] (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (٤٩٠٣)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٤٤٥٥))

## چۆنیەتی تۆبەکردن[1]

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {مَا مِنْ رَجُلٍ يُذْنِبُ ذَنْباً، ثُمَّ يَقُومُ فَيَتَطَهَّرُ، ثُمَّ يُصَلِّي، ثُمَّ يَسْتَغْفِرُ اللهَ إِلاَّ غَفَرَ لَهُ} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[2]

واتە: هەرکەسێك تاوانێك بکات، پاشان هەستێ خۆی پاك بکاتەوە، خۆی بشوات یان دەست نوێژێ بگرێ - ئنجا دوو ڕکات نوێژ بکات، دوایی داوای لێ خۆش بوون لەخوا بکات، بێگومان خوا دەیبەخشێ.

کەواتە: خوێنەری شیرین، مسوڵمانی بەرێز، ئەگەر دەتەوێ ڕێگای صالح بوون‌و بەرەو خوا چوون بگری! هەنگاوی یەکەمت ئەوەیە کە بە نیازی تۆبە کردن‌و گەڕانەوە لای خوا، خۆت بشۆی، یان ئەگەر بۆت ڕێ نەکەوت خۆت بشۆی دەست نوێژێکی پوخت بگری، ئنجا دوو ڕکات نوێژی تۆبە بکە.

دوایی هەتا دەتوانی سوپاس‌و ستایشی خوا بکەو صەڵات‌و سەلام بۆ پێغەمبەر ﷺ بنێرە، ئنجا چاو بە ڕابردووی خۆت دا بگێڕەو هەموو ئەو تاوان‌و خراپانەی کە بە دڵ‌و زمان‌و چاو و گوێ‌و دەست‌و لاق‌و زارو گەدەو...هتد کردووتن وەبیر خۆتیان بێنەوەو، بە گەردنی کەچ‌و ڕووی زەردو چاوی فرمێسکاوی‌و دەنگێکی کزو بەلالانەوەو کرووزانەوەو فرمێسك باراندنەوە دەست بەرز بکەوەو بڵێ:

(أ)- خوایە من لە هەموو ئەو تاوان‌و خراپانەوە زۆری دیکەش کە من یان لە یادم نەماون یان هەر نەمزانیون، کردوومن‌و لێیان پەشێمانم‌و دان بە هەڵەو ناتەواویی خۆمدا دێنم، بەڵام لێم ڕوونە کە تاوان‌و خراپەکانم هەرچەندە زۆربن، لێبووردنی تۆ زۆرترەو، هەرچەندە گەورە بن، بەزەیی تۆ مەزنترە، جا خوایە داوای لێبووردن‌و چاو پۆشیت لێ دەکەم‌و تۆش نائومێدم مەکەو بە لوتف‌و بەزەیی خۆت بمبوورە،

---

١) ڕێگای صالح بوون‌و بەرەو خوا چوون چاپی پێنجەم، نووسینگەی تەفسیر.
٢) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٤٠٦)، وَقَالَ: حَدِيثٌ صَحِيح، وَابْنُ حِبَّانَ: (٦٢٣)، وَحسَّنَهُ الألباني في (المشكاة): (١٣٢٤)، عَن أَبي بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)

چونکە ئەگەر منیش شیاوی بەخشران نەبم، تۆ شایستەی لێبوردن‌و بەخشینی!! تۆش بەمیهرەبانی‌و بەخشندەیی خۆت من ببەخشەو مافی خەڵکیم لەسەر لابەرەو لە چڵك‌و چەپەری ئەو جۆرە خراپەو گوناحانە قوتارم بکە.

(ب)- دوایی هەوڵبدە هەرکەسێك کە بەهەر شێوەیەك زیانت لێداوەو دڵت ئازارداوە، داوای لێبوردن‌و گەردن ئازایی لێ بکەی‌و، ئەگەر بگونجێ‌و بزانی پتر نابێ، دەقی ئەو ئازارو زیانەشی بۆ بگێڕەوە، ئەگەر نا پێویست ناکات.

(ج)- وە هەوڵبدە ماڵی هەر خاوەن مافێکی زیندووت لەلایە بیدەوە، ئەگەر مردبیش بیدەیەوە میراتگرەکانی، ئەگەر نەشگونجاو مسوڵمانانیش (بيت المال)ێکی ڕاستەقینەیان هەبوو، بۆی بخە (بيت المال)ەوە، ئەگەر نەشبوو بۆی بکە بەخێرو چاکەو بۆی ببەخشە.

**جا مسوڵمانی بەڕێز:**

ئەگەر ئەو شتانەی گوتران هەموویان یەك بە یەك‌و موو بەموو جێبەجێ بکەی، ئەوە مسۆگەرو دڵنیابە ئەگەر بێت‌و بە دڵێکی ڕاست‌و ساغ ئەو تۆبەیەت کردبێ‌و، بێجگە لە ڕازی کردنی خواو لەخوا نزیك بوونەوە هیچی دیکەت لەدڵ نەگرتبێ، ئومێد وایە کە تاوان‌و خراپەکانت هەر چۆنێکی‌و هەر چەندێکی بن، خوای میهرەبان بە ئاوو تەرزەو بەفری لووتف‌و بەخششی خۆی لێت بشوات‌و، وەك قوماشێکی سپی چاك شۆراو پاك ببیتەوە.

چونکە پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ فەرموویەتی: {التَّائِبُ مِنَ الذَّنْبِ كَمَنْ لاَذَنْبَ لَهُ} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[1]

واتە: تۆبەکەر لە تاوان وەك ئەو کەسە وایە کە تاوانی نین.

---

[1] (رَوَاهُ ابْنُ مَاجَةْ: (٤٢٥٠)، وَالبَيْهَقِي في (شعب الإيمان): (٧١٧٨) وَرِجَالُهُ ثِقَات عَنْ عُبيدةَ بْنِ عَبْدِاللهِ عَن أبيه، وَحَسَّنَهُ الألباني في (صَحيح ابْنُ مَاجَة): (٣٤٢٧))،

# پایەو پاداشتی

## زیکری نووستن‌و لە خەو هەڵسان

{عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِذَا أَتَيْتَ مَضْجِعَكَ، فَتَوَضَّأْ وُضوءَكَ لِلصلاَةِ، ثُمَّ أَضْطَجِعْ عَلَى شِقِّكَ الأَيْمَنِ، ثُمَّ قُلْ: اللَّهُمَّ! أَسْلَمْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وَأَلْجأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، لاَ مَلْجَأَ وَلاَ مَنْجَا مِنْكَ إِلاَّ إِلَيْكَ، اللَّهُمَّ! آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ، وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ، فَإِنْ مُتَّ مِنْ لَيْلَتِكَ فَأَنْتَ عَلَى الْفِطْرَةِ وَاجْعَلْهُنَّ آخِرَ مَا تَتَكَلَّمُ بِهِ»} **حديثٌ صَحيحٌ**[1]

واتە: بەڕائی کوڕی عازیب خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر چوویتە سەر جێگاکەت، دەستنوێژی نوێژ بشۆرەو، پاشان لەسەر لای ڕاستت ڕابکشێ‌و ئنجا بڵێ: خوایە نەفسم تەسلیمی تۆ کردو کاروباری خۆم دایە دەستی تۆ، وە ڕووم کردە تۆو پشتم بەست بە تۆ، بەپێ خۆشبوون‌و حەز پێکردن‌و بە ترسان لە تۆ، هیچ حەشارگەو شوێنی ڕزگار بوونێك نیە مەگەر بۆ لای تۆ، بڕوام هێناوە بە کتێبەکەت کە داتبەزاندۆتە خوارەوە، وە بە پێغەمبەرەکەت کە ڕەوانەت کردوە، ئەگەر ئەو شەوە بمرێ ئەوە لەسەر فیطرەت مردوە، وە کۆتا شتێکیش بێ کە دەیڵێیت.

{عَنْ حُذَيْفَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِذَا أَخَذَ مَضْجِعَهُ مِنَ اللَّيْلِ وَضَعَ يَدَهُ تَحْتَ خَدِّهِ ثُمَّ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ! بِاسْمِكَ أَمُوتُ وَأَحْيَا»، وَإِذَا اسْتَيْقَظَ قَالَ: «الْحَمْدُ للهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ»} **حَديثٌ صَحيحٌ**[2]

واتە: حوزەیفە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر لە شەودا بچووبایە سەر جێگاکەی دەستی ڕاستی دەخستە ژێر ڕوومەتی‌و پاشان دەیفەرموو: ئەی خوایە! بە ناوی تۆوە دەمرم‌و دەژیم، وە ئەگەر بە ئاگا بهاتایە لە خەو دەیفەرموو: سوپاس‌و ستایش بۆ ئەو خوایەی ژیاندینی دوای ئەوەی مراندنی، گەڕانەوەش بۆ لای ویە.

---

١) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ: (٢٤٤) وَاللَّفْظُ لَهُ، وَمُسْلِمٌ: (٧٠٥٧))

٢) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٥٩٥٥))

# پایەو پاداشتی

## زیکری لە خەو هەڵسان

{عَنْ عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنْ رَسُولِ الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «مَنْ تَعَارَّ مِنْ اللَّيْلِ، فَقَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، وَسُبْحَانَ اللهُ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَاللهُ أَكْبَرُ، وَلاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ الاَّ بِاللهِ، ثُمَّ قَالَ: رَبِّ اغْفِرْ لِي أَوْ قَالَ، ثُمَّ دَعَا اسْتُجِيبَ لَهُ فَإِنْ عَزَمَ فَتَوَضَّأَ ثُمَّ صَلَّى قُبِلَتْ صَلاَتُهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[١]

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك شەو بە ئاگا هات (لە خەو)، بڵێ: هیچ پەرستراوێك نیە (بە هەق) جگە لە خوا، تاکی بێ هاوەڵە، هەرچی موڵك و سوپاس و ستایشە هەر بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێکدا بە توانایە، پاکی بۆ خواو سوپاس و ستایش بۆ خوا، وە هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە (الله)، خوا گەورەترە، وە هیچ گۆڕان و هێزێك نیە مەگەر بە خوای بەرزی مەزنەوە، پاشان (بپاڕێتەوە) و بڵێ: پەروەردگارم لێم خۆشبە، (خوا لێی خۆش دەبێ)، یان دووعا بکات وەڵامی دەدرێتەوە، وە ئەگەر دەست نوێژ بگرێت و نوێژ بکات نوێژەکەی وەردەگیرێ.

---

١) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (١١٠٣))

# پایەو پاداشتی

## زیكرەكانی ئێواران و بەیانیان

{عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ سَيِّدُ الاسْتِغْفَارِ أَنْ تَقُولُ: «اللَّهُمَّ! أَنْتَ رَبِّي لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ، وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي، فَإِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلاَّ أَنْتَ، قَالَ: وَمَنْ قَالَهَا مِنَ النَّهَارِ مُوقِناً بِهَا، فَمَاتَ مِنْ يَوْمِهِ قَبْلَ أَنْ يُمْسِي، فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الجنة، وَمَنْ قَالَهَا مِنَ اللَّيْلِ وَهُوَ مُوْقِنٌ بِهَا، فَمَاتَ قَبْلَ أَنْ يُصْبِحَ ، فَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[1]

واتە: شەددادی كوڕی ئەوس خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: گەورەترین و چاكترین پاڕانەوەو داوای لێخۆش بوون كردن ئەوەیە، كە (بەندە) بڵێ: ئەی خودایە، تۆ پەروەردگاری منی، جگە لە تۆ هیچ پەرستراوی دیكە نیە (بە هەق)، وە تۆ منت دروست كردووەو من بەندەی تۆم، وە من تا بتوانم لەسەر بەڵێن و پەیمانەكەمم كە بە تۆم داوە، پەنا دەگرم بە تۆ لە خراپەی كردەوەی خۆم، وە دان دەنێم بە نیعمەتەكانت لەسەرم و دان دەنێم بە گوناهەكانم دا، لێم خۆشبە، بێگومان جگە لە تۆ كەس (بۆی نیە لە گوناهی بەندەكانت) خۆشبێ، وە هەر كەسێك لە ڕۆژدا ئەوە بڵێ، وە بەدڵیش بڕوای تەواوی پێی هەبێت وە پێش هاتنی شەو لەو ڕۆژەدا بمرێ ئەو كەسە بەهەشتیە. وە هەركەس لە شەودا ئەوە بڵێ، وە بەدڵیش بڕوای تەواوی پێی هەبێت، وە پێش هاتنی ڕۆژ لەو شەوەدا بمرێ ئەوە بەهەشتییە.

---

١) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٥٩٤٧))

{عَنْ أَبِي عَيَّاشٍ الزُّرَقِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، كَانَ لَهُ عَدْلَ رَقَبَةٍ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيل، وَحُطَّ عَنْهُ عَشْرُ خَطِيئاتٍ، وَرُفِعَ لَهُ عَشْرُ دَرَجَاتٍ، وَكَانَ فِي حِرْزٍ مِنَ الشَّيطَانِ حَتَّى يُمْسِي، وَإِذَا أَمْسَى فَمِثْلُ ذَلِكَ حَتَّى يُصْبِحَ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[1]

**واتە: ئەبی عییاشی زورەقیی خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك لە بەیانی دا بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيْكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) ئەوە بە ئەندازەی ئازاد کردنی کۆیلەیەك لە نەوەی ئیسماعیل (علیه السَّلام) پاداشتی بۆ دەنووسرێ، وە دە گوناهی لەسەر دەسڕدرێتەوەو دە پلەش بەرز دەکرێتەوە، وە پارێزەرێکی بۆ دەبێ دەیپارێزێ لە شەیتان تاکو ئێوارەی لێ دەبێتەوە، وە ئەگەر ئێوارەش داهات بە هەمان شێوە تاکو بەیانی دەپارێزرێ ئەگەر ئەم زیکرەی کرد.**

{عَنْ عُثْمَانَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَنْ قَالَ: بِاسْمِ اللهِ الَّذِي لاَ يَضُرُ مَعَ اسْمِهِ شَيْءٌ، فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاءِ، وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيم ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، لَمْ تُصِبْهُ فَجْأَةُ بَلاَءٍ حَتَّى يُصْبِحَ، وَمَنْ قَالَهَا حِينَ يُصْبِحُ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، لَمْ تُصِبْهُ فَجْأَةُ بَلاَءٍ حَتَّى يُمْسِي»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[2]

**واتە: عوسمان خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێك سێ جاران بڵێ: (بِاسْمِ اللهِ الَّذِي لاَ يَضُرُ مَعَ اسْمِهِ شَيْءٌ، فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاءِ، وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيم)، واتە: بە ناوی ئەو خوایەی کە لەگەڵ ناوی ئەودا هیچ شتێك زیان ناگەیەنێ، نە لە زەوی و نە لە ئاسمان وە ئەو بیسەری**

---

[1] (رَوَاهُ أَحْمَد: (١٦٦٣٣)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٦٥٦))

[2] (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (٥٠٩٠)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح إبنُ مَاجَهْ): (٣٨٦٩))

زانایە، ئەوە تووشی هیچ بەڵایەكی لە ناكاو نابێ تاكو بەیانی، وە هەر كەسێك بەیانی وا بڵێ، تووشی هیچ بەڵایەكی لە ناكاو نابێ تاكو ئێوارە.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: لَدَغَتْ عَقْرَبٌ رَجُلاً فَلَمْ يَنَم لَيْلَتَهُ، فَقِيْلَ لِلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إِنَّ فَلاَناً لَدَغَتْهُ عَقْرَبٌ فَلَمْ يَنَمْ لَيْلَتَهُ، فَقَالَ: «أَمَا إِنَّهُ لَوْ قَالَ حِينَ أَمْسَى: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ، مَا ضَرَّهُ لَدْغُ عَقْرَبٍ حَتَّى يُصْبِحَ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[1]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: دووپشكێك پیاوێكی گەستبوو، كە ئەو شەوە خەوی لێ نەكەوتبوو، بە پێغەمبەر ﷺی گوت، فلان كەس ئەم شەو دوو پشك پێوەی داوەو نەنوستوە (پێغەمبەری خواش ﷺ) فەرمووی: ئەگەرهاتباو لە كاتی ئێوارە بیگووتبا: (أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ)، واتە: پەنا بە خوا دەگرم لە خراپەی ئەوەی دروستی كردوە، گەستنی ئەو دووپشكە زیانی پێنەدەگەیاند تاكو بەیانی.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ قَالَ حِينَ يُمْسِي: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ ثَلاَثُ مَرَّاتٍ لَمْ تَضُرَّهُ حَيَّةٌ إِلَى الصَّبَاحِ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[2]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك لە كاتێك ئێوارە دەكاتەوە سێ جاران بڵێ: (أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللهِ التَّامَاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ)، واتە: پەنا بە خوا دەگرم لە خراپەی ئەوەی دروستی كردوە، هیچ مارێك (زیندەوەرێك) زیانی پێناگەیەنێ تاكو بەیانی دادێ.

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٧٠٥٥)، وَابْنُ مَاجَهْ: (٣٥١٨)، وَاللَّفْظُ لَهُ، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع): (١٣٢٤))

٢) (رَوَاهُ ابْنُ حِبَّانَ: (١١٨)، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم)

{عَنْ المنيذِرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَنْ قَالَ إِذَا أَصْبَحَ رَضِيتُ بِاللهِ رَبّاً وَبِالإِسْلاَمِ دِيناً، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيّاً فَأَنَا الزَعِيمُ لآخُذَنَ بِيَدِهِ حَتَّى أُدْخِلَهُ الجَنَّةَ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[1]

**واتە: مەنذیر (کە یەکێکە لە هاوەڵان) خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: هەر مسوڵمانێك لە کاتی بەرەبەیاندا گوتی: ڕازیم خوا پەروەردگارم بێ، ئیسلام ئایین و بەرنامەم بێ، موحەممەدیش پێغەمبەرم بێ، ئەوە من گرەنتی ئەوەی دەدەمێ دەستی بگرم هەتا دەیبەمە بەهەشتێ.**

## قورئان خوێندن پێش نووستن

{عَنْ الْعِرْبَاض بْنِ سَارِيَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) «كَانَ لاَ يَنَامُ حَتَّى يَقْرَأَ الْمُسَبِّحَاتِ، وَيَقُولُ: «فِيهَا آيَةٌ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ آيَةٍ»} **حديثٌ حَسَنٌ**[2]

**واتە: عیرباضی کوڕی ساریە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نەدەخەوت تاکو سوورەتەکانی (مُسَبِّحَاتِ)ی نەخوێند بایە، (کە بریتین لە: الإسرَاء، الحَدِيد، الحَشْر، الصَّف، الجُمُعَةَ، التَغَابُن، الأَعْلَى)، وە دەیفەرموو: ئەو سوورەتانە: ئایەتێکیان تێدایە خێری زیاترە لە هەزار ئایەت.**

{عَنْ نَوْفَل الأَشْجَعِي رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لِنَوْفَل: «اقْرَأْ: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾، ثُمَّ نَامْ عَلَى خَاتِمَتِهَا، فَإِنَّهَا بَرَاءَةٌ مِنَ الشِّرْكِ»} **حديثٌ صَحِيح**[3]

---

[1] (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ: (٨٣٨)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٣٣٤))

[2] (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٣٤٠٦)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صَحِيح سُنَن التِّرمِذِيُّ))

[3] (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (٥٠٥٥)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٢٩٢))

**واتە: نەوفەلی ئەشجەعی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾، بخوێنەو تەواوی بکە، ئنجا بخەوە، چونکە بێگومان دەبێتە بەڕائەت بۆ لە هاوبەش بۆ خوا پەیداکردن.**

{عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) «لَا يَنَامُ حَتَّى يَقْرأُ: بـ ﴿تَنْزِيلُ﴾، السَّجْدَةِ، وبـ ﴿تَبَارَكَ﴾»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[1]

**واتە: جابیرِی کوڕی عەبدوڵلا خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نەدەخەوت هەتاکو سووڕەتی (الْمُلْك) و سووڕەتی: (السجدة)ی دەخوێند.**

{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) «لَا يَنَامُ حَتَّى يَقْرأُ: ﴿الزُّمَرَ﴾، و ﴿بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[2]

**واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ نەدەخەوت هەتاکو سووڕەتی (الزُّمَرَ)و سووڕەتی: (بَنِي إِسْرَائِيلَ)ی دەخوێند.**

---

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٣٤٠٤)، وَصَحَّحَهُ العَلَّامَة الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٥٨٥))

٢) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٣٤٠٥)، وَصَحَّحَهُ العَلَّامَة الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٦٤١))

# پایـەو پاداشـتی

## زیکری چوونە مزگەوت

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ كَانَ إِذَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ قَالَ: «أَعُوذُ بِاللهِ الْعَظِيمِ، وَبِوَجْهِهِ الْكَرِيمِ، وَسُلْطَانِهِ الْقَدِيمِ، مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ»، قَالَ: فَإِذَا «قَالَ ذَلِكَ قَالَ: الشَّيْطَانُ حُفِظَ مِنِّي سَائِرَ الْيَوْمِ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[١]

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ دەچووە نێو مزگەوت دەیفەرموو: (أَعُوذُ بِاللهِ الْعَظِيمِ، وَبِوَجْهِهِ الْكَرِيمِ، وَسُلْطَانِهِ الْقَدِيمِ، مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ)، وە دەیفەرموو: ئەگەر ئەو (زیکرە) گوترا ئەوە شەیتان دەڵێ هەموو ئەمڕۆ بە تەواوی لە من پارێزراوە.**

# پایەو پاداشتی

## زیکـری دەرچوون لە ماڵ

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِذَا خَرَجَ الرَّجُلُ مِنْ بَيْتِهِ فَقَالَ: بِسْمِ اللهِ تَوَكَّلْتُ عَلَى اللهِ لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ»، قَالَ: «يُقَالُ حِينَئِذٍ: هُدِيتَ وَكُفِيتَ وَوُقِيتَ، فَيَتَنَحَّى لَهُ الشَّيَاطِينُ فَيَقُولُ لَهُ شَيْطَانٌ آخَرُ: كَيْفَ لَكَ بِرَجُلٍ قَدْ هُدِيَ وَكُفِيَ وَوُقِيَ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[٢]

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر پیاوێك لە ماڵ بێتە دەرو بڵێ: (بِسْمِ اللهِ تَوَكَّلْتُ عَلَى اللهِ لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ) واتە: خوایە پشتم بە تۆ بەستو هیچ گۆڕان‌و توانایەك نیە مەگەر بە خوای زاڵی خاوەن تواناوە، ئەوە لەو کاتەدا پێ دەگوترێ: هیدایەت درایت‌و کیفایەت کرایت‌و**

---

١) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٦٦)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (المشكاة): (٧٤٩))

٢) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (٥٠٩٧) وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٤٩٩))

پارێزرایت، وە شەیتانەکانی لێ دوور دەخرێنەوە، وە شەیتانێکی دیکە دەڵێ: تۆ چ دەستەڵاتێکت هەیە بەسەر کەسێك دا کە هیدایەت درابێت‌و کیفایەت کرابێت‌و پارێزرابێت.

{عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: مَا خَرَجَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ بَيْتِي قَطُّ إِلاَّ رَفَعَ طَرْفَهُ إِلَى السَّمَاءِ، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ! إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَضِلَّ أَوْ أُضَلَّ، أَوْ أَزِلَّ أَوْ أُزَلَّ، أَوْ أَظْلِمَ أَوْ أُظْلَمَ، أَوْ أَجْهَلَ أَوْ يُجْهَلَ عَلَيَّ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتە: ئوممو سەلەمە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: هیچ کاتێك نەبووە پێغەمبەر ﷺ بچێتە دەر لە ماڵ ئیللا ڕوویی دەکردە ئاسمان‌و دەیفەرموو: خوایە پەنات پێدەگرم لەوەی خەڵك گومڕا بکەم، یان گومڕا بکرێم، هەڵە بکەم یان هەڵەم لەگەڵ بکرێ، ستەم بکەم یان ستەمم لێ بکرێ، یان نەفامیی بکەم نەفامییم لەگەڵ دا بکرێ.**

## پایەو پاداشتی
## زیکر کردن لە کاتی چوونەوە ماڵ

{عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «إِذَا دَخَلَ الرَّجُلُ بَيْتَهُ، فَذَكَرَ اللهَ عِنْدَ دُخُولِهِ وَعِنْدَ طَعَامِهِ، قَالَ الشَّيْطَانُ: لاَ مَبِيتَ لَكُمْ وَلاَ عَشَاءَ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

**واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا خوا لێی ڕازی بێ، بیستوویەتی لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: ئەگەر پیاوێك چووە ماڵەوەو زیکری خوای پەروەردگاری کرد لە کاتی چوونە ژوورەوەو لە کاتی نان خواردن دا، ئەوە شەیتان (بە هاوەڵەکانی) دەڵێ: لێرە نە جێگەو نە شێوو خواردنتان نیە.**

---

١) (رَوَاهُ أَبُو دَوُدَ: (٥٠٩٤) وَاللَّفْظُ لَهُ، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (المشكاة: (٢٤٤٢))

٢) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٥٣٨١))

# پـایەو پـاداشتـی

## پاڕانەوە: (الدُعَـاء)

خوای پەروەردگار زۆر جەختی لەسەر دووعاکردنی بەندەکانی کردۆتەوە، وە زۆری پێخۆشە بەندەکانی لێی بپاڕێنەوەو داوای لێبکەن، بۆیەش فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِى وَلْيُؤْمِنُواْ بِى لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾﴾ البقرة

واتە: وە هەر کاتێك بەندەکانم لەبارەی منەوە پرسیاریان لێکردی (واتە: لە تۆ ئەی موحەممەد ﷺ) ئەوە (با بزانن کە) من نزیکم، وەڵامی داواکەر دەدەمەوە هەرکات لێم بپاڕێتەوە، دەجا با ئەوانیش بە دەنگمەوە بێن‌و بڕوام پێ بێنن، بەڵکو سەر ڕاست بن.

خوا سبحانە وتعالی زۆر بە مسۆگەریی دەفەرموێ: من وەڵامی داوای داواکەر دەدەمەوە ئەگەر لێم پاڕایەوە، لێرەدا یەکێك بۆی هەیە بڵێ: ئەدی بۆچی زۆر کەس دەپاڕێتەوە لە خواو ئەو شتەش کە بۆی دەپاڕێتەوە جێبەجێ نابێ؟

دەڵێین: فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ هەیە، ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە وەڵامدانەوەی خوا بۆ پاڕانەوەی بەندەکانی هەر یەك شێوە نیە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَدْعُو بِدَعْوَةٍ لَيْسَ فِيهَا إِثْمٌ وَلاَ قَطِيعَةُ رَحِمٍ، إلاَّ أَعْطَاهُ اللهُ بِهَا إِحْدَى ثَلاثٍ: إِمَّا أَنْ تُعَجَّلَ لَهُ دَعْوَتُهُ، وَإِمَّا أَنْ يَدَّخِرَهَا لَهُ فِي الآخِرَةِ، وَإِمَّا أَنْ يَصْرِفَ عَنْهُ مِنَ السُّوءِ مِثْلَهَا} **حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ**[1]

---

[1] (رَوَاهُ أَحْمَد: (١١١٤٩)، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدريّ، وَقَالَ الشيخ الألباني: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، أنظر: (صَحيح الترغيب والترهيب): (١٦٣٣))

واتە: هیچ مسوڵمانێك نیە لە خوا بپاڕێتەوە بە پاڕانەوەیەك، پاڕانەوەکە لە خودی خۆیدا گوناح نەبێت، وە مایەی پچڕانی پەیوەندی خزمایەتی نەبێ، ئەوە خوا یەکێك لەو سێ شتانە بۆ ئەو بەندەیەی خۆی دەکات:

(١)- یان ئەوەتا ئەو شتەی داوای دەکات یەکسەر بۆی جێبەجێدەکات.

(٢)- یاخود بۆی هەڵدەگرێو پاداشتەکەی لە دوارۆژدا دەداتەوە.

(٣)- یان بە قەدەر ئەو شتە باشەی کە داوای کردوە، خراپەیەکی لێ لادەدات، بۆ وێنە: (داوای شتێکی باشی کردوە، خوا شتە باشەکەی بۆ ناکات حیکمەتی خوا وا ناخوازێ کە ئەم کارەی بۆ بکات، بەڵام بە قەدەر ئەو شتە باشە یاخود زیاتریش خوا خراپەو بەلای لێ لادەدات).

ئەم فەرموودەیە ئەوە دەگەیەنێ کە ئینسان کاتێك کە لە خوا دەپاڕێتەوەو خوا یەکسەر وەڵامی ناداتەوە، واتە: وەڵامەکە نابینێ با نائومێد نەبێ، وەك: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {يُسْتَجَابُ لأَحَدِكُمْ مَا لَمْ يَعْجَلْ، يَقُولُ: دَعَوْتُ فَلَمْ يُسْتَجَبْ لِي} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: یەکێك لە ئێوە وەڵامی دەدرێتەوە، ئەگەر پەلە نەکات، دەڵێ: لە خوا پاڕامەوە بەڵام وەڵامی نەبوو و شتەکەی بۆ نەکردم. با پەلە نەکات چونکە خوا سبحانەوتعالی لەو کاتەدا کە خۆی بە بەرژەوەندیی دەزانی بۆ بەندەی خۆی، وە ئەو شتەی کە بۆ خۆی بە چاکی دەزانێ، ئاوا وەڵامی دەداتەوە، نەك ئەوەی کە ئەو دەیەوێ، چونکە ئینسان جاری وایە شتێك لە خوا داوا دەکات، ئەگەر بۆی بکات زەرەری لێ دەکات، بۆ وێنە: جاری

---

١) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٥٩٨١)، وَمُسْلِمٌ: (٧١١٠)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)

وایە باب یان دایك لە منداڵێکی خۆی تووڕە دەبێ، یان کەسێك لە خزمێکی نیگەران دەبێ و دووعای خراپی لێ دەکات، جا ئەگەر خوا یەکسەر بۆی بکات، ڕەنگە پەشیمان بێتەوە، بۆیە بۆی ناکات، کەواتە: دەبێ ئینسان نائومێد نەبێ، کاتێ کە ڕاستەوخۆ وەڵامی پاڕانەوەکەی نابینێ، بەڵکو دڵنیابێ لەوەی کە خوا پاڕانەوەکەی دەبیستێ، وە بە یەکێك لەو سێ حاڵەتە داوایەکەی بۆ جێ بە جێ دەکات، بەڵام ئێستا یەکسەرنا دوایی لەو کاتەدا کە خوا دەیەوێ، یاخود خراپەی لێ لادەدات، یان لە قیامەتێ پاداشتی دەداتەوە.

وە دووعا گەورەترین جۆری عیبادەتەو زۆرترین پاداشتی لە نێو خۆدا هەڵگرتوە، چونکە سوننەتی هەموو پێغەمبەران بووە، سەلامی خوایان لەسەر بێ، وە وەك خوای زاناوشارەزا دەربارەیان دەفەرموێ:

﴿إِنَّهُمْ كَانُوا۟ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ وَيَدْعُونَنَا رَغَبًا وَرَهَبًا ۖ وَكَانُوا۟ لَنَا خَٰشِعِينَ ﴿٩٠﴾﴾ الأنبياء.

ئنجا ئەگەر سەیری قورئان بکەین دەبینین خوای پەروەردگار بە ئارەزوودانەبەر وەسفێکی زۆر جوانی ئەو کەسانە دەکات کە دووعا دەکەن، وەك فەرموویەتی: ﴿تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾﴾ السجدة

واتە: تەنیشتیان دوور دەکەوێتەوە لە جێگای خەوتنیان (لە خەو هەڵدەستن و شەو نوێژ دەکەن)، هاوارو نزا لە پەروەردگاریان دەکەن بە ترس و هیواوە، وە لەو ڕزق و ڕۆزییەی پێمان داون دەبەخشن . ئنجا هیچ

کەس نازانێ چی شاراوەتەوە بۆیان لە (بەهەشت دا کە هۆی) گەشبوونی چاوانن ئەم پاداشتە (دەدرێنەوە) بە هۆی ئەو کردەوانەی کە کردوویانە.

وە لە کۆتاییش دەڵێم: دووعا کردن سیفەتی ئەهلی بەهەشتیەکانە، وەك خوای پەنهانزان لەسەر زاری بەهەشتیەکان دەفەرموێ:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ يَهۡدِيهِمۡ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمۡۖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٩﴾ دَعۡوَىٰهُمۡ فِيهَا سُبۡحَٰنَكَ ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمۡ فِيهَا سَلَٰمٞۚ وَءَاخِرُ دَعۡوَىٰهُمۡ أَنِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠﴾﴾ یونس،

{عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «الدُّعَاءُ هُوَ الْعِبَادَةُ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾﴾} غافر: حَدِيثٌ صَحِيحٌ[1]

واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: بیستم پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: پاڕانەوە خودی خوا پەرستییە. واتە: بەشێکی گەورەو گرنگی خوا پەرستیی بریتیە لە پاڕانەوە لە خوا) پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡ...﴾، واتە: ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان فەرموویەتی: ئێوە هاناو هاوار بۆ من بێنن، ئەوە من دووعاو نزاتان قبووڵ دەکەم...

{عَنْ سَلْمَانَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لاَ يَرُدُّ الْقَضَاءَ إِلاَّ الدُّعَاءُ، وَلاَ يَزِيْدُ فِي الْعُمُرِ إِلاَّ الْبِرُّ»} حَدِيثٌ حَسَنٌ[2]

---

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٣٢٤٧)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (١٦٢٧))

٢) (رَوَاهُ أَحْمَد: (١٨٣٧٨)، عَنْ ثَوبَان، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٥٤)، دُونَ وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيُحَرم...)

واتە: سەلمانی فارسی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ شتێك قەدەری خوا ڕەت ناکاتەوە جگە لە دووعا، (دووعا قەدەر ڕەت دەکاتەوە، چونکە دووعاش بەشێکە لە قەدەری خوا: خوای پەنهانزان شتێکی بڕیارداوە کە ئەو شتە ببێ، لە هەمان کاتدا بڕیاریشی داوە، کە ئەگەر ئەو بەندەیە دووعای کرد ئەو شتە نابێ)، وە هیچ شتێك تەمەن زیاد ناکات جگە لە چاکەکاریی.

{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لاَ يُغْنِي حَذَرٌ مِنْ قَدَرٍ، وَالدُّعَاءِ يَنْفَعُ مِمَّا نَزَلَ وَمِمَّا لَمْ يَنْزِلْ، وَإِنَّ البَلاَءِ لَيَنْزِلُ، فَيَتَلَقَّاهُ الدُّعَاءُ، فَيَعْتَلِجَانِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**(١)

واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ سوودی نیە وریا بوون‌و حەزەر کردن لە قەدەر، وە دووعا سوودی هەیە بۆ ئەوەی نێرراوەتە خوارو ئەوەی نەنێرراوەتە خوار، وە بێگومان بەڵاو موصیبەت دێتە خوار لەگەڵ دووعا بەیەك دەگەن، ململانێ دەکەن هەتا ڕۆژی دوایی، (واتە: ئەم دووعایە ئەو بەڵاو موصیبەتە ڕادەگرێ‌و، وا دەکات جێبەجێ نەبێ).

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) «لَيْسَ شَيْءٌ أَكْرَمَ عَلَى اللهِ سُبْحَانَهُ مِنَ الدُّعَاءِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**(٢)

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ شتێك نیە لە دووعاو پاڕانەوە کردن بەڕێزتربێ لەلایەن خوای پاك‌و بێگەرد، (دیارە ئینسانیش کە دووعا دەکات بە ئەندازەی شەرعیی بوون‌و نواندنی ئەدەب تێدا ڕێزی لەلای خوا دەبێ).

{عَن أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَسْتَجِيبَ اللهُ لَهُ عِنْدَ الشَّدَائِدِ وَالْكَرْبِ فَلْيُكْثِرْ الدُّعَاءَ فِي الرَّخَاءِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**(٣)

---

١) (رَوَاهُ الحَاكِمُ: (٢٨١٣)، (١٨١٣)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٧٧٣٩))

٢) (رَوَاهُ ابنُ مَاجَهْ: (٣٨١٩)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح سُنَن ابن مَاجَهْ): (٣٠٨٧))

٣) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٣٣٨٢)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٥٩٣))

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك پێی خۆشە لە کاتی تەنگانە خوا وەڵامی دووعای بداتەوە، با لە کاتی فەرحانی‌و دڵخۆشیدا زۆر دووعا بکات.

{عَنْ سَلْمَانَ الفَارِسِي رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ اللهَ تَعَالَى حَيِيٌّ كَرِيْمٌ، يَسْتَحِيِي إِذَا رَفَعَ الرَّجُلُ إِلَيْهِ يَدَيْهِ أَنْ يَرُدَّهُمَا صِفْراً خَائِبَتَيْنِ» } **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[(١)]

واتە: سەلمانی فارسی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوای بەرز بەشەرم و بەڕێزە، شەرم دەکات ئەگەر پیاوێك دەستەکانی بەرز بکاتەوەو لێی بپاڕێتەوە ڕەتی بکاتەوە، بە بە تاڵی، (واتە: حەتمەن وەڵامی دەداتەوە).

## چەند کات‌و شوێنێك کە دووعاکانی تێدا قبووڵ دەبێ[(٢)]

بێگومان خوای پەنهانزان لە هەموو کاتێك چاوی لە بەندەکانیەتی‌و دووعاو پاڕانەوەکانیشیان دەبیستێ، وە وەڵامی دووعاکانیشیان دەداتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە دەقی فەرمایشتی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ هەندێك کات تایبەت کراون‌و دەستنیشان کراون کە پاڕانەوەکان تێیان دا زیاتر گیرادەبن‌و زووتر وەڵام دەدرێنەوە، دیارە خوای بێ وێنە پێی خۆشە بەندەکانی زیاتر لەو کاتانە لێی بپاڕێنەوەو داواکارییەکانیان پێشکەشی بکەن، کاتەکانیش بریتین لە:

(١)- شەوی قەدر.

(٢)- کۆتایی نیوەی شەو (سێیەکی شەو).

(٣)- لە پاش هەموو نوێژە فەرزەکانەوە.

(٤)- لە نێوان بانگ و قامەت دا.

(٥)- کاتێك لە هەموو شەوێدایە.

---

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيّ: (٣٥٥٦)، وَصَحَّحَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (١٦٣٥))

٢) قەڵای موسڵمان لە زیکرەکانی ڕۆژانەو شەوانەدا.

(٦)- لە کاتی بانگدان بۆ نوێژە فەرزەکان.

(٧)- لە کاتی باران بارین.

(٨)- لە کاتی تێکرژانی سوپای ئیمانداران‌و کافران لە جیهاد دا.

(٩)- کاتێك لە ڕۆژی هەینی دایە: وە ڕاسترین گوتە: لەمەدا ئەوەیە کە کۆتایی کاتە لە کاتەکانی عەسری ڕۆژی هەینی، وە واردیش بووە کە دەگونجێ لەو نێوانەدا بێ کە ئیمام لەکاتی وتاردان دا دادەنیشێ تا نوێژەکە تەواو دەبێ.

(١٠)- لە کاتی خواردنەوەی ئاوی (زەمزەم) لەگەڵ نیەتێکی ڕاست.

(١١)- لە کڕنووش دا (السجود).

(١٢)- لە کاتی بە خەبەر هاتن لە شەوداو پاڕانەوە بە سوننەتی (مأثور) لەو کاتەدا.

(١٣)- لەسەر پاکییەتی (بە دەستنوێژ) نووستن‌و پاشان بە خەبەرهاتن‌و پاڕانەوە.

(١٤)- لە کاتی پاڕانەوە بە زیکری: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ).

(١٥)- پاڕانەوەی مسوڵمانان بۆ کەسێك پاش مردنی.

(١٦)- پاڕانەوە لە دوای ستایشی خواو صەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ لە تەحییات دا.

(١٧)- لە کاتی پاڕانەوە لە خوا بە ناوە گەورەکەی، وەك لە فەرمایشتێکدا هاتوە: {عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جَالِسًا وَرَجُلٌ يُصَلِّي، ثُمَّ دَعَا اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ بِأَنَّ لَكَ الْحَمْدَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ الْمَنَّانُ بَدِيعُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ يَا ذَا الْجَلاَلِ وَالإِكْرَامِ يَا حَيّ يَا قَيُّومُ، فَقَالَ النَّبِيّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لَقَدْ دَعَا اللهَ بِاسْمِهِ الْعَظِيمِ الَّذِي إِذَا دُعِيَ بِهِ أَجَابَ وَإِذَا سُئِلَ بِهِ أَعْطَى»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: ئەنەس خوا لێی ڕازی بێ، لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دانیشتوە، پیاوێکیش نوێژی کردوە پاشان دووعای کردەوەو گوتوویەتی: خوایە من دەپاڕێمەوەو داوات لێ دەکەم

---

١) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُد: (١٤٩٧)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح سُنَن أبي دَاوُد): (١٣٤٢))

بەوەی کە سوپاسو ستاییش هەر بۆ تۆیە، هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە تۆ، تەنهاو بێ هاوەڵی، خاوەنی فەزڵو منەتی، ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکانو زەوی! ئەی خاوەن پایەی بەرزو ڕێز! ئەی زیندووی مشوورگێڕی هەڵسووڕێنەری بونەوەر! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە داوای لە خوا کرد بە ناوە گەورەکەی، ئەو ناوەی کە ئەگەر دووعای پێبکرێ وەڵام دەدرێتەوە، وە ئەگەر داوای پێبکرێ دەبەخشرێ.

(١٨)- پاڕانەوەی مسوڵمان بۆ (براو خوشکی) مسوڵمانی بە پەنهانی.

(١٩)- پاڕانەوە لە ڕۆژی عەرەفە، لە عەرەفە.

(٢٠)- پاڕانەوە لە مانگی ڕەمەزان دا.

(٢١)- لە کاتی کۆبوونەوەی مسوڵمانان لە کۆڕی زیکردا.

(٢٢)- پاڕانەوە لە کاتی تووش بوون بە موصیبەت، بە گوتنی: (إِنَّا للهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ، اللَّهُمَّ عِنْدَكَ أَحْتَسِبُ مُصِيبَتِي فَأْجِرْنِي فِيهَا وَأَبْدِلْ لِي خَيْرًا مِنْهَا).

(٢٣)- پاڕانەوە لە کاتی ڕووکردنی دڵ بۆ لای خوای گەورەو تاوسەندنی دڵسۆزیی (الإخلاص).

(٢٤)- پاڕانەوەی ستەم لێکراو، لەو کەسەی ستەمی لێکردوە.

(٢٥)- پاڕانەوەی بابو دایك لە منداڵەکەیان بە چاكو خراپ.

(٢٦)- پاڕانەوەی گەشتیار (المسافر).

(٢٧)- پاڕانەوەی ڕۆژووەوان هەتا بەربانگ دەکاتەوە.

(٢٨)- پاڕانەوەی ڕۆژووەوان لە کاتی بەربانگ کردنەوەدا.

(٢٩)- پاڕانەوەی ناچارو لێقەوماو پێگیراو.

(٣٠)- پاڕانەوەی پێشەوای دادگەر (الإمام العادل).

(٣١)- پاڕانەوەی کوڕوکچی چاکەکارو صالح بۆ دایكو بابی.

(٣٢)- پاڕانەوە لە دوای دەست نوێژ، ئەگەر پاڕایەوە بە سوننەتی (مأثور) ئەو کاتە.

(٣٣)- پاڕانەوەی دوای ڕەجم کردنی (الجمرة الصغری).

(٣٤)- پاڕانەوەی دوای ڕەجم کردنی (الجمرة الوسطی).

(٣٥)- پاڕانەوە لە ناو کەعبە.

(٣٦)- پاڕانەوە لەسەر صەفا.

(٣٧)- پاڕانەوە لەسەر مەڕوە.

(٣٨)- پاڕانەوەی لە لای مەشعەری حەڕرام (المشعر الحرام)دا.

وە لەبەر ئەوەی زۆربەی فەرمایشتەکان کە دەربارەی کاتی وەڵامدانەوەی دووعاکانن خۆی لە سی‌و هەشت خاڵ دەبینێتەوە لەم کتێبە باسکراون‌و هێنراون، جا بۆ زیاتر درێژنەبوونەوەی بابەتەکە لێرەدا هەر تەنیا بە کورتیی‌و پوختیی دەقە کوردییەکەی ئاماژەمان پێدان‌و بەڵگەکانمان ڕاستەوخۆ باس نەکردن، هەرچەندە دواتر هەندێك لەو فەرموودانەمان بە دەقە عەرەبیەکەوە هێناوە، بەڵام دیارە ئەو جۆرە ڕێکخستنەش سوودی زیاتری دەبێ بۆ هەر کەسێك کە ناتوانی وەك پێویست بە دوای ئەم بابەتە بگەڕێ، وە دیسان بۆ کەسێك کە ورد دەبێتەوە لەڕاستی‌و ناڕاستی ئەو فەرموودانەی کە باسکراوە هەر جێگای کەڵك و سوودە، چونکە ئێمە لە سەرەتای ئەم کتێبەدا بەیانی ئەوەمان کردوە ئەم کتێبە إن شاء الله دوورە لە فەرموودەی (ضعیف)، هەوڵدراوە جێگای متمانەو پشت پێبەستنی هەموو مسوڵمانێکی دڵسۆزو بە سۆز بێت.

{عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِذَا نُودِيَ بِالصَّلاَةِ فُتِحَتْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَاسْتُجِيبَ الدُّعَاءِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: کاتێك بانگبێژرا بۆ نوێژ دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوەو دووعاو پاڕانەوە وەڵام دەدرێنەوە.

{عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «ثِنْتَانِ لاَ تُرَدَّانِ: عِنْدَ النِّدَاءِ وَعِنْدَ الْبَأْسِ حِينَ يُلْحِمُ بَعْضُهُمْ بَعْضاً»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

---

١) (رَوَاهُ أبو يعلى: (٤٠٧٢)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٤١٣))

٢) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (٢٥٤٠)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (المشكاة): (٦٧٢))

واتــە: ســەهلی کــوڕی ســەعد خــوا لێــی ڕازی بــێ، دەڵــێ: پێغەمبــەری خــوا ﷺ فەرموویەتی: لە دوو کاتدا دووعاو پاڕانەوە ڕەت ناکرێنەوە، لە کاتی بانگدان، وە لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوە لە (جەنگ)دا کە سوپای بڕواداران و سوپای کافران بەیەکدا دەدەن.

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لاَ يُرَدُّ الدُّعَاءُ بَيْنَ الأَذَانِ وَالإِقَامَةِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: دووعاو پاڕانەوەی نێوان بانگو قامەت ڕەت ناکرێتەوە (واتە: وەردەگیرێ).

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِذَا سَمِعْتُمْ صِيَاحَ الدِّيَكَةِ، فَاسْأَلُوا اللهَ مِنْ فَضْلِهِ، فَإِنَّهَا رَأَتْ مَلَكاً، وَإِذَا سَمِعْتُمْ نَهِيقَ الْحِمَارِ، فَتَعَوَّذُوا بِاللهِ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِنَّهُ رَأَى شَيْطَاناً»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

واتە: ئەبوو هوڕەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر گوێتان لە خوێندنی کەڵەشێر بوو داوای پایەی خوای پێ بکەن، چونکە بێگومان ئەو فریشتەی بینیوە، وە ئەگەر گوێتان لە زەڕەی گوێ درێژ بوو پەنا بگرن بە خوای پارێزەر لە شەیتان، چونکە شەیتانی بینیوە.

## زۆرترین دووعاو پاڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ چ بووە؟

{عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: كَانَ أَكْثَرُ دُعَاءِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «اللَّهُمَّ رَبَّنَا! آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[3]

واتە: ئەنەس خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: زۆرترین دووعای پێغەمبەر ﷺ ئەوەبوو: (اللَّهُمَّ رَبَّنَا! آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ)، واتە: ئەی خوایە، پەروەردگارمان! لە دنیادا چاکەو لە دواڕۆژیشدا چاکەمان بدەیەوەو لە سزاو ئازاری ئاگر بمانپارێزە.

---

١) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (٥٢١)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (المشكاة): (٦٧١))
٢) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ: (٣١٢٧)، واللَّفْظُ لَهُ، وَمُسْلِمٌ: (٧٠٩٦))
٣) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٦٠٢٦)، وَمُسْلِمٌ: (٧٠١٧))

## دووعای سێ جۆره كەس ڕەت ناكرێتەوە

{عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «ثَلَاثُ دَعَوَاتٍ لا تُرَدُّ: دَعْوَةُ الْوَالِدِ، وَدَعْوَةُ الصَّائِمِ، وَدَعْوَةُ الْمُسَافِرِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(١)

**واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ دووعا هەن ڕەت ناكرێنەوە: دووعای دایك وباب، وە دووعای ڕۆژووەوان، وە دووعای گەشتیارو ڕێبوار.**

## داوا كردنی بەهەشتو پەناگرتن لە دۆزەخ

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ سَأَلَ اللهَ الْجَنَّةَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، قَالَتِ الْجَنَّةُ: اللَّهُمَّ! أَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ، وَمَنْ اسْتَجَارَ مِنْ النَّارِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ قَالَتِ النَّارُ اللَّهُمَّ أَجِرْهُ مِنَ النَّارِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(٢)

**واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك (لە ناخی دڵیەوە) داوای بەهەشت لە خوا بكات، بەهەشت دەڵێ: ئەی خوایە! بیبە نێو بەهەشت، وە هەر كەسێكیش سێ جاران پەنا بە خوا بگرێ لە چوونە نێو ئاگر، ئاگر (واتە: جەهەننەم) دەڵێ: ئەی خوایە! بیپارێزەو چەپاڵەی بدە لە ئاگر.**

---

١) (رَوَاهُ البَيْهَقِيُّ في (الكُبرى): (٦١٨٥)، وَصَحَّحَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٧٩٧))

٢) (رَوَاهُ ابْنُ مَاجَةَ: (٤٣٤٠)، وَصَحَّحَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٦٢٧٥))

# پایەو پاداشتی

## دووعا کردن بۆ مسوڵمانان

{عَنْ أُمِّ كَرَزٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «دَعْوَةُ الرَّجُلِ لأَخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ مُسْتَجَابَةٌ وَمَلَكٌ عِنْدَ رَأْسِهِ يَقُولُ: آمِينْ وَلَكَ بِمِثْلِ ذَلِكَ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتە: ئوممی کەرەز خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دووعای پیاو لە پاشملە بۆ براکەی لە پەنهان وەرگیراوە، وە فریشتەیەك لەلای سەریەتی‌و دەڵێ: (خوایە) قبووڵی بکە، وە بۆ تۆش بە وێنەی ئەوە (واتە: ئەو فریشتە هەمان دووعای بۆ کەسی بەرانبەر دەکات).**

{عَنْ أَبِي مُوسَى رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، إِذَا أَتَاهُ طَالِبُ حَاجَةٍ أَقْبَلَ عَلَى جُلَسَائِهِ، فَقَالَ: «اشْفَعُوا فَلْتُؤْجَرُوا وَلْيَقْضِ اللهُ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّهِ مَا أَحَبَّ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

**واتە: ئەبوو مووسا خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابوو ئەگەر یەکێك بهاتبایە لای بۆ پێویستیەك داوای شتێکی کردبایە، ڕووی لە کۆڕەکەی دەکردو دەیفەرموو: تکای بۆ بکەن‌و پاداشتی خۆتان وەربگرن، ئەوەی خوا حەز بکات لەسەر زاری پێغەمبەرەکەی جێبەجێی دەکات.**

{عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَنِ اسْتَغْفَرَ لِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ كَتَبَ اللهُ لَهُ بِكُلِّ مُؤْمِنٍ وَمُؤْمِنَةٍ حَسَنَةً»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[3]

---

١) (رَوَاهُ أَبِي بَكرِ الشافعي في (الفوائد المنتخبة الشهير بالغيلانيات): (٥٨٨)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع): (٣٣٨١))

٢) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ: (٧٠٣٨)، وَمُسْلِمٌ: (٦٨٥٨))

٣) (مُسْنَد الشاميين: (٢١٥٥)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع): (٦٠٢٦)).

واتە: عوبادەی کوڕی صامیت خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێك (لە خوا بپاڕێتەوەو) داوای لێ خۆشبوون بۆ ئیماندارانی پیاوو ئافرەت بکات بە ئەندازەی ژمارەی ئیماندارانی پیاوو ئافرەت خوا چاکەی بۆ دەنووسێ.

کەواتە: یانی ئەگەر تۆی مسوڵمان بڵێی ئەی خوای لێبووردەو بەبەزەیی! ئەی پەروەردگاری میهرەبانم! لێت دەپاڕێمەوەو تکات لێدەکەم بە بەخشندەیی‌و بەزەییە فرەوانەکەت لە مسوڵمانان خۆشبی، هەر کە لە ناخی دڵەوە ئەم دووعایەت کرد، ڕاستەوخۆ بە ئەندازەی ژمارەی هەموو مسوڵمانان پاداشتت بۆ دەنووسرێ!!

{عَنْ أُمِّ الدَّرْدَاءِ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: حَدَّثَنِي سَيِّدِي أَنَّـهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَنْ دَعَا لأَخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ، قَالَ الْمَلَكُ الْمُوَكَّلُ بِهِ: آمِينَ، وَلَكَ بِمِثْلٍ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: ئوممو دەرداء خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گەورەکەم بۆی گێڕامەوە (واتە: پیاوەکەم، کە دەکاتە: باوکی دەرداء، خوا لێیان ڕازی بێ) کە ئەو گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە فەرموویەتی: هەر کەسێك دووعا لە پاشملە بۆ براکەی بکات بە پەنهانی، فریشتەیەکی ڕاسپێرراو بەوەوە دەڵێ: (خوایە) قبووڵی بکە، وە بۆ تۆش بە وێنەی ئەوە.

{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَا مِنْ مَيِّتٍ يُصَلِّي عَلَيْهِ أُمَّةٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، يَبْلُغُونَ مِائَةً، كُلُّهُمْ يَشْفَعُونَ لَهُ إِلاَّ شُفِّعُوا فِيهِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ مردوویەك نیە، کە کۆمەڵێك لە مسوڵمانان نوێژی لەسەر بکەن، ژمارەیان بگاتە سەد کەس‌و هەموویان دووعای بۆ بکەن مەگەر دووعاکەیان بۆ وەردەگیرێ، (واتە: حەتمەن دووعاکەیان بۆ ئەو مردوە قبووڵ دەبێ لەلایەن خوای پەروەردگارەوە).

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٧١٠٤)).
٢) (رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٣٨٣١)، وَمُسْلِمٌ: (٩٤٧).

# پایــەو پاداشــتی
# دووعای کۆتایی شـەو

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «يَتَنَزَّلُ رَبُّنَا تَبَارَكَ وَتَعَالَى كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا، حِيْنَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرُ يَقُولُ: مَنْ يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيْبَ لَهُ، مَنْ يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ، مَنْ يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتـە: ئـەبوو هـورەیرە خـوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: پـەروەردگارمان (تبـارك وتعالى) هـەموو شـەوێك دادەبـەزێ و دێتـە ئاسمانی دنیا، لە کاتێکدا کـە سێیەکی کۆتـایی شـەو دەمێنـێ، دەفـەرموێ: کـێ دووعـا دەکات؟ وەڵامـی دەدەمەوە، کـێ داوام لـێ بکات؟ پێـی ببەخشم، کـێ داوای لـێ خۆشـبوونم لێ دەکات؟ لێـی خۆش دەبم.**

{عَنْ أَبِي سَعِيدٍ وَأَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالاَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ اللهَ يُمْهِلُ، حَتَّى إِذَا ذَهَبَ ثُلُثُ اللَّيْلِ الأَوَّلُ، نَزَلَ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا فَيَقُولُ: هَلْ مِنْ مُسْتَغْفِرٍ، هَلْ مِنْ تَائِبٍ، هَلْ مِنْ سَائِلٍ، هَلْ مِنْ دَاعٍ، حَتَّى يَنْفَجِرَ الْفَجْرُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

**واتـە: ئـەبوو سـەعیدی خـودریی و ئـەبوو هـورەیرە خـوا لێیـان ڕازی بـێ، دەڵـێن: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا ماوە دەدا هەتا سێ بەشی یەکەمی شەو دەڕوات، ئنجا دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دنیاو دەفەرموێ: ئایا کەس هەیە داوای لێخۆشبوون بکات؟ ئایا کەس هەیە تۆبە بکات؟ ئایا کەس هەیە داوا بکات و پرسیار بکات؟ ئایا کەس هەیە دووعا بکات، هەتا ڕۆژ هەڵدێ.**

---

١) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ: (١٠٩٤) وَاللَّفْظُ لَهُ، وَمُسْلِمٌ: (١٨٠٨))

٢) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (١٨١٣))

## وەڵامی دووعاو پاڕانەوەی ستەم لێكراو

{عَنْ خُزَيمَةَ بْنِ ثَابِتٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «اتَّقُوا دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ، فَإِنَّهَا تُحْمَلُ عَلَى الْغَمَامِ، يَقُولُ اللهُ جَلَّ جَلَالُهُ: وَعِزَّتِي! وَجَلَالِي! لأَنْصُرَنَّكِ وَلَوْ بَعْدَ حِيْنٍ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: خوزەیمەی كوڕی ثابیت خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆتان بپارێزن لە دووعای ستەم لێكراو، چونكە بێگومان دووعاكەی هەڵدەگیرێ لە سەر هەور، وە خوا (جَلَّ جَلَالُهُ) دەفەرموێ: بە عیززەت و شكۆییم! سەرتدەخەم ئەگەر بۆ ماوەیەكیشی پێ بچێت.

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «اتَّقُوا دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ وَإِنْ كَانَ كَافِراً فَإِنَّهُ لَيْسَ دُوْنَهَا حِجَابٌ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[2]

واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆتان بپارێزن لە دووعای ستەم لێكراو ئەگەر هاتوو كافریش بوو، چونكە هیچ پەردەیەك نیە لە نێوان (دووعاو قبووڵ بوونەكەی).

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «دَعْوَةُ الْمَظْلُومِ مُسْتَجَابَةٌ وَإِنْ كَانَ فَاجِراً فَفُجُوره عَلَى نَفْسِهِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[3]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: دووعای ستەم لێكراو وەڵام دەدرێتەوە ئەگەر كەسێكی خراپیش بێ، چونكە خراپەكەی تەنیا بۆ نەفسی خۆیەتی.

---

١) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ (٣٧١٨)، وَصَحَّحَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٨٧٠))

٢) (رَوَاهُ أَحْمَدُ: (١٢٥٧١)، وَحَسَّنَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٧٦٧))

٣) (رَوَاهُ أَحْمَد: (٧٦٧)، وَحَسَّنَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٣٣٨٢))

## دووعای کاتی گرفتاریی‌و ناڕەحەتیی

{عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتَ عُمَيس رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِأُذُنَيَّ هَاتَيْنِ يَقُولُ: «مَنْ أَصَابَهُ هَمٌّ أَوْ غَمٌّ أَوْ سُقْمٌ أَوْ شِدَّةٌ، فَقَالَ: اللهُ رَبِّي لاَ شَرِيْكَ لَهُ كُشِفَ ذَلِكَ عَنْهُ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**(١)

واتە: ئەسمائی کچی عومەیس خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: بە هەردوو گوێیەکانم بیستم لە پێغەمبەری خوام ﷺ دەیفەرموو: هەر کەسێك تووشی خەفەت، یان دڵتەنگیی، یان پەژارەیەك، یان نەخۆشی‌و ناڕەحەتی ببێ‌و بڵێ: تەنیا خوایە پەروەردگارم، وە هیچ هاوەڵی نین، ئەوە خوا لەسەری لادەبات.

{عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ عُمَيس رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: عَلَّمَنِي رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ عِنْدَ الْكَرْبِ: «اللهُ اللهُ رَبِّي لاَ أُشْرِكُ بِهِ شَيئاً»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(٢).

واتە: ئەسمائی کچی عومەیس خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چەند وشەیەکی فێرکردووم، کە لە کاتی ناخۆشیی‌و گرفتاریی بیڵێم: (خوایە خوایە پەروەردگارم، هیچ هاوبەشێکی بۆ دانانێم).

{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَانَ يَقُولُ عِنْدَ الْكَرْبِ: «لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ الْعَظِيمُ الْحَلِيم، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ رَبُّ الْعَرش الْعَظِيم، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ رَبُّ السَّمَاوَات وَرَبّ الأَرْضِ وَرَبُّ الْعَرش الْكَرِيْم»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(٣).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی‌و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی ناخۆشی‌و ناڕەحەتی دا دەیگوت: هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە خوای مەزن‌و هێدیی‌و مەند، هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە پەروەردگاری عەرشی مەزن، هیچ پەرستراوێك نیە بە هەق جگە لە پەروەردگاری ئاسمانەکان‌و پەروەردگاری زەوی‌و پەروەردگاری عەرشی بەڕێز.

---

١) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي (الكَبِير): (٣٩٦)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع): (٦٠٤٠)).

٢) (رَوَاهُ ابْنُ مَاجَة: (٣٨٨٢)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع): (٣١٣٢)).

٣) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٥٩٨٦)).

# پایەو پاداشتی صەڵاوات ناردن بۆ پێغەمبەر ﷺ

## واتاو پێناسەی (الصَّلاَة)

**(أ)- لە ئەسڵی زمان دا:**

(الصَّلاَةُ في اللُّغَة: هِيَ الدُّعَاء والتَبريك والتَمْجِيد) واتە: (صَلاَة) لە ئەسڵی زمان دا بە مانای پاڕانەوەو بە پیرۆزکردنو بە بەرزگرتن دێ، (يُقَالُ صَلَّيتُ عَلَيهِ أي دَعوتُ لَهُ وَزَكيَّتَهُ) دەگوترێ صەڵاواتم لێدا، واتە: بۆی پاڕامەوە وە بە پاكو چاكم دانا، وەك خوای پەروەردگار لە قورئانی بەرزو بەڕێزیش دا لەوبارەوە بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ ﴿١٠٣﴾﴾ التوبة، واتە: دووعای دابارینی ڕەحمەت بکە بۆیان (واتە: بۆ ئیمانداران) ئەگەر مردیشن نوێژیان لەسەر بکە چونکە بێگومان دووعاو نوێژی تۆ مایەی ئارامیی یە بۆیان، هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمایشتێکدا فەرموویەتی: {إذَا دُعِيَ أحَدُكُمْ إلى طَعَام فَلْيُجِبْ، فَإنْ كَانَ مُفْطِرَاً فَلْيَأكُل، وإنْ كَانَ صَائِمَاً فَلْيُصَلِّ} حَدِيثٌ صَحِيحٌ[1]

واتە: ئەگەر یەکێکتان بۆ خواردنێ بانگهێشت کرا، با وەڵام بداتەوە، وە ئەگەر بە ڕۆژووش بوو، با دووعا بۆ دەعوەتکەر بکات (واتە: بپاڕێتەوە بڵێ: خوا پاداشتی خێرت بداتەوە).

**(ب)- لە زاراوی شەرعدا:**

(الصَلاَةُ: هِيَ عِبَادَةُ تَشْتَمل عَلَى أَقْوَال وَأَفْعَال مَخْصُوصَة تفتتح بِالتَكْبِيْر وَتختتم بالتَّسْلِيم) (صَلاَة) بریتیە لەو عیبادەتەی کە هەموو ئەو گوفتارو کردارە تایبەتیانە دەگرێتەوە کە بە تەکبیر کردن دەست پێ

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٣٥٩١)، عَنْ أَبِي هُرَيرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)

دەکاو بە سەلام دانەوە کۆتایی دێ، کە ئەویش پێی دەگوترێ: نوێژ، (وَالـمُرَادُ بِالأَقْوَال: التَّكْبِيرُ وَالقِرَاءَة والتَّسْبِيحُ وَالدُّعَاء، وَنَحو ذَلِكَ) دیارە مەبەستیش لە گوفتارو قسەکان بریتیە لە: تەکبیر کردن‌و خوێندنی قورئان‌و بە پاکگرتنی خواو و وێنەی ئەوانە (وَالـمُرَادُ بِالأَفْعَال: القِيَامُ وَالرُّكُوعُ والسُّجُود وَالجُلُوسُ وَنَحو ذَلِكَ) وە مەبەستیش لە کردارەکان بریتیە لە: ڕاوەستان‌و چەمینەوەو کڕنووش بردن‌و دانیشتن‌و وێنەی ئەوانە.

## چۆنیەتی صەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ

{اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

خوایە! درودو ڕەحمەت بڕێژە بۆ سەر موحەممەد، وە خزم‌و کەسانی شوێنکەوتووی، هەر وەك چۆن درودو ڕەحمەتت ڕژاندە سەر ئیبڕاهیم‌و خزم‌و کەسانی شوێنکەوتووی، بێگومان تۆ سوپاسکراوو خاوەن شکۆو ڕێزیت، خوایە! پێزو بەرەکەت بڕێژە سەر موحەممەد، وە خزم‌و کەسانی شوێنکەوتووی، هەروەك چۆن پێزو بەرەکەتت ڕژاندە سەر ئیبڕاهیم‌و خزم‌و کەسانی شوێنکەوتووی، بەڕاستی تۆ سوپاسکراوو خاوەن شکۆو ڕێزیت.

---

[1] (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٥٩٩٦)، وَمُسْلِمٌ: (٩٣٥) عَنْ كَعْبُ بْنُ عُجْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)

## مانای صەڵاوات لەلایەن خواو فریشتەو مسوڵمانانەوە:

صەڵاوات ناردن لە لایەن هەر یەکێك لە: خوای بێ وێنەو، فریشتە بەڕێزەکان و، مسوڵمانانەوە سێ مانای جیاوازی هەن، کە ئێمە بە کورتی باسی دەکەین بۆ ئەوەی هەر کاتێك گوێمان لێ بوو کە باسی صەڵاوات دان لەلایەن هەر یەکێکیانەوە کرا وەك خۆی تێیبگەین:

یەکەم: بە نسبەت خوای بێ وێنە کە صەڵاوات دەنێرێ بۆ پێغەمبەری خۆی و، وە بۆ مسوڵمانان، (راغب الأصفهاني) گوتوویەتی: (وَصَلاةُ اللهِ لِلمُسلِمينَ هُوَ فِي التَحقِيق: تَزكِيَتهُ إيَّاهُمْ)، صەڵاواتی خوا بۆ مسوڵمانان بریتیە لەوە کە خوا پاك و، چاکیان بکات و، پلەیان بەرزبکاتەوەو گەشەیان پێ بدات.

دووەم: (وَمِنَ المَلائِكَة هِيَ الدُّعَاء وَالإستِغفَار كَمَا هِيَ مِنَ النَّاس) وە صەڵاواتی فریشتان بریتیە لە پاڕانەوەیان، وە داوای لێبوردن و لێخۆشبوون کردنیان بۆ مسوڵمانان لە خوا سبحانە وتعالی، هەروەك خەڵك ئاوا دووعاو پاڕانەوە بۆ یەکدی دەکەن لە لای خوا.

سێیەم: هەروەها خەڵکیش کە صەڵەوات دەنێرین بۆ پێغەمبەر ﷺ، واتە: بۆی دەپاڕێنەوە کە خوا پلەو پایەو مەنزلگای بەرزتر بکاتەوە هەم لە دنیا، هەم لە دوارۆژ.

بێگومان ناردنی صەڵاوات یەکێکە لە نیشانە دیارەکانی وەفای ئینسانی ئیماندار بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، ئنجا صەڵاوات دان بۆ پێغەمبەر ﷺ جگە لەوەی لە هەندێ کات دا پێویست کراوە کە بۆی بنێردرێ، تەنانەت کراوە بە ڕوکنێکی گەورەی یەکێك لە واجباتە هەرە گەورەکان کە ڕۆژانە پێنج جار ئەنجام دەدرێن، کە ئەویش بریتیە لە نوێژ، دیارە ئەوە ئەگەر

هەر نوێژە فەرزەکان بکرێ، جگە لە نوێژی سوننەت! وە تەحییات بە کۆ دەنگ (إجماع)ی زانایانی ئیسلام بریتییە لە ڕوکنێکی نوێژ، وە هەر واجبێك ڕوکنێکی ناتەواو بێ، دیارە وەرناگیرێ، هەروەك چۆن خوێندنی سوورەتی (فاتیحە) ڕوکنێکە لە نوێژ ئەگەر نەخوێنرێ لە نوێژ ئەوە نوێژەکەی ناتەواوە، وەك لە فەرموودەی (صحیح)ی پێغەمبەری خوا ﷺدا هاتووە: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ صَلَّى صَلاَةً لَمْ يَقْرَأْ فِيهَا بِأُمِّ الْقُرْآنِ فَهِيَ خِدَاجٌ (ثَلاَثًا) غَيْرُ تَمَامٍ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك نوێژ بکات سوورەتی فاتیحەی تێدا نەخوێنی ئەوە نوێژەکەی ناتەواوە، نوێژەکەی ناتەواوە، نوێژەکەی ناتەواوە، (دواییش بۆ دڵنیای فەرمووی: (غَيْرُ تَمَامٍ) واتە: نوێژەکەی ناتەواوە، هەر بۆیەش زۆر لە زانایان جگە لە (أبو حنيفة) ڕەحمەتی خوایان لێ بێت ڕایان وایە کە لە هەموو ڕکاتێك دا فەرزە سوورەتی (الفاتِحة) بخوێندرێ، ئەگەرنا ئەو نوێژە بەرناکەوێ.

جا بێینەوە سەر ئەسڵی مەبەست، کە ناردنی صەڵاواتە لە نوێژ لە کاتی خوێندنی تەحییات، دیارە واجبە، پاشان خوای پەروەردگار بە شێوەی فەرمان داوای لە ئیمانداران کردوە، صەڵاوات بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ بنێرن، وەك لە سوورەتی (الأحزاب) فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ٥٦﴾

---

[1] (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٩٠٤))

واتـە: بێگومـان خـواو فریـشتەکان صـەڵاوات دەدەن لەسـەر پێغەمبـەر (ﷺ) ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! ئێـوەش صـەڵاتو سـەلامی زۆری لەسەر بدەن.

وە صەڵاتو سەلام ناردن دیارە بەشێکی گەورەو گرنگی زیکری خوا کردنە، وە خوای پەروەردگاریش لەوبارەوە فەرموویەتی:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ ذِكۡرٗا كَثِيرٗا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا ﴿٤٢﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُصَلِّي عَلَيۡكُمۡ وَمَلَٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخۡرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۚ وَكَانَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَحِيمٗا ﴿٤٣﴾﴾ الأحزاب

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! زۆر یادو زیکری خوا بکەن . وە بە پاکیی یادی خوا بکەن بەیانیان و ئێوارانـدا . وە ئەو (خوا) زاتێکە بەزەیی خـۆی دەڕژێنـێ بەسـەرتان داو فریشتەکانیـشی داوای لێخۆشـبوونتان بـۆ دەکەن بەو هۆیەوە (خوا) لە تاریکیی یەکانەوە دەرتان دێنێ بەرەو نوورو ڕووناکی (ئیمان و ئیسلام) وە خوا بەبەزەیی یە بە ئیمانداران.

ئنجا زیاد لەوەش چەند فەرمایشتی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ لەو بارەوە هەن کە داوای لێ کردووین و فەرموویـەتی صەڵاواتم لەسەر بدەن بۆ وێنە: لە فەرموودەیەکی (صحیح)دا دەفەرموێ: {حَيْثُمَا كُنْتُمْ فَصَلُّوا عَلَيَّ فَإِنَّ صَلاَتَكُمْ تُبَلِّغُنِي} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: لە هەر کوێیەك بوون صەڵاواتم لەسەر بدەن، چونکە بێگومان صەڵاواتەکانتان پێم دەگات، وە هەروەها لە فەرموودەیەکی دیکەدا هاتوە: {عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهُ (صَلَّى

---

١) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِي في (الكَبير): (٢٧٢٩) عَنْ عَلِي بْنِ أَبي طَالِبٍ ، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع): (٣١٦٤))

اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ للهِ فِي الأَرْضِ مَلائِكَةً سَيَّاحِينَ يُبَلِّغُونِي مِنْ أُمَّتِي السَّلامَ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[١]

**واته: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوای پەروەردگار لەسەر زەوی فریشتەی گەڕۆکی هەن، سەلامی ئۆممەتەکەمم پێ دەگەیەنن.**

**وە بەڕاستی ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە سیفەتێکی زۆر ناپەسند باسی ئەو کەسانەی کردوە کە صەڵاواتی بۆ نانێرن لە کاتی ناو هێنانی وەك فەرموویەتی:** {«إِنَّ الْبَخِيلَ مَنْ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[٢]

**واتە: بەڕاستی ڕەزیل ئەو کەسەیە کە ناوی منی لەلا دەهێنرێ‌و صەڵاواتم لەسەر نادات.**

**ئێستاش با بچینە خزمەت ئەو فەرموودانەی کە پاداشتی صەڵاوات ناردنیان تێدا باسکراوە:** ١

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ صَلَّى عَلَيَّ وَاحِدَةً صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ عَشْرًا»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[٣]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك یەك صەڵاواتم لەسەر بدات، خوای بەرز دە صەڵاواتی لەسەر دەدات.**

---

١) (رَوَاهُ أَحْمَد: (٤٢١٠)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (فَضْلُ الصَّلاة على النَّبِي): (٢١))

٢) (رَوَاهُ البَيهَقِيُّ: (١٥٦٨)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (فَضْل الصَّلاَةِ عَلَى النَّبِي ﷺ): (٣٥))

٣) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٩٣٩))

{عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ صَلَّى عَلَيَّ حِيْنَ يُصْبِحُ عَشْراً، وَحِيْنَ يُمْسِي عَشْراً، أَدْرَكَتْهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ»}(١)

**واتە: ئەبوو دەرداء خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك کاتێك بەیانی دەکاتەوە دە صەڵاواتم لەسەر بدات، وە لە کاتێك ئێوارە دەکاتەوە دە صەڵاواتم لەسەر بدات، شەفاعەتو تکای منی بەردەکەوێ لە ڕۆژی دوایی دا.**

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) جَاءَ ذَاتَ يَوْمٍ وَالْبُشْرَى فِي وَجْهِهِ، فَقُلْنَا: إِنَّا لَنَرَى الْبُشْرَى فِي وَجْهِكَ؟! فَقَالَ: «إِنَّهُ أَتَانِي الْمَلَكُ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ! إِنَّ رَبَّكَ يَقُولُ: أَمَا يُرْضِيكَ أَنَّهُ لاَ يُصَلِّي عَلَيْكَ أَحَدٌ إِلاَّ صَلَّيْتُ عَلَيْهِ عَشْرًا وَلاَ يُسَلِّمُ عَلَيْكَ أَحَدٌ إِلاَّ سَلَّمْتُ عَلَيْهِ عَشْرًا»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(٢)

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی طەڵحە لە بابی دەگێڕێتەوە خوا لێی ڕازی بێ، کە گوتوویەتی: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ هات، وە موژدە لە ڕووی دەبینرا، گوتمان: ئێمە موژدە لە ڕووت دەبینین؟! فەرمووی: فریشتەیەك هاتە لام، گوتی: ئەی موحەممەد! پەروەردگارت دەفەرموێ: ڕازییە بەوەی کە هەر کەسێك یەك صەڵاواتی لەسەر تۆ بدات، ئەوە من دە صەڵاواتی لەسەر دەدەم، وە هەر کەسێك یەك سەلامت لێ بکات، ئەوە من دە سەلامی لێدەکەم.**

---

١) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ كما في (مجمع الزَّوائد): (١٧٠٢٢)، قَالَ الهَيْثَمِي: رَوَاهُ الطَّبَرَاني بإسنادين، وإسناد أحدهما جيد ورِجَالُهُ وثِقوا، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع): (٦٣٥٧)، ثُمَّ ضَعَّفَهُ في (ضعيف الترغيب والترهيب): (٣٩٦)، و (السلسلة الضعيفة): (٥٧٨٨)) بۆ بەرچاو ڕوونی ئەم فەرموودەم نووسی!

٢) (رَوَاهُ النَّسَائِيُّ: (١٢٨٣)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح سُنَن النَّسَائِيُّ))

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَا مِنْ أَحَدٍ يُسَلِّمُ عَلَيَّ إِلاَّ رَدَّ اللهُ عَلَيَّ رُوحِي حَتَّى أَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلاَمَ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەسێك نیە کە سەلامم لێبکات حەتمەن خوای پەروەردگار ڕووحەکەم بۆ دەگێڕێتەوە هەتاکو وەڵامی سەلامەکەی دەدەمەوە.**

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاَةً وَاحِدَةً، صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ عَشْرَ صَلَوَاتٍ، وَحُطَّتْ عَنْهُ عَشْرُ خَطِيئَاتٍ، وَرُفِعَتْ لَهُ عَشْرُ دَرَجَاتٍ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك یەك صەڵاواتم لەسەر بدات، خوا دە صەڵاواتی لەسەر دەدات، وە دە گوناهی لێ دەسڕێتەوە، وە دە پلەش بەرزی دەکاتەوە.**

{عَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَا صَلَّى عَلَيَّ أَحَدٌ صَلاَةً إِلاَّ صَلَّتْ عَلَيْهِ الْمَلاَئِكَةُ، مَا دَامَ يُصَلِّي عَلَيَّ فَلْيُقِلَّ عَبْدٌ مِنْ ذَلِكَ أَوْ لِيُكْثِرْ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[3]

**واتە: عامری کوڕی ڕەبیعە لە بابی دەگێڕێتەوە، خوا لێی ڕازی بێ، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێك نیە کە صەڵاواتم لەسەر بدات، مەگەر فریشتەیەك دووعای بۆ دەکاتو بۆی دەپاڕێتەوە مادام صەڵاواتم لەسەر بدات، بەندە بە ئارەزووی خۆی کەمدەکات زۆر دەکات (وە بە ئەندازەی صەڵاواتەکەی فریشتەکان دووعای بۆ دەکەن).**

---

١) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (٢٠٤٣)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٢٢٦٦))

٢) (رَوَاهُ النَّسَائِيُّ: (١٢٩٧)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (المشكاة): (٩٢٢))

٣) (رَوَاهُ أَحْمَد: (١٥٧٢٧)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (١٦٦٩))

{عَنْ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَكْثِرُوا الصَّلَاةَ عَلَيَّ فَإِنَّ اللهَ وَكَّلَ بِي مَلَكاً عِنْدَ قَبْرِي، فَإِذَا صَلَّى عَلَيَّ رَجُلٌ مِنْ أُمَّتِي، قَالَ لِي ذَلِكَ الْمَلَكُ: يَا مُحَمَّدُ! إِنَّ فُلَانَ ابْنَ فُلَانٍ صَلَّى عَلَيْكَ السَّاعَةَ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**(١)

**واتە: ئەبوو بەکر خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زۆر صەڵاوات لەسەر من بدەن، چونکە خوا فریشتەیەکی بۆ داناوم لە لای گۆڕەکەم، کاتێک پیاوێك (یان ئافرەتێك) لە ئوممەتەکەم صەڵاواتم لەسەر بدات، ئەوە ئەو فریشتە پێم دەڵێ: ئەی موحەممەد! ئەوە فلانی کوڕی فلان لەو کاتەدا صەڵاواتی لەسەر تۆ دا.**

{عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: كَانَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إِذَا ذَهَبَ ثُلُثَا اللَّيْلِ قَامَ فَقَالَ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ! اذْكُرُوا اللهَ اذْكُرُوا اللهَ، جَاءَتِ الرَّاجِفَةُ تَتْبَعُهَا الرَّادِفَةُ، جَاءَ الْمُوتُ بِمَا فِيهِ، جَاءَ الْمُوتُ بِمَا فِيهِ»، قَالَ أُبَيٌّ، قُلْتُ: يَا رَسُوْلَ اللهِ! إِنِّي أُكْثِرُ الصَّلَاةَ عَلَيْكَ فَكَمْ أَجْعَلُ لَكَ مِنْ صَلَاتِي؟ قَالَ: «مَا شِئْتَ»، قَالَ: قُلْتُ: الرُّبعَ؟ قَالَ: «مَا شِئْتَ، فَإِنْ زِدْتَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ»، قُلْتُ: النِّصْفَ؟ قَالَ: «مَا شِئْتَ، فَإِنْ زِدْتَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ»، قَالَ: قُلْتُ: فَالثُّلُثَيْنِ؟ قَالَ: «مَا شِئْتَ، فَإِنْ زِدْتَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ»، قُلْتُ: أَجْعَلُ لَكَ صَلَاتِي كُلَّهَا قَالَ: «إِذاً يُكْفَى هَمَّكَ، وَيُغْفَرُ لَكَ ذَنْبُكَ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**(٢)

**واتە: ئوبەیی کوڕی کەعب خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: کاتێ دوو لە سێی شەو دەڕۆیی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵدەستاو دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە! زیکری خوا بکەن، زیکری خوا بکەن، وا هات نەفخەی یەکەم‌و بە دوایی دا نەفخەی دووەمیش هات، وە مردن وا هات بەوەی کە تێیدایە، وا مردن هات بەوەی کە تێیدایە، ئوبەیی دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ! من زۆر صەڵاواتت لەسەر دەدەم، کاتێ نوێژ دەکەم لەو کاتەی خۆم**

١) (رَوَاهُ الديلمي: (٢١٦)، وَحَسَّنَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٥٣٠))

٢) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٢٤٥٧)، وَحَسَّنَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٧٨٦٣))

چەند تەرخانکەم بۆ صەڵاوات دان لەسەرت؟ فەرمووی: چەندی دەتەوێ، بە ئارەزووی خۆت، دەڵێ: گوتم: کەواتە: چوار یەکی تەرخان بکەم؟ فەرمووی: بە ئارەزووی خۆت، چەندی دەتەوێ، بەڵام ئەگەر زیادی بکەی خێرت زۆرترە، گوتم: نیوەی (باشە)؟ فەرمووی: ئارەزووی خۆت، چەندی دەتەوێ، بەڵام ئەگەر زیادی بکەی خێرت زۆرترە، گوتم: دوو سێیەکی (باشە)؟ فەرمووی: ئارەزووی خۆت، چەندی دەتەوێ، بەڵام ئەگەر زیادی بکەی خێری بۆ تۆ زۆرترە، گوتم: دە کاتەکەی هەموو تەرخان دەکەم بۆ صەڵاوات دان لەسەر تۆ؟! فەرمووی: هیچ خەمت نەبێ، خەمەکانت نامێنن، هەرچ ئومێدێکی دنیات هەیە دێتەدی، وە لە گوناهەکانیشت دەبوردرێی.

٧

{عَنْ فُضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: بَيْنَا رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): قَاعِدٌ إِذْ دَخَلَ رَجُلٌ فَصَلَّى فَقَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي، فَقَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «عَجِلْتَ أَيُّهَا الْمُصَلِّي، إِذَا صَلَّيْتَ فَقَعَدْتَ فَاحْمِدِ اللهَ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، وَصَلِّ عَلَيَّ ثُمَّ ادْعُهُ». قَالَ: ثُمَّ صَلَّى رَجُلٌ آخَر بَعْدَ ذَلِكَ، فَحَمِدَ اللهَ وَصَلَّى عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَيُّهَا الْمُصَلِّي! ادْعُ تُجَبْ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتە: فوزالەی کوڕی عوبەید خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوماندا دانیشتبوو پیاوێك هاتە ژوورو نوێژی کرد، دوای گوتی: خوایە! لێم خۆشبە، ڕەحمم پێ بکە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی کابرای نوێژکەر پەلەت کرد، ئەگەر نوێژت کرد دانیشە، ستایشی خوا بکە بەو شێوەی کە شایستەیەتی، دوایی صەڵاواتم لەسەر بدە، ئنجا دووعا بکەو لە خوا بپاڕێوە، دەڵێ: دوایی کابرایەکی دیکە هات نوێژی کرد، پاشان سوپاسو ستایشی خوای پەروەردگاری کرد، ئنجا صەڵاواتی لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ دا، پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: ئەی کابرای نوێژکەر دووعا بکە وەڵامت دەدرێتەوە.**

---

[1]) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٣٤٧٦)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٣٨٩٩))

{عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: «إِنَّ الدُّعَاءَ مَوْقُوفٌ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ لا يَصْعَدُ مِنْهُ شَيْءٌ حَتَّى تُصَلِّيَ عَلَى نَبِيِّكَ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[(١)].

**واتە: عومەری کوڕی خەتتاب گوتوویەتی: بێگومان دووعا ڕاوەستاوە لە نێوان ئاسمانو زەوی هیچ شتێکی لێ بەرز نابێتەوە هەتا صەڵاوات لێ دەدەی لەسەر پێغەمبەرەکەت ﷺ.**

## پایەو پاداشتی

## داواکردنی (الْوَسِيلَةَ) بۆ پێغەمبەر ﷺ:

{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «سَلُوا اللهَ لِي الْوَسِيلَةَ، فَإِنَّهُ لَمْ يَسْأَلْهَا لِي عَبْدٌ فِي الدُّنْيَا، إِلاَّ كُنْتُ لَهُ شَهِيداً أَوْ شَفِيعاً يَوْمَ الْقِيَامَةِ»} **حديث حَسَنٌ**[(٢)]

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: داوای وەسیلەم بۆ لە خوا بکەن، چونکە بێگومان هیچ کەسێك نیە لە دنیا داوای وەسیلەم بۆ بکات، ئیللا بۆی دەبمە شاهێد یان شەفاعەتی بۆ دەکەم لە ڕۆژی دوایی.**

{عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «الْوَسِيلَةُ دَرَجَةٌ عِنْدَ اللهِ، لَيْسَ فَوْقَهَا دَرَجَةٌ، فَسَلُوا اللهَ أَنْ يُؤْتِيَنِي الْوَسِيلَةَ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[(٣)]

---

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٤٨٦)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٢٠٣٥)).

٢) (رَوَاهُ الطَّبَرَاني في (الأوسط): (٦٣٣)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٣٦٣٧)).

٣) (رَوَاهُ أَحْمَد: (١١٨٠٠)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٣٥٧١)).

واتە: ئەبوو سەعید خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: وەسیلە پلەیەکە لە لای خوا، هیچ پلەیەکی دیکە نیە لەو بەرزتربێ، داوا لە خوا بکەن وەسیلەم بداتێ.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «سَلُوا اللهَ لِي الْوَسِيلَةَ»، قَالُوا: يَا رَسُوْلَ اللهِ! وَمَا الْوَسِيلَةُ؟ قَالَ: «أَعْلَى دَرَجَةٍ فِي الْجَنَّةِ، لا يَنَالُهَا إِلاَّ رَجُلٌ وَاحِدٌ أَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَنَا هُو»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[1]

واتە: ئەبوو هوڕەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: داوای وەسیلەم بۆ لە خوا بکەن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! وەسیلە چییە؟ فەرمووی: بەرزترین پلەیە لە بەهەشت، تەنیا بۆ یەك پیاوە، بە هیوام ئەوە من بم.

{عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ قَالَ: حِينَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ، اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلاَةِ الْقَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ، وَالْفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ، إِلاَّ حَلَّتْ لَهُ الشَّفَاعَةُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[2]

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵلا خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك گوێی لە بانگ بوو، لەو کاتەدا گوتی: خوایە! ئەی پەروەردگاری ئەم بانگەوازە تەواوە، وە ئەم نوێژە دامەزراوە، ببەخشە بە موحەممەد ﷺ پلەی وەسیلە، وە (فَضِيلَة)و بیبە بۆ ئەو شوێنە سوپاسکراوەی کە بەڵێنت پێداوە، حەتمەن شەفاعەتی بۆ پێویست دەبێ لە ڕۆژی دوایی.

---

[1] (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٣٦١٢)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح سُنَن التِّرمِذِيُّ): (٢٨٥٧))

[1] (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٥٨٩))

## سوودەکانی صەڵاوات ناردن بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ

١)- فەرمانی خوای بەرزت بە جێهێناوە.

٢)- دووعات بۆ بەرزتر بوونەوەی پلەو پایەی پێغەمبەر کردوە (الوسیلة).

٣)- بە هەر صەڵاواتێك ناردنێکت، دە صەڵاواتت لەسەر لێ دەدرێ لەلایەن خوا.

٤)- دە پلە بەرز دەبیەوە.

٥)- دە چاکەت بۆ دەنووسرێ.

٦)- دە گوناحو خراپەت لێ دەسڕێتەوە.

٧)- دووعات قبووڵ دەبێ ئەگەر سەرەتا صەڵاواتت ناردبێ.

٨)- شەفاعەتت بۆ دەکرێ لە ڕۆژی قیامەت.

٩)- لە پێغەمبەر نیزیك دەبیەوە لە ڕۆژی دوایی.

١٠)- خۆشەویستیو گوێڕایەڵیت بۆ پێغەمبەر ﷺ بەردەوام زیاد دەکات.

١١)- پێغەمبەر ﷺ سەلامت بۆ دەنێرێتەوە.

١٢)- بەرەکەت دەکەوێتە تەمەنو ئیشو کارت.

١٣)- بەردەوام خوا باست دەکات لە نێو فریشتەکان.

١٤)- ڕێگەی چوونە بەهەشتت بۆ خۆش دەبێ.

١٥)- نوورێکی تایبەتت دەبێ لەسەر پردی صیـراط.

١٦)- دڵ تووندیو خەمو پەژارەت نامێنێ.

٢٠ فەرموودە

# بەشی چوارەم

# پایەو پاداشت لەسەر ڕەوشتە بەرزو پەسندەکان

# پایەو پاداشتی ڕەوشتە بەرزو پەسندەکان
# واتاو پێناسەی (حُسنُ الخُلُق)

**(أ)- لە ئەسڵی زماندا:**

خاوەنی کتێبی (مختار الصحاح) دەڵێ: (الحُسْنُ: ضِدُّ القُبح)، واتە: (حُسْن) پێچەوانەی (قُبح)ە، یانی: ناشیرین، کەواتە: (حُسْن) واتە: جوانو باش.

(راغب الأصفهاني) دەڵێ: (الخَلْقُ وَالخُلْقُ "وَالخُلُقُ" في الأَصْلِ وَاحِدٌ، لَكِنْ خُصَّ الخَلْقُ بِالهَيْئَاتِ وَالأَشَكَالِ وَالصُّوَرِ المُدْرَكَةِ بِالبَصَرِ، وَخُصَّ الخُلُقُ بِالقُوَى وَالسَّجَايَا المُدْرَكَةِ بِالبَصِيرَةِ)، واتە: (خَلْقُ وَخُلْقُ وَالخُلُقُ) هەرسێکیان لە بنەڕەتدا یەکن، بەڵام (خَلْقُ) تایبەت کراوە بە پێکهاتەو شکلو شێوە کە بە چاو دەبینرێ، وە (خُلُقُ)یش تایبەت کراوە بە سروشتی ئینسان کە بە عەقڵو دڵ هەستی پێ دەکرێ، واتە: هەڵسوکەوتی ئینسان.

**(ب)- لە زاراوی شەرعدا:**

(فَهي تَطهِر صَاحِبهَا مِنْ آفات اللِّسَانِ وَالجِنان، وَتَرتقي بِهِ إلى مَرَاتبِ الإحْسَان مَعَ خَالقِهِ وَمَعَ سَائر النَّاس)، بریتیە لەو سیفەتەی کە خاوەنەکەی پاك دەکاتەوە لە خراپیەکانی زارو دڵ (واتە: قسەی بێ جێو خوتخوتەو وەسوەسەی خراپی نێو دڵ) وە بەرزی دەکاتەوە بۆ پلەی چاکەکاری (واتە: بە جۆرێك هەڵسوکەوت دەکات، وەك ئەوەی خوا ببینێ، ئەگەرنا دڵنیایە کە ئەگەر ئەویش خوا نابینێ، ئەوە بە تەئکید خوا ئەو دەبینێ) وە دەبێتە کەسێکی چاکەکار لەگەڵ خوا کە دروستکەریەتی، وە هەروەها لەگەڵ هەموو خەڵکیش کەسێکی زۆر چاکەکار دەبێ.

وە بە دڵنیاییش ڕەوشت جوانی بریتیە لەو سیفەتانەی کە لە قورئانو فەرموودە بەپێزەکانی پێغەمبەر ﷺ، بە پەسند زانراون،وەك: ئارامگریی، خۆ بە کەمگریی، نەرمو

نیانی، لێبوردەیی، ڕاستگۆیی، دەستپاکیی، بەخشندەیی، ڕێزگرتنی خەڵك و، قسە خۆشیی و، هەڵسوکەوتی جوان و، جگە لەوانەش، وە هیچ گومانی تێدانیە کەسێك کە ڕەوشتی جوانبێ، پلەیەکی بەرز لە لای خواو ڕێزێکی زۆری لە نێو دڵی خەڵکی دا دەبێ، لەبەر ئەوەی فەرمانی خوای بێ وێنەی جێبەجێکردوە، چونکە خوای کاربەجێ لە قورئانی پیرۆزدا پێش فەرمان کردن بە ئەنجامدانی نوێژو زەکات، فەرمانی بە ڕەوشت جوانیی و قسەی باش کردن لەگەڵ خەڵك کردوە، وەك لە سوورەتی (البقرة)دا فەرموویەتی: ﴿وَقُولُوا۟ لِلنَّاسِ حُسْنًا ﴿٨٣﴾﴾، واتە: قسەیەك بکەن لەگەڵ خەڵك کە جوان و باش و چاك بێ، بە کەڵك بێ، وە نوێژ بەرپا بکەن، وە زەکاتیش بدەن.

ئنجا چەندان ئایەت دەربارەی ڕەوشتە جوانەکانی وەك: چاکەکاریی و بەزەیی و دڵنەرمیی و لێبوردەیی و ئارامگریی و بەخشین و سەخاوەتیی و .... هتد، هاتوون، بۆ ئەوەی ئێمەی مسوڵمان دەستیان پێوە بگرین و لە خۆمانیاندا بەرجەستە بکەین و خۆمانیان پێ برازێنینەوە، تاکو ببینە مسوڵمانێکی خاوەن بەها بەرزو سیفەت پەسند، بەو هۆیەوەش لە خوای بەرزەوە نیزیك ببینەوە، سەرەتاش چەند ئایەتێك لەوبارەوە دەنووسین:

خوای پەروەردگار لە وەسفی کەسانی چاکەکارو بەخشەر لە پێناوی خوا کە یەکێکە لە ڕەوشتە بەرزو پەسندەکانی ئینسانی ئیماندارو پارێزکار فەرموویەتی:

﴿لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُوا۟ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾﴾ البقرة.

واتە: چاکە ئەوە نیە کە ڕووی خۆتان بکەنە لای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، بەڵکو چاکە چاکەی کەسێکە بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی و فریشتان و کتێب و پێغەمبەران بێنێ و

ماڵی خۆیشی وێڕای خۆشویستنیشی بە خزمانو هەتیوانو نەدارانو ڕێبوارانو سواڵکەرانو لە ئازادکردنی کۆیلان دا ببەخشێ، وە نوێژ بەرپا بکاتو زەکات بدا، وە بەجێ هێنانی پەیمان کە پەیمانیان دا، وە خۆڕاگران لە حاڵەتی پێویستیو نەخۆشییو لە کاتی جەنگ دا، ئا ئەوانە کەسانێکن ڕاست دەکەنو ئەوانەن پارێزکاران.

وە لە مەدحی ڕەوشتە بەرزەکانی پێغەمبەر ﷺ یشدا فەرموویەتی: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾القلم، واتە: بێگومان تۆ (ئەی موحەممەد ﷺ) لەسەر خووو ڕەوشتێکی زۆر گەورەو بەرزی.

پاشان لە سوورەتی (الحجرات)یش دا باسی خۆشەویستترینو بەڕێزترین کەسمان بۆ دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾

واتە: ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە دروستمان کردوون لە نێرو مێ، وە کردوومانن بە چەند گەلو هۆزەوە تاکو یەکدی بناسن، بەڕاستی بەڕێزترینتان لە لای خوا پارێزکارترینتانە، وە بێگومان خوا زانای شارەزایە.

کە دیارە بێگومان پەسندترینو بەرزترین سیفەتیش بریتیە لە پارێزکاریی، وە خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الفرقان)یش دا مەدحی بەندە هەڵبژێراوەکانی خۆی دەکاتو بە چەند سیفەتێکی جوانو بەرز پێناسەیان دەکات بۆ ئەوەی بناسرێنەوەو جیابکرێنەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَٰمًا ﴿٦٤﴾ ﴾

واتە: وە بەندە تایبەتی یەکانی خوای بەبەزەیی کەسانێکن بە ویقارو نەرمی دەڕۆن بەسەر زەوی دا (بێ لووت بەرزییو کەشخەو فیز کردن) وە کاتێك نەزانو نەفامەکان (بە گوفتاری ناشیرن) لەگەڵیان بدوێن، قسەیەك دەکەن کە گوناح نەبێت (یاخود ڕوویان

لێ وەردەچەرخێنن و بەجێیان دێڵن)، وە ئەو (بەندانە) کەسانێکن لە شەودا بۆ پەروەردگاریان سوجدە بەرن و شەو نوێژ دەکەن.

وە لە سوورەتی (فصلت)یش باسی یەکێك لە ڕەوشتە جوانەکانمان بۆ دەکات دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَسْتَوِي ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ وَلِيٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ ﴾

واتە: (هەرگیز) چاکەو خراپە چۆن یەك نین بە چاکترین شێوە وەڵامی (خراپە) بدەرەوە، ئەوسا کە لە نێوان تۆو ئەودا دوژمنایەتی هەیە وەکو دۆستێکی دڵسۆز وگیانی بە گیانی لێ دێت . وە بەم ئاستە ناگات کەسانێ نەبێ کە خۆ ڕادەگرن و بە صەبرن، وە پێی ناگات مەگەر کەسێ کە خاوەنی بەشی هەرە گەورە بێ لە (بەهەشت).

ئنجا لە فەرمایشتێکدا پێغەمبەر ﷺ زۆر جوان بۆمان پێناسەی (بِـر) واتە: چاکە، وە (إثم) واتە: خراپە دەکات، کە زیاتر بەرچاومان ڕۆشن دەکاتەوە، بۆ ئەوەی لە ماناکەی تێبگەین، فەرموودەکە بەم شێوەیە: {عَنِ النَّوَّاسِ بْنِ سِمْعَانَ الأَنْصَارِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): عَنِ الْبِرِّ وَالإِثْمِ؟ فَقَالَ: «الْبِرُّ حُسْنُ الْخُلُقِ، وَالإِثْمُ مَا حَاكَ فِي صَدْرِكَ وَكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ»} **حديثٌ صحيحٌ**[1]

واتە: نەوواسی کوڕی سەمعانی ئەنصاڕیی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی چاکەو خراپە؟ فەرمووی: چاکە ڕەوشت جوانییە، وە خراپەش بریتیە لەو شتەی لە نێو سینەت دایەو پێت ناخۆشەو حەزناکەی خەڵك پێی بزانێ.

{عَنْ عَلِيٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ فِي الْجَنَّةِ غُرَفًا تُرَى ظُهُورُهَا مِنْ بُطُونِهَا، وَبُطُونُهَا مِنْ ظُهُورِهَا، فَقَامَ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ:

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٦٦٨٠))

لِمَنْ هِيَ يَا رَسُولَ اللهِ ؟ قَالَ: هِيَ لِمَنْ قَالَ طَيِّبَ الْكَلاَمَ، وَأَطْعَمَ الطَّعَامَ، وَأَفْشَى السَّلاَمَ، وَصَلَّى بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[1]

**واتە: ئیمامی عەلی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی کۆشکو خانووی وا لە بەهەشت هەن دەرەوەی لە ناوەوەی دەبینرێ، وە ناوەوەی لە دەرەوەی دەبینرێ، پیاوێکی دەشتەکی هەڵساو گوتی: ئەوە هی کێیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەوە هی ئەو کەسەیە کە قسەی خۆشو زمان شیرین بێو نانبدەربێو سەلام بڵاوبکاتەوەو بە شەو نوێژ بکات لە کاتێکدا خەڵك خەوتوون.**

{عَنْ أَبِي أُمَامَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَنَا زَعِيمٌ بِبَيْتٍ فِي رَبَضِ الْجَنَّةِ لِمَنْ تَرَكَ الْمِرَاءَ، وَإِنْ كَانَ مُحِقًّا، وَبِبَيْتٍ فِي وَسَطِ الْجَنَّةِ، لِمَنْ تَرَكَ الْكَذِبَ، وَإِنْ كَانَ مَازِحاً، وَبِبَيْتٍ فِي أَعْلَى الْجَنَّةِ، لِمَنْ حَسَّنَ خُلُقَهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

**واتە: ئەبی ئومامە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: من گرەنتی خانووێك لە دەوروبەری بەهەشت دەکەم بۆ کەسێك کە واز لە موناقەشەو دەمەقاڵێ دەهێنێ هەرچەندە لەسەر هەقیش بێ، وە بە خانووێك لە ناوەڕاستی بەهەشتێ بۆ کەسێك کە واز لە درۆکردن دەهێنێ ئەگەر بۆ نوکتەو گاڵتەشی بێ، وە بە خانووێك لە بەرزترین شوێنی بە هەشت بۆ کەسێك کە خاوەنی جوانترین ڕەوشت بێ.**

{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ الرَّجُلَ لَيُدْرِكُ بِحُسْنِ خُلُقِهِ، دَرَجَات قَائِمِ اللَّيْلِ صَائِمِ النَّهَارِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[3]

**واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی پیاو (یان ژن) بە هۆی ڕەوشت جوانییەوە دەگاتە پلەو پایەی کەسێك کە بە شەوان شەو نوێژ بکاتو بە ڕۆژیش بەڕۆژوو بێ.**

---

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (١٩٨٤)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (المشكاة): (٢٣٣٥))

٢) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (٤٨٠٢)، وَحَسَّنَهُ العلاَّمَة الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٢٧٣))

٣) (رَوَاهُ البَيْهَقِي في (شعب): (٧٩٩٨)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٧٩٥))

{عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدِ عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ اللهَ تَعَالَى كَرِيْمٌ يُحِبُّ الْكُرَمَاءَ، جَوَادٌ يُحِبُّ الْجَوْدَةَ، وَيُحِبُّ مَعَالِي الأَخْلاَقِ، وَيَكْرَهُ سَفْسَافَهَا»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[١]

**واته: عامیری كوڕی سەعد له بابی دەگێڕێتەوه خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خوا بەرزو بەڕێزەو بەڕێزانی خۆشدەوێ، وه بەخشەرەو بەخشەرانی خۆشدەوێ، وه سیفەت‌و ڕەوشته بەرزەكانی خۆشدەوێ، سیفەت‌و ڕەوشته پەست‌و سووكەكانی خۆشناوێ.**

{عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَا مِنْ شَيْءٍ أَثْقَل فِي الْمِيزَان مِنْ حُسْنِ الْخُلُقِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[٢]

**واته: ئەبوو دەرداء خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ شتێك نیه له تەرازووی (چاكەكاندا) قورستربێ له ڕەوشت جوانی.**

{عَنْ أُسَامَةَ بن شَرِيكٍ، قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَأَنَّ عَلَى رُءُوسِنَا الطَّيْرَ، مَا يَتَكَلَّمُ مِنَّا مُتَكَلِّمٌ إِذْ جَاءَهُ أُنَاسٌ، فَقَالُوا:[وَمِنْ قَوْلِهِم]: فَمَنْ أَحَبُّ عِبَادِ اللهِ إِلَى اللهِ؟ قَالَ: «أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[٣]

**واته: ئوسامەی كوڕی شەریك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: ئێمه دانیشتبووین له لای پێغەمبەر ﷺ وەك ئەوەی كه باڵنده لەسەر سەرمان هەڵنیشیبێ، هیچ یەكێك له ئێمه قسەی نەدەكرد، كاتێك خەڵك دەهاتن بۆ لای قسەیان دەكرد (له یەكێك له قسەكانیان گوتیان): خۆشەویسترین بەندەی خوا له لای خوا كێیه؟ فەرمووی: ئەوەیان كه ڕەوشتی له هەموویان جوانتره.**

---

١) (رَوَاهُ ابْنُ أَبي الدنيا في (مَكَارم الأَخْلاَق)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الأَلباني في (صحيح الجامع): (١٨٠٠))

٢) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (٤٧٠١)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الأَلباني في(صحيح الترغيب والترهيب): (٢٦٤١))

٣) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ: (٤٧١)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الأَلباني في (السلسلة الصحيحة): (٤٣٢))

{عَنْ أَبِي ذَرٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «اتَّقِ اللهِ حَيْثُمَا كُنْتَ، وَأَتْبِعْ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا، وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**(١)

**واتە: ئەبوو زەڕ خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: لە خوا بترسە لە هەر شوێنێك بیت، هەر خراپەیەکیشت کرد چاکەیەکی بە دوادا بکە خراپەکەت دەسڕێتەوە، وە بە ڕەوشتی جوان هەڵسوکەوتو مامەڵە لەگەڵ خەڵکی دا بکە.**

{عَنْ عَبدِ اللهِ بِنِ عَمرِو رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «أَلاَ أُخْبِرُكُم بِأَحِبِكُم إِلَيَّ وَأَقْرَبُكُمْ مِنِّي مَجْلِساً يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟»، فَسَكَتَ الْقَومِ، فَأَعَادَهَا مَرَّتَينِ أَوْ ثَلاَثاً، قَالَ الْقَومُ: نَعَمْ يَا رَسُوْلَ اللهِ، قَالَ: «أَحْسَنُكُم خُلُقاً»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ**(٢)

**واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە خوا لێیان ڕازی بێ، کە بیستوویەتی لە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: ئایا هەواڵتان بدەمێ بە خۆشەویسترینتان لە لای من، وە بە نیزیکترینتان لە مەجلیسی من لە ڕۆژی قیامەت؟ خەڵکەکە بێ دەنگ بوون، دووجار یان سێ جار فەرموویەوە، خەڵکەکە گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ئەو کەسەتان کە لە هەمووتان ڕەوشتی جوانترە.**

{عَنْ جَابِرِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ اللهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَال، وَيُحِبُّ مَعَالِيَ الأُمُورِ، وَيَكْرَهُ سَفْسَافَهَا»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(٣)

**واتە: جابیر خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی خوا جوانەو جوانیشی خۆشدەوێ، وە کارو کردەوەی بەرزی خۆشدەوێو کارو کردەوەی کەمو سووکی خۆشناوێ.**

---

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ:(١٩٨٧)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (المشكاة): (٥٠٨٣)

٢) (رَوَاهُ أَحْمَد: (٦٧٣٥)، وَالبُخَارِي في (الأدب المفرد): (٢٧٢)، وَقَالَ الشيخ الألباني: حَسَنٌ صَحِيحٌ).

٣) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ في (الأوسط): (٦٩٠٦)، وَصَحَّحَهُ العلاَّمَة الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٦٢٦))

{عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِمَنْ تَحْرُمُ عَلَيْهِ النَّارُ»؟ قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ قَالَ: «عَلَى كُلِّ هَيْنٍ لَيْنٍ قَرِيْبٍ سَهْلٍ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[١]

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا هەواڵتان بدەمێ بە کەسێك کە ئاگری لەسەر حەرام کراوە؟! گوتمان: بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا ! فەرمووی: (ئاگری دۆزەخ) حەرام کراوە لەسەر هەموو کەسێکی نەرمو نیزیكو ئاسانکەر (لە مامەڵە).**

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى الله عَلَيه وسَلَّم): «أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيْمَاناً أَحْسَنُهُمْ خُلُقاً، وَإِنَّ حُسْنَ الْخُلُقِ لِيَبْلُغُ دَرَجَةَ الصَّوْمِ وَالصَّلاَةِ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[٢]

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو ئیمانداره ئیمانی کامڵە کە خاوەنی جوانترین ڕەوشتە، چونکە بەڕاستی ڕەوشت جوانی دەگاتە پلەی نوێژو ڕۆژوو گرتن (مەبەست نوێژو ڕۆژووی سوننەتە).**

{عَنْ أَبِي عِنَبَةَ الْخَوْلاَنِي رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: يَرْفَعُهُ إِلَي النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ للهِ تَعَالَى آنِيَةً مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ، وَآنِيَةُ رَبِّكُمْ قُلُوبُ عِبَادِهِ الصَّالِحِينَ، وَأَحَبُّهَا أَلْيَنُهَا وَأَرَقُّهَا»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[٣]

**واتە: ئەبی عینەبەی خەوەلانی خوا لێی ڕازی بێ بەرزی کردۆتەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ (واتە: لەو دەگێڕێتەوە) کە فەرموویەتی: بێگومان خوای بەرز قاپو جامی هەن لەسەر زەوی، وە قاپو جامی پەروەردگارتان دڵی بەندە چاکەکانیەتی، وە خۆشەویسترینیشیان نەرمو نیانترینیانن.**

---

١) (رَوَاهُ ابْنُ حِبَّانَ: (٤٧٠)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٢٦٠٩)، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: صَحيح بشَوَاهِدِهِ)

٢) (رَوَاهُ البَزَّار: (٧٤٤٥)، وَصَحَّحَهُ العلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٥٩٠))

٣) (مُسْند الشاميين: (٤٨٠)، وَصَحَّحَهُ العلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٦٩١))

# پایەو پاداشتی

## نەرمو نیانیو هێدیی مەندیی

نەرمو نیانیو لەسەر خۆییو دڵنەرمی، جگە لەوەی یەكێكە لە سیفەتە جوانەكانی خوای بێ وێنە، وەك دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ وَإِن تَسۡـَٔلُواْ عَنۡهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلۡقُرۡءَانُ تُبۡدَ لَكُمۡ عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهَاۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٞ ﴿١٠١﴾ قَدۡ سَأَلَهَا قَوۡمٞ مِّن قَبۡلِكُمۡ ثُمَّ أَصۡبَحُواْ بِهَا كَٰفِرِينَ ﴿١٠٢﴾ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! لە بارەی شتانێكەوە پرسیار مەكەن كە ئەگەر بۆتان دەربكەون ناڕەحەتتان بكەن، وە ئەگەر لە كاتی دابەزێنرانی قورئاندا پرسیاریان لەبارەوە بكەن بۆتان دەردەكەون، خوا چاوپۆشیی لێیان كردوە وە خوا لێبوردەی هێدی مەندە. پێش ئێوە كۆمەڵێك ئەو جۆرە پرسیارانەیان كردن (بەڵام) دوایی پێیان بێبڕوا بوون. وە سیفەتێكی زۆر تایبەتی پێغەمبەریش ﷺ بووە، بە شایەدیی خوای زاناو شارەزا وەك لە سوورەتی (آل عمران)دا فەموویەتی:

﴿ فَبِمَا رَحۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمۡۖ وَلَوۡ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ لَٱنفَضُّواْ مِنۡ حَوۡلِكَۖ فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ فَإِذَا عَزَمۡتَ فَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ ﴾

واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) بەهۆی بەزەیی خواوە بۆیان نەرم بووی، ئەگەر قسە ڕەقو دڵ ڕەق بای هاوەڵانی (بەڕێزت) لە دەورت دەپرژانو بڵاوەیان دەكرد، كەواتە: لێیان ببورەو داوای لێ خۆشبوونیان بۆ بكە لە خوا، وە ڕاوێژیان پێ بكە لە كاروباردا جا كاتێك بڕیارتدا ئەوە پشت بە خوا ببەستە، بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش دەوێت كە پشت بە خوا دەبەستن.

بێگومان ئه‌م ئایه‌ته به‌پێزه به‌هێزترین به‌ڵگه‌یه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ خاوه‌نی دڵێكی نه‌رم‌و به‌زه‌ییه‌كی زۆر بووه، ئێمه‌ش كه خۆمان به شوێن پێ هه‌ڵگری ئه‌و ده‌زانین، ده‌بێ هه‌وڵبده‌ین ئه‌و سیفه‌تانه‌ی له‌ودا هه‌بوون له خۆمانی به‌رجه‌سته بكه‌ین، تاكو بتوانین به هه‌مان ڕێگاو ڕێبازدا بڕۆین، كه پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ پێیدا ڕۆیشتوه‌و خه‌ڵكی بۆ لای دینی خوا بانگ كردوه.

{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لَهَا: «إِنَّ اللهَ رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ وَيُعْطِي عَلَى الرِّفْقِ، مَالاَ يُعْطِي عَلَى الْعُنْفِ وَمَالاَ يُعْطِي عَلَى مَا سِوَاهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[١]

واته: له عائیشه‌وه خوا لێی ڕازی بێ، گێڕدراوه‌ته‌وه كه پێغه‌مبه‌ر ﷺ پێی فه‌رمووه: به‌ڕاستی خوا نه‌رم‌و نیانه، نه‌رم‌و نیانیشی خۆشده‌وێ، وه ئه‌و (پاداشته‌ی) له‌سه‌ر نه‌رم‌و نیانی ده‌یبه‌خشێ له‌سه‌ر توندی نایبه‌خشێ، وه له‌سه‌ر غه‌یری ویش نایبه‌خشێ.

{عَنِ أَشَجّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ فِيكَ لَخُلُقَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللهُ عَزَّ وَجَلَّ»، قُلْتُ: وَمَا هُمَا يا رَسُولُ اللهِ؟ قَالَ: «الْحِلْمُ وَالْحَيَاءُ» قَالَ: قُلْتُ: قَدِيمًا كَانَ فِيَّ أَوْ حَدِيثًا؟ قَالَ: «لا، بَلْ قَدِيمًا»، قُلْتُ: الْحَمْدُ للهِ الَّذِي جَبَلَنِي عَلَى خُلُقَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللهُ عَزَّ وَجَلَّ}[٢]

واته: ئه‌شه‌ج خوا لێی ڕازی بێ، ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر ﷺ پێی فه‌رمووم: دوو سیفه‌تت تێدان، خوای زاڵی پایه‌دار خۆشی ده‌وێن، منیش گوتم: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ! ئه‌و دوو سیفه‌ته چی‌و چین؟ فه‌رمووی: نه‌رم‌و نیانی

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٦٧٦٦))
٢) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ في (الأدب المفرد): (٥٨٤)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الأدب المفرد): (٤٥٥))

بە شەرمو حەیایی، دەڵێ: گوتم: ئایا ئەو سیفەتانەم هەر پێشتر تێدا هەبوون، یان تازە لێم پەیدابوون؟ فەرمووی: نەخێر، هەر پێشتر ئەم سیفەتانەت تێدا هەبوون، گوتم: سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە لە سەر دووسیفەتی سروشتاندووم، خۆی خۆشی دەوێن.

{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ الرِّفْقَ لاَ يَكُونُ فِي شَيْءٍ إِلاَّ زَانَهُ، وَلاَ يُنْزَعُ مِنْ شَيْءٍ أَلاَّ شَانَهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[١]

واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی نەرمو نیانی لە هەر شتێك دا هەبێت جوانی دەکات، وە لە هەر شتێك نەبێ ئیللا ناشیرینی دەکات.

{عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ أُعْطِيَ حَظَّهُ مِنَ الرِّفْقِ، فَقَدْ أُعْطِيَ حَظَّهُ مِنَ الْخَيْرِ، وَمَنْ حُرِمَ حَظَّهُ مِنَ الرِّفْقِ، فَقَدْ حُرِمَ حَظَّهُ مِنَ الْخَيْرِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[٢]

واتە: ئەبوو دەرداء خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بەشە نەرمو نیانیی خۆی پێدرابێ ئەوە بەشە خێری خۆی دەستکەوتووە، وە هەر کەسێك لە بەشە نەرمو نیانیی خۆی بێ بەش بووبێ ئەوە لە بەشە خێری خۆی بێ بەشبووە.

{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لأَشَجِّ: أَشَجِّ عَبْدِ الْقَيْسِ: «إِنَّ فِيكَ خَصْلَتَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللهُ: الْحِلْمُ وَالأَنَاةُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[٣]

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٦٧٦٧))

٢) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٢٠١٣)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٦٠٥٥))

٣) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (١٢٦))

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە ئەشەجی فەرمووی (ئەشەجی عەبدولقەیس): بەڕاستی دوو سیفەتت تێدا هەن خوا خۆشی دەوێن، ئەوانیش: هێدیی و مەندیی و لەسەرخۆیی یە.

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَرْجَسْ الْمُزَنِي رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «التُّؤَدَةُ وَالإِقْتِصَادُ وَالسَّمْتُ الَحسن: جُزءٌ مِنْ أَرْبَعَةٍ وَعِشْرِينَ جُزءاً مِنَ النُّبُوَّةِ»} **حديث حسنٌ**[1]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سەرجەسی موزەنی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لەسەرخۆیی و میانەیی و ڕەزا سووکیی و ڕواڵەت جوانی بەشێکن لە بیست و چوار بەشی پێغەمبەرایەتی!!

## بەسەرهاتێك لەم بارەیەوە

عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەگێڕێتەوە، دەڵێ: کۆمەڵێك جوولەکە هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ گوتیان: (السَّامُ عَلَيْكُمْ) واتە: مردن لەسەر ئێوە، مردن بۆ ئێوە، دەڵێ: منیش تێگەیشتم، پێم گوتن: (عَلَيْكُم السَّامُ وَاللَّعْنَةَ) واتە: مردن لەسەر ئێوە، ئێوە بمرن و نەفرینیشتان لەسەر بێ، جا دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ گوتی: عائیشە لێیان گەڕێ، خۆت ناڕەحەت مەکە، خوا نەرم و نیانی لە هەموو شتێك پێ خۆشە، دەڵێ: منیش گوتم: ئاخر ئەی پێغەمبەری خوا ! تۆ نەتبیست ئەوان چیان پێگوتین؟! دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: با گوێم لێ بوو چیان گوت، منیش گوتم: (وعَلَيْكُم) واتە: وە لەسەر خۆشتان، یانی: چیتان بە ئێمە گوت، ئەوەش بۆ ئێوە (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ: (٥٩٠١).

---

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٢٠١٠)، وَالطَّبَرَانِي في (الأوسط): (١٠١٧)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح سُنَن التِّرمِذِيُّ))

# پایەو پاداشتی ڕەحم‌و بەزەیی

خوای پەروەردگار مەدحی ئەو کەسانە دەکات کە خاوەنی ئەو سیفەتە پەسندەن، وە لە سووڕەتی (البلد)دا دوای ئەوەی باسی ئەو کەسانە دەکەن کە کەشخەو فیز دەکەن بە ماڵ‌و سامانیان‌و ئەسڵی خۆیان لە بیر چۆتەوە، ئنجا باسی هەندێك سیفەتی جوانی مسوڵمان دەکات وەك: ئازاد کردنی کۆیلەو نان دانی نەداران‌و هەژاران‌و، هەتیوان‌و، دوایی دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَوَاصَوْاْ بِٱلصَّبْرِ وَتَوَاصَوْاْ بِٱلْمَرْحَمَةِ ﴿١٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْمَيْمَنَةِ ﴿١٨﴾ ﴾، واتە: سەرەڕای ئەمانەش لەو کەسانە بێ کە بڕوایان هێنابێ‌و ئامۆژگاریی یەکدیان کردبێ بە ئارامگرتن‌و بەبەزەیی‌و میهرەبانی، ئا ئەوانە هاوەڵانی دەستی ڕاستن.

جا دیارە کە پێغەمبەری خۆشەویستمان، چاوساغ‌و ڕێ پێشاندەرمان، چەندان فەرمایشتی بە نرخی هەن، کە ئەگەر ئێمەی مسوڵمان پێیانەوە پابەند بین، بە دڵنیایی بەبەر ئەم ئایەتەی سەرەوە دەکەوین، وە حسێب کردنیشمان لە کۆمەڵی (أَصْحَابُ الْمَيْمَنَةِ) گەورەترین پاداشتە، وە لە فەرمایشتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {مَثَلُ المُؤْمِنِينَ في تَوَادِّهِمْ وتَرَاحُمِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ، مَثَلُ الجَسَدِ إِذَا اشْتَكَى مِنْهُ عُضْوٌ تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ الجَسَدِ بِالسَّهَرِ والحُمَّى} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: نموونەی بڕواداران لە یەکدی خۆشویستن‌و بەزەیی هاتنەوەو دڵسۆزییان لەگەڵ یەکدی دا، وەك جەستەیەك وایە ئەگەر ئەندامێکی ناتەواو نەساغ بوو، هەموو جەستە بەشداریی دەکات بە نەنووستن‌و شەونخونیی‌و تا لێهاتن.

وە سیفەتی بەزەیی دەتوانرێ بگوترێ: بەرزترین سیفەتەو، چڵە پۆپەی هەموو سیفەت‌و، ڕەوشتە بەرزەکانە، بەبەڵگەی ئەوە کە خوای پەروەردگار سەدان سیفەتی بەرزو جوان‌و تەواوو بێ سنووری هەن، بەڵام ئەگەر سەرنج بدەین لە سەرەتای هەموو

---

١) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ: (٥٦٦٥)، وَمُسْلِمٌ: (٦٧٥١))

سوورەتەکانی قورئان تاکە سیفەتێك کە خۆی پێ وەسف دەکات سیفەتی بەزەیی یە، دەفەرموێ: (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ)، وەك دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٢٩﴾﴾ النساء، واتە: خۆتان مەکوژن خوا لەگەڵتان بەبەزەییە. وە لە شوێنی دیکە دەفەرموێ: ﴿فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٤﴾﴾ المائدة، واتە: بزانن و دڵنیابن بێگومان خوا لێبوردەی بەبەزەییە.

کەواتە: ئێمەی مسوڵمان سەرەتا گرنگیی و گەورەیی ئەم سیفەت لەوە دەبینینەوە کە خوای پەروەردگار خۆی پێ وەسف کردوە، پاشان کە سەیری فەرمایشتە موبارەکەکانو ژیاننامە پڕ پێزو بەرەکەتەکەی پێغەمبەرمان ﷺ دەکەین، بۆمان دەردەکەوێ کە تاکە سیفەتێك وەك ڕۆژی ڕووناكو مانگی چواردە لە شەوی تاریك لێی بینراوە سیفەتی بەزەیی بووە، وە بە سەرنجدانمان لە واقیعیشدا دیارە کە هەر کەسێك خاوەنی ئەم سیفەتە بەرزە بێ کەسێکی خۆشەویستو ڕێز لێگیراو، خاوەن کەسایەتیەکی تایبەتیو مەزنە، وە خۆ دوور گرتن لەم سیفەتە بەرزە مایەی خەمو پەژارەو پەشێمانیەکی زۆرە.

{عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّمَا يَرْحَمُ اللهُ مِنْ عِبَادِهِ الرُّحَمَاءُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوای گەورە بەزەیی دێتەوە بەو بەندانەی کە بە بەزەیین.

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «الرَّاحِمُونَ يَرْحَمُهُمُ الرَّحْمَنُ، أَرْحَمُوا أَهْلَ الأَرْضِ، يَرْحَمُكم مَنْ فِي السَّمَاءِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسانەی بەزەییان دێتەوە بە یەك خوا بەزەیی پێیاندا دێتەوە، ئێوە

---

١) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٦٠١٠))
٢) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (٤٩٤١)، وَصَحَّحَهُ العلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٩٢٥))

به‌زه‌ییتان بێته‌وه به خه‌ڵكی سه‌ر زه‌وی، ئه‌وه‌ی كه له ئاسمانه به‌زه‌یی پێتان دێته‌وه (واته: خوای به‌به‌زه‌یی!!).

{عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ، عَنْ أَبِيهِ، رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنِّي لأَذْبَحُ الشَّاةَ فَأَرْحَمُهَا، قَالَ: «وَالشَّاةُ إِنْ رَحِمْتَهَا رَحِمَكَ اللهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واته: موعاویه‌ی كوڕی قوڕڕه له بابی ده‌گێڕێته‌وه خوا لێی ڕازی بێ، ڕۆژێك پیاوێك گوتی: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ! من كاتێك مه‌ڕ سه‌رده‌بڕم به‌زه‌ییم پێیدا دێته‌وه، فه‌رمووی: جا ئه‌گه‌ر تۆ به‌زه‌ییت به مه‌ڕدا بێته‌وه، ئه‌وه خواش به‌زه‌یی پێت دادێته‌وه.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «بَيْنَمَا كَلْبٌ يُطِيفُ بِرَكِيَّةٍ، كَادَ يَقْتُلُهُ الْعَطَشُ، إِذْ رَأَتْهُ بَغِيٌّ مِنْ بَغَايَا بَنِي إِسْرَائِيلَ فَنَزَعَتْ مُوقَهَا فَسَقَتْهُ فَغُفِرَ لَهَا بِهِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

واته: ئه‌بوو هوره‌یره خوا لێی ڕازی بێ ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: سه‌گێك ده‌سووڕایه‌وه به ده‌وری بیرێكی ئاو، خه‌ریك بوو تینوویه‌تی (بیخنكێنێ‌و) بیكوژێ، كاتێك یه‌كێكی گوناهبارو لاده‌ر له گوناهبارو لاده‌ره‌كانی وه‌چه‌ی ئیسرائیل (ئه‌م سه‌گه‌ی) بینی هه‌ندێك ئاوی بۆ ده‌رهێناو ئاوی پێدا، خوا به‌و هۆیه‌وه له‌و كه‌سه گوناهباره خۆشبوو.

{عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لاَ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ حَتَّى تَرَاحَمُوا» قَالُوا: كُلُّنَا رَحِيمٌ، قَالَ: «إِنَّهُ لَيْسَ رَحْمَةُ أَحَدِكُمْ أَصْحَابَهُ وَلَكِنَّهَا رَحْمَةُ الْعَامَّةِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[3]

---

١) (رَوَاهُ البَزَّار: (٣٣١٩)، وَصَحَّحَهُ العلاَّمَة الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٢٦))
٢) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ: (٣٢٨٠) وَاللَّفْظُ لَهُ، وَمُسْلِمٌ: (٥٩٩٨))
٣) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ، وَحَسَّنَهُ العلاَّمَة الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٢٢٥٣))

واتە: ئەبوو مووسای ئەشعەریی خوا لێی ڕازی بێ گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە کە فەرموویەتی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە ناچنە بەهەشتێ هەتا بەبەزەیی نەبن، گوتمان: ئێمە هەموومان بەبەزەیین، فەرمووی: ئەوەنا کە یەکێکتان بەرانبەر هاوەڵەکەی بەبەزەیی بێ، بەڵکو بەبەزەیی بوون ئەوەیە بەرانبەر هەموو خەڵکێك بەبەزەیی بی.

## بەسەرهاتێك لەم بارەیەوە (١)

{عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: أَرْسَلَتِ ابْنَةُ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) إِلَيْهِ، إِنَّ ابْنًا لِي قُبِضَ فَأْتِنَا، فَأَرْسَلَ يُقْرِئُ السَّلاَمَ وَيَقُولُ: «إِنَّ للهِ مَا أَخَذَ وَلَهُ مَا أَعْطَى، وَكُلٌّ عِنْدَهُ بِأَجَلٍ مُسَمًّى، فَلْتَصْبِرْ وَلْتَحْتَسِبْ» فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ، تُقْسِمُ عَلَيْهِ لَيَأْتِيَنَّهَا؛ فَقَامَ وَمَعَهُ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ، وَمُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وَأُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، وَزَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، وَرِجَالٌ؛ فَرُفِعَ إِلَى رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) الصَّبِيُّ وَنَفْسُهُ تَتَقَعْقَعُ كَأَنَّهَا شَنٌّ، فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ، فَقَالَ سَعْدٌ: يَا رَسُولَ اللهِ مَا هذَا؟ فَقَالَ: «هذِهِ رَحْمَةٌ جَعَلَهَا اللهُ فِي قُلُوبِ عِبَادِهِ، وَإِنَّمَا يَرْحَمُ اللهُ مِنْ عِبَادِهِ الرُّحَمَاءُ»}

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: کچێکی پێغەمبەر ﷺ لە دوای بابی نارد، کەوا کوڕەکەم وا ڕووح دەدات بێی بۆ لامان، پێغەمبەریش ﷺ یەکێکی ناردو فەرمووی: پێی بڵێ: ئەوەی خوا دەیدات دوایی دەیباتەوە ئەوە هەر هی خۆیەتی، وە هەموو شتێکیش لە لای خوا ماوەی دیاری کراوە، کەواتە: با ئارام بگرێ و چاوەڕێی پاداش بکات، بۆ جاری دووەم بە دوای بابی ناردوو سوێندیشی خوارد کە هەر دەبێ بچێتە لایان، پێغەمبەریش ﷺ هەڵسا لەگەڵ سەعدی کوڕی عوبادەو موعاذی کوڕی جەبەل و ئوبەی کوڕی کەعب و زەیدی کوڕی ثابیت و چەند پیاوێکی دیکە چوونە لای، کە منداڵەکەیان هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ ڕووحی دەداو هەناسەی تەنگ بوو بوو، وەك کوندەك (کوندە کە دۆی تێدەکرێ و دەهەژێ) فرمێسکیش لە هەردوو چاوە (گەش و جوان و موبارەکەکانی) پێغەمبەر ﷺ دەهاتنە خوارێ، سەعد خوا لێی ڕازی بێ گوتی:

---

١) حَدِيثٌ صَحِيحٌ (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ: (١٢٢٤) وَاللَّفْظُ لَهُ، وَمُسْلِمٌ: (٢١٧٤))

ئەم گریانە چییە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ؟! فەرمووی: ئەوە سۆزو بەزەییە خوا دەیخاتە دڵی بەندەکانییەوە، وە بێگومان خوای گەورە بەزەیی دێتەوە بەو بەندانەی کە بە بەزەیین.

# پایەو پاداشتی

## شەرم‌و شکۆ: ( الْحَيَاءِ )

شەرم‌و حەیا سیفەتێکی زۆر پەسندەو، سیفەتێکە بە هۆیەوە ئینسان پلەو ئەندازەی ئیمان‌و ڕەوشتەکەی دەردەکەوێ، چونکە بەشێکە لە ئیمان، وە یەکێکە لەو هۆکارانەی کە هانی ئینسان دەدات بۆ ئەنجامدانی کاری چاك، وە دووری دەخاتەوەو دەیپارێزێ لە ئەنجامدانی هەموو کارێکی خراپ،

وە بەڕاستی ئێمە لەو ڕۆژگارەدا پێویستیەکی زۆر زۆرمان بەو سیفەتە بەرزە هەیە، وە بە نەمانی ئەم ڕەوشتەش کۆمەڵگا بەرەو هەڵدێرو ئاشووب دەچێ‌و سەرەنجامی دنیاو دواڕۆژمان خراپ دەبێ، لە قورئانی پیرۆزیش باسی گرنگی گەورەیی ئەم سیفەتە کراوە، کە خوای پەروەردگار بە مەدحەوە باسی شەرم‌و شۆی ئەو دوو ئافرەتە دەکات کە یەکیان دێ بۆ لای مووساو دەڵێ بابمان دەیەوێ پاداشتی ئەو کارەت بداتەوە، دیارە مووسا هاوکاری کردن لەسەر ئاودانی مەڕەکانیان وە خوا بۆ خۆی بۆمان باس دەکاو دەفەرموێ: ﴿ فَجَآءَتۡهُ إِحۡدَىٰهُمَا تَمۡشِي عَلَى ٱسۡتِحۡيَآءٖ قَالَتۡ إِنَّ أَبِي يَدۡعُوكَ لِيَجۡزِيَكَ أَجۡرَ مَا سَقَيۡتَ لَنَاۚ فَلَمَّا جَآءَهُۥ ﴿٢٥﴾ ﴾ القصص، واتە: ئنجا یەکێك لە دوو کچەکان هات بۆ لای مووساو لە ڕێگاشدا بە شەرمەوە دەڕۆیشت، گوتی: بەڕاستی باوکم بانگت دەکات بۆ ئەوەی پاداشتی ئەوەت بداتەوە کە مەڕەکانت بۆ ئێمە ئاودا، (پێغەمبەر مووساش) لەگەڵی

ڕۆیشت... مەبەست لێرەدا بەکارهێنانی وشەی شەرم بوو لەلایەن خواوە بە مەدحەوە، وە ئەم سیفەتە سەنگی مەحەکە بۆ ناسینی ئینسانەکان، بۆیە هەموو پێغەمبەرەکانی پێشوو ئەم قسەیان کردوە:

{عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ البَدرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ مِمَّا أَدْرَكَ النَّاسُ مِنْ كَلاَمِ النُّبُوَّةِ الأُولَى: إِذَا لَمْ تَسْتَحِي، فَاصْنَعَ مَا شِئْتَ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[1]

**واتە: ئەبوو مەسعوودی بەدریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی خەڵك پێی ڕاگەیشتوە لە قسەکانی پێغەمبەرەکانی پێشوو ئەمەیە: ئەگەر شەرمت نەکرد چیت دەوێ بیکە!!**

{عَن أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «الْحَيَاءُ مِنَ الإِيْمَانِ، وَالإِيْمَانُ فِي الْجَنَّةِ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[2]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: شەرمنی لە ئیمانەوەیە، وە ئیمان هۆی چوونە بەهەشتە.**

{عَنِ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «الْحَيَاءُ وَالإِيْمَانُ قُرِنَا جَمِيعاً، فَإِذَا رُفِعَ أَحَدُهُمَا رُفِعَ الأَخَرُ»}[3]

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (خوای پەروەردگار) ئیمانو شەرمی کۆکردۆتەوە (واتە: لە هەر شوێنێك ئیمان هەبێ شەرمیش دەبێ، وە بە پێچەوانەوەش)، هەر کاتێك یەکێکیان نەما ئەویدیکەش هەڵدەگیرێو نامێنێ.**

---

١) ((رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٥٦٥٤))
٢) ((رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٢٠٠٩)، وَقَالَ: حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٤٩٥))
٣) ((رَوَاهُ البُخَارِيُّ في (الأدب المفرد): (١٣١٣)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الأدب المفرد): (٩٩١))

{عَنْ أَنَسِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَا كَانَ الْفُحْشُ فِي شَيْءٍ إِلاَّ شَانَهُ، وَمَا كَانَ الْحَيَاءُ فِي شَيْءٍ إِلاَّ زَانَهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتە: ئەنەس خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خراپی‌و بێ شەرمی لە هەر شتێك دا هەبێ مسۆگەر ناشیرینی دەكات، وە شەرم‌و حەیا لە هەر شتێك دا هەبێ مسۆگەر دەیڕازێنێتەوەو جوانی دەكات.**

{عَنْ أَبِي أُمَامَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «الْحَيَاءُ وَالْعِيُّ شُعْبَتَانِ مِنَ الإِيمَانِ، وَالْبَذَاءُ وَالْبَيَانُ شُعْبَتَانِ مِنَ النِّفَاقِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

**واتە: ئەبوو ئومامە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: شەرمنی‌و كەم قسە كردن دوو بەشن لە ئیمان، وە زمان پیسی‌و زمان لووسیش دوو بەشن لە نیفاق‌و دووڕوویی.**

**خوا پەنامان بدات لەسەر زمان پیسی‌و لووسیی، هاوكارو یارمەتیدەریشمان بێ لە بەدەستهێنانی سیفەتی كەم دوویی‌و شەرم‌و حەیایەك كە پەسندە لە شەرع دا.**

{عَنْ زَيدِ بْنِ طَلْحَةَ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لِكُلِّ دِينٍ خُلُق وَخُلُق الإِسْلاَمِ الْحَيَاء»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[3]

**واتە: زەیدی كوڕی طەڵحە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەموو ئایینێك ڕەوشتی تایبەت بە خۆی هەیە، وە ڕەوشتی ئیسلام بریتیە لە شەرم‌و حەیا.**

---

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (١٩٧٤)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٢٦٣٥))

٢) (رَوَاهُ أَحْمَد: (٢٢٣٦٦)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٢٦٢٩))

٣) (رَوَاهُ البَيْهَقِيُّ: (٧٧١٢)، وَحَسَّنَهُ العَلامة الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٩٤٠))

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «الإِيْمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ شُعْبَةً، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الإِيمَانِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(١)

**واته: ئه‌بوو هوڕه‌یره خوا لێی ڕازی بێ ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی: ئیمان حه‌فتاو ئه‌وه‌نده به‌شه‌یه، وه شه‌رم‌و حه‌یا به‌شێكه له ئیمان.**

{عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «الْحَيَاءُ لاَ يَأْتِي إِلاَّ بِخَيْرٍ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(٢)

**واته: عیمرانی كوڕی حوصه‌ین خوا لێی ڕازی بێ، ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی: هیچ كاتێك شه‌رم‌و حه‌یا نایێت مه‌گه‌ر خێرو چاكه له‌گه‌ڵ خۆی دێنێ، (ئه‌م سیفه‌ته له هه‌ر كه‌سێك دا هه‌بێ ئه‌وه حه‌تمه‌ن به خێرو چاكه بۆی ده‌گه‌ڕێته‌وه).**

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَلَى رَجُلٍ وَهُوَ يُعَاتِبُ أَخَاهُ فِي الْحَيَاءِ يَقُولُ: إِنَّكَ لَتَسْتَحِي حَتَّى كَأَنَّهُ يَقُولُ: قَدْ أَضَرَّ بِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «دَعْهُ فَإِنَّ الْحَيَاءَ مِنَ الإِيْمَانِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(٣)

**واته: عه‌بدوڵلای كوڕی عومه‌ر خوا لێیان ڕازی بێ، ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ر ﷺ به لای پیاوێك دا تێپه‌ڕ بوو پیاوه‌كه گله‌یی له براكه‌ی ده‌كرد ده‌رباره‌ی شه‌رمنی‌و، ده‌یگوت: تۆ ئه‌وه‌نده شه‌رمنی هه‌تاكو وه‌ك ئه‌وه پێی بڵێ: ئه‌و شه‌رم‌و حه‌یایه‌ت زیانی بۆت هه‌یه، پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: وازی لێ بێنه، به‌ڕاستی شه‌رمنی له ئیماندایه. (هه‌روه‌ك پێشتر باسمان كرد هه‌ر خودی شه‌رم‌و حه‌یا به‌شێكه له ئیمان!!).**

{عَنِ أَشَجِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ فِيكَ لَخُلُقَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللهُ عَزَّ وَجَلَّ»، قُلْتُ: وَمَا هُمَا يا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: «الْحِلْمُ وَالْحَيَاءُ»

---

١) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ: (٩)، وَمُسْلِمٌ: (١٦١))
٢) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ: (٥٧٦٦) وَاللَّفْظُ لَهُ، وَمُسْلِمٌ: (١٦٥))
٣) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ: (٥٧٦٧) وَاللَّفْظُ لَهُ، وَمُسْلِمٌ: (١٦٣))

قَالَ: قُلْتُ: قَدِيمًا كَانَ فِيَّ أَوْ حَدِيثًا؟ قَالَ: «لا، بَلْ قَدِيمًا»، قُلْتُ: الْحَمْدُ للهِ الَّذِي جَبَلَنِي عَلَى خُلُقَيْنِ يُحِبُّهُمَا اللهُ عَزَّ وَجَلَّ} حَدِيثٌ صَحِيحٌ[1]

واتە: ئەشەج خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: دوو سیفەتت تێدان، خوای زاڵی پایەدار خۆشی دەوێن، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو دوو سیفەتە چی‌و چین؟ فەرمووی: نەرم‌و نیانی بە شەرم‌و حەیایی، دەڵێ: گوتم: ئایا ئەو سیفەتانەم هەر پێشتر تێدا هەبوون، یان تازە لێم پەیدابوون؟ فەرمووی: نەخێر، هەر پێشتر ئەم سیفەتانەت هەبوون، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە لە سەر دووسیفەتی سروشتاندووم، خۆی خۆشی دەوێن.

## بەسەرهاتێك لەم بارەیەوە[2]

(مسمع بن عاصم ورياح القيسي) هەردووکیان دەڵێن: ئێمە ئاگادار بووین، پیاوێك هات چل دیناری بۆ ڕابیعەی عەدەوی هێنا ڕەحمەتی خوای لێ بێ، گوتی: پێویستیەکانی خۆتی پێ دابین بکە، ڕابیعەش زۆر بە کوڵ گریاو سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە گوتی: ئەو (واتە: خوا بە خۆی) دەزانێ، ئەمن شەرمی لێدەکەم داوای دنیای لێ بکەم، لە کاتێك هەموو بە دەستی ئەوە، جا چۆن پارە لە کەسێك وەربگرم کە هیچ شتێکی بە دەست نیەو هەرچی هەیتی هی ئەوە! (یانی: هی خوایە).

---

١) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ في (الأدب المفرد): (٥٨٤)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الأدب المفرد): (٤٥٥))

٢) صفة الصفوة، ذكر المصطفياة من عابدات البصرة، ج٤، ص٢٧.

# پایەو پاداشتی خۆبە کەمگرتن

خۆ بەکەمگری نیشانەی بەرزی ئیمانە، وە هۆکاری پاك بوونەوەی دڵو دەروونە لە ژەنگو ژاڵی خۆ بەزل زانین، بۆیە زۆربەی جار خۆ بە کەمگری لە قسەو کرداردا بەڵگەیە لەسەر خۆ بە کەمگری لە دڵو دەروون.

وە وشەی: (تَوَاضُع) بریتیە لە ملکەچ بوون بۆ ڕاستیو قبووڵ کردنی هەق، جا ئەم هەقە لە لای هەرکەسێك بێ، هەژاربێ یان دەوڵەمەند، بە هێزبێ یاخود بێ هێز، بچووك بێ یاخود گەورە، دۆست بێ یاخود دوژمن، بێگومان هەر کاتێك ئینسان ئەگەر لە بەرانبەر هەموو ئەو تاقمانەی باسمان کردن وەك یەك نەبوو دەبێ بزانێ کە کەسێکی خۆ بەکەمگر نیە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: {الكِبْرُ: بَطَرُ الحَقِّ وَغَمْطُ النَّاسِ} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: خۆ بە گەورەزانین بریتیە لەوەی: کابرا هەق ڕەتدبکاتەوەو وەری نەگرێ، خەڵکیش بە نزمتر لە خۆی ببینێ، (یانی: سەلامیان لێ نەکاتو قسەی خۆشیان لەگەڵ نەکاتو بە ڕوویان پێنەکەنێو حەز بکات هەر ئەوان خزمەتی بکەن، هەقی خۆیان پێنەدات... هتد،

کەواتە: ئێستا بۆمان ڕوون بۆوە مەبەست لە وشەی (تَوَاضُع) چییە؟ کە بێگومان خۆ بە کەمگری پلەی ئینسانی ئیماندار بەرز دەکاتەوە، بەبەڵگەی ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {«وَمَا تَوَاضَعَ أَحَدٌ للهِ إِلاَّ رَفَعَهُ اللهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

واتە: هەر یەکێك لەبەر خوا خۆی بە کەم بگرێو خاکی بێ مسۆگەر خوا پلەو پایەی (لە دنیاو دواڕۆژ) بەرز دەکاتەوە.

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٢٧٥) عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)

٢) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٦٧٥٧)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)

وە خوا (عَزَّوَجَلَّ) لە چەندین ئایەتی قورئانی بەڕێز باسی ئەو سیفەتە بەرزەی کردووەو جەختی لەسەر دەست پێوەگرتنی کردۆتەوە، وەك دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ٥٤ ﴾ المائدة

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! هەر کەسێك لە ئێوە هەڵگەڕێتەوە لە ئایینەکەی ئەوە بە زوویی خوا لە جیاتی ئەوان گەلو کۆمەڵێکی دیکە دەهێنێ خوا ئەوانی خۆش دەوێو ئەوانیش خوایان خۆش دەوێ، بە سۆزو بەزەیی (خۆ بە کەمگرن) بەرانبەر بڕواداران بە هێزو توندن بەرانبەر بێبڕوایان جیهاد دەکەن لەڕێی خواداو ناترسن لە سەرزەنشتی سەرزەنشت کاران، ئەوەی باسکرا چاکەو فەزڵی خوایە دەیبەخشێ بە هەر کەسێك کە خۆی بیەوێت وە خوا فرەوانی زانایە. وە بێگومان ڕستەی: (أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ) هەر مانای خۆ بە کەمگریی دەگەیەنێ.

وە خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (الفتح)دا فەرموویەتی: ﴿ مُّحَمَّدٞ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا ...



واتە: موحەممەد (ﷺ) پێغەمبەری خوایە ئەو (بڕوادارانەش) کە لەگەڵیدان بەرانبەر بێبڕوایان توندوتیژنو لە نێوان خۆیاندا بە بەزەیین دەیانبینی (هەمیشە) لە ڕکووعو سوجدە دان... !!

پاشان لە سوورەتی (القصص)یش دا دەفەرموێ: ﴿ تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا ۚ وَٱلْعَـٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾ ﴾

واتە: ئەوە ماڵی دوا ڕۆژە (واتە: بەهەشت) دەدەین بەو کەسانەی نە بەرزیی‌و، خۆ بەزل زانییان دەوێت لە زەوی دا نە دەست درێژیی‌و خراپەکاریی، وە سەرەنجامی چاك بۆ پارێزکارانە.

لە سوورەتی (الفرقان)یش فەرموویەتی: ﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَـٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَـٰمًا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَـٰمًا ﴿٦٤﴾ ﴾.

واتە: وە بەندە تایبەتی یەکانی خوای بەبەزەیی کەسانێکن بە ویقارو نەرمی دەڕۆن بەسەر زەوی دا (بێ لووت بەرزیی‌و کەشخەو فیز کردن) وە کاتێك نەزان‌و نەفامەکان (بە گوفتاری ناشیرن) لەگەڵیان بدوێن، قسەیەك دەکەن کە گوناح نەبێت (یاخود ڕوویان لێ وەردەچەرخێنن‌و بەجێیان دێڵن)، وە ئەو (بەندانە) کەسانێکن لە شەودا بۆ پەروەردگاریان سوجدە بەرن‌و شەو نوێژ دەکەن.

{عَنْ سَهْلِ بْنِ مُعَاذٍ الْجُهَنِيِّ عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ تَرَكَ اللِّبَاسَ وَ هُوَ يَقْدِرُ عَلَيْهِ تَوَاضُعًا للهِ عَزَّ وَجَلَّ، دَعَاهُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عَلَى رُءُوسِ الْخَلَائِقِ يُخَيِّرُهُ مِنْ حُلَلِ الإِيمَانِ فَلَبِسَ أَيَّهَا شَاءَ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[1]

واتە: سەهلی کوڕی موعازی جوهەنی لە بابی دەگێڕێتەوە خوا لێی ڕازی بێ کە گوتوویەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك واز لە جل‌و بەرگێك بێنێ‌و لەبەری نەکات لەبەر خوا (عَزَّ وَجَلَّ)و بە هۆی خۆ بە کەمگرییەوە لەگەڵ ئەوەی بشتوانێ (بیکڕێ)و لەبەری بکات،

---

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٢٤٨١) وَحَسَّنَهُ العَلَّامَة الألباني في (صَحيح سُنَن التِّرمِذِيُّ))

**ئەوە لە ڕۆژی قیامەت دا لە نێو هەموو دروستکراوەکان خوا (عَزَّ وَجَلَّ) بانگی دەکاو سەرپشکی دەکات تا بە ئارەزووی خۆی کام جل‌و بەرگی ئەهلی ئیمان حەز دەکات بۆ خۆی لەبەری بکات.**

{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: عَنْ رَسُوْلِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَا مِنْ آدَمِي إِلاَّ فِي رَأْسِهِ حِكْمَةٌ بِيَدِ مَلَكٍ فَإِذَا تَوَاضَعَ قِيْلَ لِلْمَلَك: ارْفَعْ حِكْمَتَهُ وَإِذَا تَكَبَّرَ قِيْلَ: لِلْمَلَك ضَعْ حِكْمَتَهُ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[١]

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی‌و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ ئینسانێك نیە مەگەر حیکمەتێکی لە عەقڵ دا هەیە بە دەستی فریشتەیەکە، ئەگەر خۆی بە کەمگرت ئەوە بەو فریشتە دەگوترێ حیکمەتەکەی بەرزبکەوەو زیادی بکە، وە ئەگەر خۆی بە گەورە گرت بەو فریشتە دەگوترێ: حیکمەتەکەی نزمکەوەو کەمی بکەوە.**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنْ رَسُوْلِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مَالٍ، وَمَا زَادَ اللهُ عَبْداً بِعَفْوٍ إِلاَّ عَزًّا، وَمَا تَوَاضَعَ أَحَدٌ للهِ إِلاَّ رَفَعَهُ اللهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[٢]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە خێرو صەدەقە کردن ماڵ کەم ناکات، وە بەندەش بە چاوپۆشیی‌و لێبوردەیی، خوا عیززەتی زیاد دەکات، وە هەر یەکێك لەبەر خوا خۆی بە کەم بگرێ‌و خاکی بێ، مسۆگەر خوا بەرزی دەکاتەوە.**

{عَنْ حَارِثَةَ بْنِ وَهْبٍ الْخُزَاعِيِّ عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِأَهْلِ الْجَنَّةِ؟! كُلُّ ضَعِيفٍ مُتَضَاعِفٍ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللهِ لأَبَرَّهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[٣]

---

١) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ: (١٢٩٣٩)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٥٣٨))

٢) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٦٧٥٧))

٣) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٤٦٣٤)، وَمُسْلِمٌ: (٧٣٦٦))

واتە: حارسی کوڕی وەهبی خوزاعی لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ئایا هەواڵتان بدەمێ کێ ئەهلی بەهەشتە؟ فەرمووی: هەموو لاوازو بێهێزێکی (کە خەڵك بە سووکی سەیری دەکات)، کە ئەگەر سوێند بە خوا بخوات بۆ شتێك، خوا بۆی دەکات و سوێندەکەی ناخات.

{عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: أَحِبُّوا الْمَسَاكِينَ فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ فِي دُعَائِهِ: «اللَّهُمَّ! أَحْيِنِي مِسْكِيناً وَأَمِتْنِي مِسْكِيناً، وَاحْشُرْنِي فِي زُمْرَةِ الْمَسَاكِينِ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[١]

واتە: ئەبوو سەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێ، دەیگوت: نەدارانتان خۆشبوێ، لەبەر ئەوەی لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستوە لە دووعای خۆیدا دەیفەرموو: خودایە ! بمژیێنە بە نەداریی، وە بمرێنە بە نەداریی، وە لەگەڵ کۆمەڵی نەداران حەشرم بکە.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَا اسْتَكْبَرَ مَنْ أَكَلَ مَعَهُ خَادِمُهُ، وَرَكِبَ الْحِمَارَ بِالأَسْوَاقِ، وَاعْتَقَلَ الشَّاةَ فَحَلَبَهَا»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[٢]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆ بەزلگر نیە ئەو کەسەی خزمەتکارەکەی نانی لەگەڵ بخوات، وە سواری گوێدرێژ بێ لە بازاڕ، وە شیری مەڕ بدۆشێ.

## بەسەرهاتێك لەم بارەیەوە [٣]

ڕۆژێك ئافرەتێك کە عەقڵی ناتەواو بوو، هاتوو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتیمە لات ئیشم پێتە؟!! پێغەمبەریش (بەو پەڕی تەوازعەوە) فەرمووی: باشە دایکی فلان لە کام جێگاو ڕێگای مەدینە پێت خۆشە دادەنیشین، هەتا ئیشەکەت بۆ تەواو دەکەم، ئنجا لەگەڵی دانیشت لە یەکێك لە کۆڵانەکان، هەتا قسەکانی تەواو بوو، ئنجا دوایی هەڵسان و ڕۆیشتن!!

---

١) (رَوَاهُ ابْنُ مَاجَهْ: (٤١٢٦) وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٣٠٨))

٢) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ في (الأدب المفرد): (٥٥٠)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٢٢١٨))

٣) كيف تكسب الناس، الباب: الوسيلة الثامنة التواضع ولين الجانب، ج١، ص٢٢.

# پایەو پاداشتی ڕاستگۆیی

خوای کاربەجێ ئاسمانەکانو زەوی بە هەق دروست کردوە، وە داواشی لە هەموو خەڵکی کردوە کە لەسەر هەق بژینو بمرن، وە هیچ قسەیەك نەکەن مەگەر هەق بێو، هیچ کردەوەیەك نەکەن مەگەر هەق بێ، چونکە بێگومان هەقو ڕاستی هۆکارن بۆ ئەوەی ئینسان بەرەو چارەنووسێکی دیارو ڕوون بچێ، کە ڕوونترین چارەنووسی مسوڵمانانیش خۆی لە بەهەشتی پانو بەرینو ڕازاوەی خوای پەروەردگار دەبینێتەوە، هەر لەبەر ئەوەشە کۆمەڵگای ئیسلامیی دەبێ لەسەر ئەساسی ڕاستییەتی بنیات بنرێ، وە مسوڵمانیش پێویستە لەسەریان کە لە هەموو ئیشو کارێکیان ئەم سیفەتەیان تێدا ڕەنگبداتەوە، وە بێگومان پایەو پاداشتی زۆریش بۆ ئەو کەسانە دانراوە کە خاوەنی ئەم سیفەتە بەرزەن، وەك خوای بەخشەر دەفەرموێ: ﴿قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوۡمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدۡقُهُمۡۚ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ١١٩﴾ المائدة.

واتە: خوا فەرمووی: ئەمە ڕۆژێکە ڕاستگۆیان ڕاستییەکەیان سوودیان پێدەگەیەنێ، وە بەهەشتانێکیان بۆ هەیە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆنو بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، خوا لەوان ڕازی بووەو ئەوانیش لە خوای خۆیان ڕازین، ئەمەش گەورەترین بردنەوەو سەرکەوتنە.

وە لە سووڕەتی (التوبة)دا فەرمان بە مسوڵمانان دەکات کە لەگەڵ ڕاستگۆیان بن، چونکە ئەمە سیفەتی پێغەمبەرانو فریشتانو صالحانە، دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ١١٩﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەنو لەگەڵ ڕاستگۆیانبن.

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: قِيلَ لِرَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَيُّ النَّاسِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «كُلُّ مَخْمُومِ الْقَلْبِ،

صَدُوقِ اللِّسَانِ»، قَالُوا: صَدُوقُ اللِّسَانِ نَعْرِفُهُ فَمَا مَخْمُومُ الْقَلْبِ؟ قَالَ: «هُوَ: التَّقِيُّ النَّقِيُّ، لاَ إِثْمَ فِيهِ وَلاَ بَغْيَ وَلاَ حَسَدَ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[١]

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: بە پێغەمبەری خوا ﷺ گوترا: باشترینی خەڵك كێ یە؟ فەرمووی: هەموو کەسێکی دڵ (مَخْمُوم)و زمان ڕاستگۆ، گوتیان: دەزانین زمان ڕاستبێژی چییە، بەڵام (مَخْمُومُ الْقَلْبِ) چییە؟ فەرمووی: بریتییە لە: پارێزکاریی‌و پاکیی، کە هیچ گوناهێکی تێدانییەو، وە هیچ سەرپێچیی حەسوودیی یەکی تێدانییە.**

{عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي قُرَادٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّ النَّبِي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) تَوَضَأ يَوْمَاً فَجَعَلَ أَصْحَابه يَتَمَسَّحُونَ بِوُضُوئِهِ، فَقَالَ لَهُمْ النَّبِيّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «وَمَا حَملكُم عَلَى هَذَا»؟ قَالُوا: حُبّ اللهِ وَرَسَوله، «مَنْ سَرَّه أَنْ يُحِبَّهُ اللهُ وَرَسُولَهُ فَلْيَصْدُق فِي حَدِيثِه إِذَا حَدَّثَ، وَلْيُؤَدِّ أَمَانَتَهُ إِذَا ائتُمِنَ، وَلْيُحْسِنْ جِوَارَ مِن جَاوَرَه»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[٢]

**واتە: عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبی قوراد خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی شۆرد، هاوەڵانیش ئاوی دەستنوێژەکەیان بەکارهێناو مەسحیان پێکرد، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموون: ئایا ئەمەتان لەبەرچی کرد؟ گوتیان: لەبەر خۆشویستنی خواو پێغەمبەرەکەی، ئەویش فەرمووی: هەر کەسێك حەز دەکات خواو پێغەمبەرەکەی خۆشی بوێن، با لەکاتی قسەکردنیدا ڕاستگۆ بێ، وە ئەگەر**

---

١) (رَوَاهُ ابنُ مَاجَهْ: (٤٢١٦)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٩٤٨))

٢) (رَوَاهُ البَيْهَقِيُّ في (شعب الإيمان): (١٥٣٣) وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (المشكاة): (٤٠٩٠))

سپاردەیەکی لەلابوو با بیگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی، هەروەها با باشیش بێ لەگەڵ دراوسێ‌و جیرانی.

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنْ رَسُوْلِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ قَالَ: «تَقَبَّلُوا لِي بِسِتٍّ أَتَقَبَّلْ لَكُمْ بِالْجَنَّةِ»، قَالُوا: وَمَا هِيَ؟ قَالَ: «إِذَا حَدَّثَ أَحَدُكُم فَلاَ يَكْذِبْ، وَإِذَا وَعَدَ فَلاَ يُخْلِفْ، وَإِذَا اؤتُمِنَ فَلاَ يَخُنْ، غُضُّوا أَبْصَارَكُمْ، وَكُفُّوا أَيْدِيكُم وَاحْفَظُوا فُرُوجَكُمْ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**(1)

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: بە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئێوە شەش شتم لێ وەربگرن‌و پێوەی پابەندبن منیش بەڵێنی بەهەشتتان پێ دەدەم، گوتیان: ئەوە چییە؟ فەرمووی: ئەگەر یەکێکتان قسەی کرد با درۆ نەکات، ئەگەر بەڵێنی دا با سەرپێچی نەکات، ئەگەر ئەمانەتی پێ سپێردرا با زایەی نەکات‌و خیانەتی تێدانەکات، چاوتان لابدەن لە سەیر کردنی حەرام (وەك: تەماشاکردنی ئافرەتی نامەحرەم) وە دەستان بگرنەوەو لە هەر شتێکی خراپ، وە داوێنتان بپارێزن‌و پاکی ڕابگرن.

{عَنْ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ فَإِنَّ الصِّدْقَ: يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ، وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ، وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَصْدُقُ وَيَتَحَرَّى الصِّدْقَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللهِ صِدِّيقاً، وَإِيَّاكُمْ وَالْكَذِبَ فَإِنَّ الْكَذِبَ: يَهْدِي إِلَى الْفُجُورِ، وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهْدِي إِلَى النَّارِ، وَمَا يَزَالُ الرَّجُلُ يَكْذِبُ وَيَتَحَرَّى الْكَذِبَ حَتَّى يُكْتَبَ عِنْدَ اللهِ كَذَّاباً»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(2)

واتە: عەبدوڵڵا خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: داواتان لێدەکەم بە ڕاستگۆیی، بێگومان ڕاستگۆیی ڕێنماییە بۆ (هەموو کردارو گوفتارێکی) چاکە، وە چاکەش ڕێنماییە بۆ بەهەشت! وە پیاوی وا هەیە هێندە ڕاستگۆیەو عەودالی ڕاستییە هەتا لەلای ناوی خوا بە ڕاستگۆ دەنووسرێ، وە داواتان لێدەکەم خۆتان بپارێزن لە درۆ

---

١) (رَوَاهُ الحَاكِمُ: (٨٠٦٧)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٥٢٥))

٢) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ: (٥٧٤٣)، وَمُسْلِمٌ: (٦٨٠٥) وَاللَّفْظُ لَهُ)

کردن، چونکە بێگومان درۆکردن ڕێنماییە بۆ خراپەکاریی‌و لادان لە ڕێی ڕاست، وە خراپەکارییش ڕێنماییە بۆ ئاگر، وە پیاوی وا هەیە هێندە درۆ دەکات‌و عەودالّی درۆیە هەتا لەلای خوا ناوی بە درۆزن دەنووسرێ.

{عَنْ حُنَيْفٍ حَدَّثَهُ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): قَالَ: «مَنْ سَأَلَ اللهَ الشَّهَادَةَ بِصِدْقٍ بَلَّغَهُ اللهُ مَنَازِلَ الشُّهَدَاءِ وَإِنْ مَاتَ عَلَى فِرَاشِهِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: حونەیف لە بابی‌و ئەویش لە باپیری دەگێڕێتەوە خوا لێی ڕازی بێ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك ڕاستگۆیانە لە ناخی دڵیەوە داوای شەهید بوون بکات لە خوا، ئەوە خوا بە پلەی شەهیدانی دەگەیەنێ ئەگەر لە سەر بەڕەکەیشی (لە ناێو ماڵی خۆی) وەفات بکات.

## بەسەرهاتێك لەم بارەیەوە

یەکێك لە هاوەڵان خوا لە هەموویان ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێکی دەشتەکی هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئیمانی هێناو مسوڵمان بوو، گوتی: لەگەڵێشت کۆچ دەکەم، کاتێك جەنگی خەیبەر هاتە پێش، پێغەمبەری خوا ﷺ هەر شتێك کە بووە غەنیمە لە نێو هاوەڵاندا دابەشی کرد، وە بەشێکی بۆ پیاوە دەشتەکییەکەش دانا، کاتێك هات بەشەکەیان پێدا، گوتی: ئەوە چییە؟ گوتیان: ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی داناوی، وەریگرتوو، چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەوە چییە؟! فەرمووی: ئەوە غەنیمەیە بەشم کردوەو بەشی تۆشم لێ داناوە، گوتی: بەڵام من بۆ ئەوە بە دوای تۆ نەکەوتووم، بەڵکو بۆ ئەوە بە شوێنت کەوتووم، تاکو تیرێك ئا بێرەم بکەوێ (ئامازەی بۆ ملی خۆی کرد بە ڕمەکەی)، ئنجا پێی بمرم‌و بچمە بەهەشتێ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەگەر ڕاست بکات، خوا ڕاستیەکەی بە دەردەخات، دوایی هێرشیان بردو دوژمنیان تێکشکاند، بەڵام دوایی بە کوژراوی بۆ

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٦٨٠٥))

پێغەمبەریان ﷺ هێنا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا ئەوە هەوە ئەو کەسەیە؟ گوتیان: بەڵێ، تەماشایان کرد ئاماژەی بۆ کوێ کرد بوو تیرێکی بەو شوێنە کەوتبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ڕاستی کردو خواش ڕاستیەکەی دەرخست، ئنجا کفنیان کرد بە عەبایەکی پێغەمبەرو، پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێش کەوتو نوێژی لەسەر کرد، ئنجا دووعای خێر بۆ کرد، وە لە دووعایەکانی دا دەیگوت: {اللَّهُمَّ إِنَّ هَذَا عَبْدُكَ، خَرَجَ مُهَاجِرًا فِي سَبِيلِكَ، فَقُتِلَ شَهِيدًا، أَنَا شَهِيدٌ عَلَيْهِ} (أَخْرَجَهُ النَّسَائِي: (١٩٥٣)، وَصَحَّحَهُ العلامة الألباني).

واتە: ئەی خوایە! ئەوە بەندەی تۆیە، لە پێناوی تۆدا کۆچی کردوەو جەنگی کردوەو شەهید کراوە، من شایەدیی بۆ دەدەم.

## پایەو پاداشتی ئارام گرتن

ئارامگریی بریتیە لەو سیفەتە پەسندەی کە خوای پەروەردگار لە چەندین ئایەت فەرمانی پێکردوەو پاداشتی زۆر گەورەی بۆ خاوەنانی ئەم سیفەتە ئامادە کردوە، بۆ وێنە: دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٥٣﴾ ﴾ البقرة.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە کۆمەك لە خۆڕاگریی‌و نوێژ وەربگرن، مسۆگەر خوا لەگەڵ خۆڕاگران دایە.

هەر لە سوورەتی (البقرة)دا فەرموویەتی: ﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَىْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ وَٱلْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَـٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوٓا۟ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَٰتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُهْتَدُونَ ﴿١٥٧﴾ ﴾.

واتە: وە بێگومان بە شتێك لە ترس‌و برسیەتی‌و کەم بوون‌و لە نێو چوونی سامان‌و نەفس‌و بەروبوومەکان تاقیتان دەکەینەوە، وە موژدە بدە بە خۆڕاگران . ئەوانەی کاتێك

بەڵایەکیان بەسەر دادێ دەڵێن: ئێمە هی خواین، وە ئێمە هەر بۆ خزمەت ویش (خوا) دەگەڕێینەوە . ئا ئەوانە صەڵەوات و بەزەیی یان لە پەروەردگاریانەوە دێتە سەرێ، وە هەر ئەوانە ڕێی ڕاست گرتووانن.

وە لە سوورەتی (الرعـد) باسی پاداشتی ئارامگران دەکاو دەفەرموێ: ﴿ وَالَّذِينَ صَبَرُوا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَنفَقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً وَيَدْرَءُونَ بِالْحَسَنَةِ السَّيِّئَةَ أُولَٰئِكَ لَهُمْ عُقْبَى الدَّارِ ﴿٢٢﴾ جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا وَمَن صَلَحَ مِنْ آبَائِهِمْ وَأَزْوَاجِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ وَالْمَلَائِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ ﴿٢٣﴾ سَلَامٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ فَنِعْمَ عُقْبَى الدَّارِ ﴿٢٤﴾ ﴾.

واتە: وە ئەوانەی کە دانیان بە خۆیان دا گرت بە مەبەستی ڕەزامەندیی پەروەردگاریان، وە نوێژیان بەرپا کردووەو لەو ڕۆزییەی کە پێمان داون بەخشیویانە بە پەنهانیی و ئاشکرایی، وە بە چاکە ڕێگری لە خراپە دەکەن (بە چاکە خراپەکانیان دەسڕنەوەو لادەبەن) سەرەنجامی چاکی ئەو دنیا هەر بۆ ئەوانە . بەهەشتانێك جێگای مانەوەی هەمیشەییە کە ئەوان دەچنە ناویەوە هەروەها ئەوانەش کە چاك بوون لە باب و باپیرانیان و هاوسەرانیان و وەچەو نەوەکانیان، فریشتەکانیش دەچنە ژوورەوە بۆ لایان لە هەموو دەرگایەکەوە . (پێیان دەڵێن:) سەلامتان لێبێ چونکە ئارامتان گرت (لە دنیادا) جا چەند سەرەنجامێکی چاکتان بە دەست هێنا.

وە لە کۆتایی دا باسی پاداشتێکی بێ حیساب بۆ ئارامگران دەکات و دەفەرموێ: ﴿ قُلْ يَا عِبَادِ الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا رَبَّكُمْ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَٰذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ ۗ وَأَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةٌ ۗ إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿١٠﴾ ﴾ الزمر.

واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: بەو بەندانەم کە بڕوایان هێناوە لە (سزای) پەروەردگارتان خۆ بپارێزن، کەسانێك لەم دنیایەدا چاکەیان کردوە پاداشتی چاکیان بۆ هەیە، وە زەوی خوا فراوانە، بەڕاستی تەنیا ئارامگران بێ ژمارە پاداشتیان دەدرێتەوە.

{عَنْ أَبِي مُوْسَى رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَا أَحَدٌ أَصْبَرُ عَلَى أَذَى سَمِعَهُ مِنَ اللهِ، يَدَّعُونَ لَهُ الْوَلَدَ، ثُمَّ يُعَافِيهِمْ وَيَرْزُقُهُمْ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتە: ئەبوو مووسای ئەشعەریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هیچ كەسێك نیە وەك خوا ئارامگربێ لەسەر ئەو ئازارەی بۆ خۆی دەیبیستێ، (خەڵكی بتپەرست) دەڵێن منداڵی هەیە، ئنجا خوای بەخشندە ساغ‌و سەلامەتیان دەكات‌و ڕزق‌و ڕۆزیشیان پێدەدات.**

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ مِنْ وَرَائِكُمْ زَمَانَ صَبْرٍ، لِلْمُتَمَسِّكِ فِيهِ أَجْرُ خَمْسِيْنَ شَهِيْداً»، فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُوْلَ اللهِ! مِنَّا أَوْ مِنْهُمْ؟ قَالَ: «مِنْكُمْ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

**واتە: عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان لە دوای ئێوە ڕۆژگاری ئارامگرتن هەیە (یانی: خراپەو ئاشووب هێندە زۆر دەبێ، خەڵكەكە پێویستیان بەوەیە ئارامی تێدا بگرن)، جا هەر كەسێك لەو ڕۆژگارو زەمانەدا باش دەست بە دینەوە بگرێ، ئەوە پاداشتی پەنجا شەهیدی هەیە، عومەری كوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! (پاداشتی) پەنجا شەهید لە ئێمە، یان لە خۆیان؟ فەرمووی: لە ئێوە.**

**ڕوونكردنەوە: بێگومان ئەو ڕۆژگاری خراپەكاری‌و ئاشووبەی پێغەمبەر خوا باسی دەكات، ئەم ڕۆژەیە كە ئێمە تێی كەوتووین، وە ئەگەر عەزممان جەزم بكەین‌و ئیرادەمان بەهێز بكەین‌و دینداریيەكی چاك بۆ خوا ئەنجام بدەین، خوا یارمەتی دەرمان بێ، دەبینە خاوەنی ئەو پاداشتە گەورەیە.**

---

١) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ: (٦٩٤٣) وَاللَّفْظُ لَهُ، وَمُسْلِمٌ: (٧٢٦٠))
٢) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي (الكبير): (١٣٩٤)، وَصَحَّحَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٤٩٤))

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ اللهَ لا يَرْضَى لِعَبْدِهِ الْمُؤْمِنِ، إِذَا ذَهَبَ بِصَفِيِّهِ مِنْ أَهْلِ الأَرْضِ، فَصَبَرَ، وَاحْتَسَبَ، وَقَالَ: مَا أُمِرَ بِهِ بِثَوَابٍ دُونَ الْجَنَّةِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[1]

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمڕی عاص خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوا (بە هیچ پاداشتێك) ڕازی نابێ بۆ بەندەیەکی ئیماندار، ئەگەر یەکێك لە دۆستو هاوەڵانی لە دەست چوو، کۆچی دوایی کرد، لەو هاوەڵانەی سەر زەوی کە هەیەتی، ئارام بگرێو چاوەڕێی پاداشت بێ لە خوا، ئەوە خوا بە هیچ پاداشتێك ڕازی نابێ بۆی جگە لە بەهەشت.**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَا رُزِقَ عَبْدٌ خَيراً لَهُ وَلاَ أَوْسَعَ مِنَ الصَّبْرِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، بیستوویەتی لە پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی: هیچ شتێك نەبەخشراوە بە ئینسان چاکتر بێ بۆی وە فراوانتربێ بۆی لە ئارامگرتن. یانی: ئەوە نیعمەتو بەخشێکی زۆرە لەلایەن خواوە بەو کەسە بەخشراوە.**

{عَنْ صُهَيْبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): عَجَباً لأَمْرِ الْمُؤمِنِ، إِنَّ أَمْرَهُ كُلَّهُ خَيرٌ لَهُ، وَلَيسَ ذَلِكَ لأَحَدٍ إِلاَّ لِلْمُؤمِنِ، إِنْ أَصَابَتْهُ سَرَّآءُ شَكَرَ، فَكَانَ خَيراً لَهُ، وَإِنْ أَصَابَتْهُ ضَرَّآءُ صَبَرَ، فَكَانَ خَيراً لَهُ} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[3]

**واتە: صوهەیب خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاروباری ئینسانی ئیماندار سەیرە! حاڵو ئیشی کاری ئەو هەمووی هەر خێرو چاکەیە، ئەوەش بۆ هیچ کەسێك نیە جگە لە ئیماندار، ئەگەر خۆشی تووش هات سوپاسگوزاریی لەسەر دەکاتو پاداشتی بۆ هەیە، وە ئەگەر ناڕەحەتییو ناخۆشیی تووش هات خۆی لە بەرانبەر ڕادەگرێو پاداشتی هەیە.**

---

١) (رَوَاهُ النَّسَائِيُّ: (١٨٧١)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (١٨٥١))

٢) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ: (١٤٠٠)، وَمُسْلِمٌ: (١٠٥٣)، وَالحَاكِمُ: (٣٥٥٢) وَاللَّفْظُ لَهُ، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٤٤٨))

٣) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٧٦٩٢))

{عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «النَّصْرُ مَعَ الصَّبْرِ، وَالْفَرَجُ مَعَ الْكَرْبِ، وَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسراً، إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسراً»} **حَدِيثٌ صَحِيح**[1]

واتـە: ئەنـەس خـوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: سـەرکەوتن لەگـەڵ ئـارامگریی دایـە، وە ڕزگـاربوونو دەرگـای خێـر لێ بوونـەوە لەگـەڵ ناخۆشیی دایـە، بێگومـان لەگـەڵ هـەر نارەحـەتیی‌و زەحمەتییـەك ئاسنییـەك هەیـە، بێگومان لەگەڵ هەر نارەحەتیی‌و زەحمەتییەك ئاسنییەك هەیـە، (یانی: کاتێـك ئینسان بێ ئومێد دەبێ‌و خەم‌و گرفتاریەکەی زۆر زۆر دەبێ، لەوکاتـەدا دەروو کردنـەوەو هاتنی سەرکەوتن زیاتر نیزیکەو چاوەڕوانی لێ دەکرێ).

{عَنْ عَطَاءُ بْنُ أَبِي رَبَاحٍ قَالَ: قَالَ لِي ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَلاَ أُرِيكَ امْرَأَةً مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ؟ قُلْتُ بَلَى، قَالَ: هَذِهِ الْمَرْأَةُ السَّوْدَاءُ، أَتَتِ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَتْ: إِنِّي أُصْرَعُ، وَإِنِّي أَتَكَشَّفُ، فَادْعُ اللهَ لِي، قَالَ: «إِنْ شِئْتِ صَبَرْتِ وَلَكِ الْجَنَّةُ»، وَإِنْ شِئْتِ دَعَوْتُ اللهَ أَنْ يُعَافِيَكِ؟ قَالَتْ: أَصْبِرُ، قَالَتْ: فَإِنِّي أَتَكَشَّفُ فَادْعُ اللهَ أَنْ لاَ أَتَكَشَّفَ، فَدَعَا لَهَا} **حَدِيثٌ صَحِيح**[2]

واتە: عەطائی کوڕی ڕەباح دەڵێ: ئیبنو عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، پێی گوتم: ئایا دەتـەوێ ئـافرەتێکی بەهەشـتیت پێشان بـدەم؟ گوتم: بـەڵێ، گوتی: ئـەو ئافرەتـە ڕەش پێستە هاتـە لای پێغەمبـەر ﷺو گوتی: مـن پەرکەمـدارم، وە جەسـتەم ئاشکرا دەبـێ کاتێك پەرکەم دەگرم، دووعام بۆ بکە لە لای خوا، فەرمووی: ئەگەر دەتەوێ ئارام بگرەو بەهەشتت بۆ هەیە، وە ئەگەر دەتەوێ دووعات بۆ دەکەم چاکبیەوە؟ گوتی: ئارام دەگرم، وە گوتی: لەبەر ئەوەی جەستەم بەدەردەکەوێ داوا لـە خـوا بکە کاتێـك پەرکەم دەگرم جەستەم بە دەرنەکەوێ، دووعای بۆ کرد.

---

١) (رَوَاهُ الديلمي: (٦٩٠٣)، وَصَحَّحَهُ العَلَّامَةُ الألباني فِي (السلسلة الصحيحة): (٢٣٨٢))

٢) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٥٣٢٨)، وَمُسْلِمٌ: (٦٧٣٦))

{عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «الْمُؤْمِنُ الَّذِي يُخَالِطُ النَّاسَ وَيَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ، أَعْظَمُ أَجْرًا مِنَ الْمُؤْمِنِ الَّذِي لا يُخَالِطُ النَّاسَ وَلَا يَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[١]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەو بڕوادارەی کە تێکەڵێ خەڵکی دەبێ‌و لەسەر ئەزیەت‌و ئازارەکانیشیان ئارامگرە، پاداشتی گەورەترەو زیاترە لەو بڕوادارەی کە تێکەڵی خەڵکی ناکات‌و بەرگەی ئەزیەت‌و ئازاریانیشیان ناگرێ.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: أَنَّ رَجُلاً كَانَ يَسُبُّ أَبَا بَكْرٍ، فَصَمَتَ عَنْهُ أَبُو بَكْرٍ، ثُمَّ آذَاهُ الثَّانِيَةَ، فَصَمَتَ عَنْهُ أَبُو بَكْرٍ، ثُمَّ آذَاهُ الثَّالِثَةَ، فَانْتَصَرَ مِنْهُ أَبُو بَكْرٍ، فَقَامَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) حِيْنَ انْتَصَرَ أَبُو بَكْرٍ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: أَوَجَدتَ عَلَيَّ يَا رَسُوْلَ اللهِ؟ فَقَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «نَزَلَ مَلَكٌ مِنَ السَّمَاءِ فَكَذَّبَهُ بِمَا قَالَ لَكَ، فَلَمَّا انْتَصَرتَ وَقَعَ الشَّيْطَانُ، فَلَمْ أَكُنْ لأَجْلِسَ إِذْ وَقَعَ الشَّيْطَانُ»}
**حَدِيثٌ حَسَنٌ**[٢]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێك جنێوی بە ئەبوو بەکر دا، ئەبوو بەکر خوا لێ ڕازی بێ، بێ دەنگ بوو (وەڵامی نەداوەو ئارامی گرت)، پاشان ئەزیەتی داوە بۆ جاری دووەم، دیسان ئەبوو بەکر بێ دەنگ بوو (وەڵامی نەداوەو ئارامی گرت)، بۆ جاری سێیەم ئەزیەتی داوەو ئەبوو بەکریش لە جاری سێیەم وەڵامی داوە، لە کاتی وەڵامدانەوەکەی ئەبوو بەکر، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا (بۆ ئەوەی بڕوات) ئەبوو بەکر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەوە لە من دلگیر بووی، دڵت توونـد بوو؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: فریشتەیەك لە ئاسمان هاتە خوار ئەو قسانەی بە درۆخستەوە کە بە تۆی گوت، بەڵام کاتێ تۆ وەڵامی جنێوەکەت داوە، شەیتان هاتە جێی (فریشتەکە)و بۆ منیش ناگونجێ‌و شایستە نیە لە شوێنێك دابنیشم کە شەیتانی لێ بێ.

---

١) (رَوَاهُ أَحْمَد: (٥٠٢٢)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٩٣٩))

٢) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (٤٨٩٨)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٢٣٨٢))

{عَنْ أَبِي مَالِكٍ الأَشْعَرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «الطُّهُورُ شَطْرُ الإِيمَانِ وَالْحَمْدُ للهِ تَمْلأُ الْمِيزَانَ، وَسُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ للهِ تَمْلآنِ (أَوْ تَمْلأُ) مَا بَيْنَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، وَالصَّلاَةُ نُورٌ، وَالصَّدَقَةُ بُرْهَانٌ، وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ، وَالْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَكَ أَوْ عَلَيْكَ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[١]

**واتە: ئەبوو مالیکی ئەشعەریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پاكو خاوێنی بەشێکی ئیمانە، (الْحَمْدُ للهِ) تەرازوو پڕ دەكات، (سُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ للهِ) نێوانی ئاسمانەکانو زەوی پڕ دەکەن، نوێژ نوورە، خێر کردن ڕاستی بڕواو گوێڕایەڵی بۆ خوا سەلماندنە، ئارامگرتن ڕووناكییە، قورئانیش بەڵگەیە بۆت یان بەڵگەیە لەسەرت.**

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «إِنَّ اللهَ، قَالَ: إِذَا ابْتَلَيْتُ عَبْدِي بِحَبِيبَتَيْهِ فَصَبَرَ عَوَّضْتُهُ مِنْهُمَا الْجَنَّةَ "يُرِيدُ عَيْنَيْهِ"»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[٢]

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازیبێ، دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: خوا فەرموویەتی: ئەگەر دوو چاوم لە بەندەیەکی خۆم سەندەوەو کوێر بوو، ئەویش زۆر ئارامگر بوو لەسەری ئەوە من بۆی قەرەبوو دەکەمەوە بەوە کە لە جیاتی دووچاوەکانی بەهەشتی دەدەمێ.**

{عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ يَصْبِرْ يُصَبِّرْهُ اللهُ وَمَا أُعْطِيَ أَحَدٌ عَطَاءً هُوَ خَيْرٌ وَأَوْسَعُ مِنَ الصَّبْرِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[٣]

**واتە: ئەبوو سەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك هەوڵی ئەوە بدات کە ئارامبگرێ خوای پەروەردگار پێی دەبەخشێو هیچ کەس لە نیعمەتی ئارام گرتن باشترو فراوانتری پێنەبەخشراوە.**

---

١) (رَوَاهُ أَحْمَدُ: (٢٢٩٥٣)، وَمُسْلِمٌ: (٥٥٦)، وَالتِّرمِذِيُّ: (٣٥١٧))
٢) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٥٣٢٩))
٣) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ: (١٤٠٠)، وَمُسْلِمٌ: (٢٤٧١))

## جۆرەكانی ئارامگرتن (الصَّبر)[١]

١) (الصَّبر عَلَى الطَّاعَة): خۆڕاگریی لەسەر طاعەت‌و فەرمانبەریی خوا، ئەوەیە كە هەرچی خوا فەرمانی پێكردوەو هەر ئەركێك كە خستوویەتە سەر شانت، بەپێی توانا خۆڕاگربی‌و ئەنجامی بدەی، چونكە هیچ فەرمانێكی خواو هیچ ئەركێكی شەرعیی، بەبێ خۆڕاگریی ئەنجام نادرێ، ئەگەر چیكڵدانەت گچكەبێ نەنوێژەكانت وەك پێویست بۆ دەكرێ، نە ڕۆژووت بۆ دەگیرێ، نەحەجت بۆ دەكرێ، نەجیهادت بۆ دەكرێ، نە صیلەی ڕەحمی خزمایەتیت بۆ جێبەجێ دەكرێ، نە بانگەوازت بۆ دەكرێ، بەبێ صەبرو خۆڕاگریی هیچ شتێكت بۆ ناچێتە سەر، بۆیە دەبێ پشووت درێژبێ‌و خۆڕاگربێ.

٢) (الصَّبر عَلَى المَعْصِيَة): خۆڕاگریی لەسەر گوناح، واتە: خۆڕاگربی نەهێڵێ تووشی گوناح بی، خۆڕاگرتن لەبەرانبەر گوناحیش، واتە: تووشی گوناح نەبوونیش، بەبێ صەبر دیسان نایەتە دی.

٣) (الصَّبر عَن المُصِيبَة): خۆڕاگریی لە بەرانبەر بەڵا (مُصِيبَة)داو لەبەرانبەر ئەو بەڵاو سەختییانەدا كە دێنە ڕێت نە لەخشاوبی لەبەردەمیاندا، خۆڕاگربی یانی: چی؟ واتە: سكاڵانەكەی‌و جەزەع‌و فەزەع نەكەی‌و چیلكدانەت گچكە نەبێ‌و لاڵانەوەو پاڕانەوەو نووزانەوە لەبەر خەڵك نەكەی!

---

[١] تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز.

# پایەو پاداشتی قوتدانەوەی تووڕەیی

قوتدانەوەی تووڕەیی یەکێکە لە سیفەتەکانی ئینسانی ئیماندارو پارێزکار، ئەو کەسانەی کە موژدەی لێ خۆشبوون لە گوناهەکانیان‌و خرانە نێو بەهەشتیان پێدراوە، وە خوای بەبەزەیی لە چەندین ئایـەتی قورئان مەدحی ئەو کەسانە دەکات کە تووڕەیی خۆیان قوتدەدەنەوەو دەرینابڕن، وەك لە سووڕەتی (آل عمران)دا فەموویەتی: ﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٣٤﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ وَمَن يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمۡ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَجَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ﴿١٣٦﴾ ﴾.

واتە: ئەوانەی کە لە کاتی خۆشیی‌و سەغڵەتییدا (ماڵ‌و سامانی خۆیان لە پێناو خوادا) دەبەخشن، وە قوتدەرەوانی ڕق‌و تووڕەیی‌و چاوپۆشیکەران لە خەڵکی، وە خوا چاکەکارانی خۆشدەوێن ﴿١٣٤﴾ وە ئەوانەی هەر کات کارێکی ناقوڵایان کرد، یان ستەمیان لە خۆیان کرد یادی خوا دەکەن‌و یەکسەر بۆ گوناهەکانیان داوای لێبوردن دەکەن، جا ئایا جگە لە خوا کێ لە گوناهان دەبووریٚ؟ وە لە کاتێك دا کە دەزانن (گوناهو خراپە چەند زیانبەخشن) لەسەر ئەو (خراپەیە)ی دەیکەن پێداگیریی ناکەن ﴿١٣٥﴾ ئەوانە پاداشتیان لێبوردنە لە پەروەردگاریانەوەو چەند بەهەشتێك کە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن‌و تێیاندا هەمیشەیین، وە باشترین پاداشت پاداشتی ئەنجامدەرانی کردەوە باشەکانە ﴿١٣٦﴾.

هەروەها خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (الشورى)ش پاش ئەوەی بە چەند وەسفێ باسی ئیمادارن دەکات دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يَجۡتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُواْ هُمۡ يَغۡفِرُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾.

واتە: ئەوانەی لە گوناهە گەورەکان و خراپە زۆر ناشیرینەکان دووردەکەونەوەو کاتێك کە ڕقیان هەڵسێت ئەوان لێ دەبوورن و (تووڕەییان قووتدەدەنەوە)، جا لە کۆتایی دەفەرموێ: ئەوانە پاداشتیان لای پەروەردگاریانە!

وە لە سوورەتی (فصلت)یش فێری جوانترین ڕەوشتمان دەکات بۆ ئەوەی لەگەڵ براو خوشکی مسوڵمانی خۆمان هەڵسوکەوتی پێبکەین، وە لە ژیانی ڕۆژانەمان ئەم سیفەتەمان لێ ڕەنگبداتەوە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الَّذِينَ صَبَرُوا وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٣٥﴾﴾.

واتە: (هەرگیز) چاکەو خراپە وەك یەك نین بە چاکترین شێوە وەڵامی (خراپە) بدەرەوە، ئەوسا کە لە نێوان تۆو ئەودا دوژمنایەتی هەیە وەك دۆستێکی دڵسۆزو گیانی بە گیانی لێ دێت . وە بەم ئاستە ناگات کەسانێ نەبێ کە خۆ ڕادەگرن و بە صەبرن، وە پێی ناگات مەگەر کەسێ کە خاوەنی بەشی هەرە گەورە بێ لە (بەهەشت).

{عَنْ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ كَظَمَ غَيْظاً وَهُوَ يَقْدِرُ عَلَى أَنْ يُنْفِذَهُ، دَعَاهُ اللهُ عَلَى رُؤُوسِ الْخَلَائِقِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، حَتَّى يُخَيِّرَهُ فِي أَيِّ الْحُورِ شَاءَ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[1]

واتە: موعاذی کوڕی ئەنەس خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك ڕقی خۆی قوتداتەوەو دەرینەبڕێ، لە کاتێکدا بشتوانێ دەری ببڕێ و چی بوێ بیکات، ئەوە لە ڕۆژی قیامەت دا لە نێو هەموو دروستکراوەکان خوا بانگی دەکاو سەرپشکی دەکات تا بە ئارەزووی خۆی کام حۆری بیەوێ هەڵیبژێرێ بۆ خۆی.

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٢٤٩٣)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٢٧٥٣))

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ كَفَّ غَضَبَهُ، كَفَّ اَللهُ عَنْهُ عَذَابَهُ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[1]

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك تووڕەیی خۆی قووتداتەوەو دەری نەبڕێ، خوای پەروەردگاریش سزای خۆی لەسەر دەگرێتەوە، (واتە: سزای نادات).**

{عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَا مِنْ جُرْعَةٍ أَعْظَمَ أَجْراً عِنْدَ اللهِ مِنْ جُرْعَةِ غَيْظٍ، كَظَمَهَا عَبْدٌ ابْتِغَاءَ وَجْهِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ شتێك پاداشتی لەوە گەورەتر نیە لە لای خوا کەسێك تووڕەیەکەی خۆی قووتبداتەوە لەبەر خاتری خوای زاڵی پایەدار.**

{عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُوْلُ اللهِ! دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ يُدْخِلْنِي الْجَنَّةِ، قَالَ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لاَ تَغْضَبْ وَلَكَ الْجَنَّةِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[3]

**واتە: ئەبوو دەرداء خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ! ڕێنماییم بکە لەسەر کردنی کارێك پێی بچمە بەهەشتەوە؟ فەرمووی: تووڕە مەبەو بەهەشتت بۆ هەیە.**

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُوْلَ اللهِ! مَا يَمْنَعْنِي مِنْ غَضَبِ اللهِ؟ قَالَ: «لا تَغْضَبْ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[4]

---

١) (رَوَاهُ البَيْهَقِي: (٨٣١١)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٢٣٦٠))

٢) (رَوَاهُ ابْنُ مَاجَهْ: (٤١٨٩)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح إبنُ مَاجَه): (٣٣٧٧))

٣) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِي: (٢٣٥٣)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٢٣٤٩))

٤) (رَوَاهُ إبْنُ حِبَّانَ: (٢٩٦)، حَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في رواية (إبنُ عُمَر) كما في (صحيح الترغيب والترهيب): (٢٧٤٧)، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: إسنَادُهُ حَسَن)

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەمرِ خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! چ شتێك دەمپارێزێ لە تووڕەیی خوا؟ فەرمووی: تووڕە مەبە، (واتە: تووڕە مەبە، یان ئەگەر تووڕە بووی قوتی بدەوەو دەری مەبڕە خواش لێت تووڕە نابێ!).

{عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ تَصَدَّقَ عَنْ جَسَدِهِ بِشَيْءٍ كَفَّرَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُ بِقَدْرِ ذُنُوبِهِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: عوبادەی كوڕی صامیت خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك لە جەستەی خۆی چاكەیەك بكات، خێرو صەدەقەیەك بكات (واتە: بریندار بكرێ، یان ئەزیەت بدرێو ئەویش ئەو كەسە عەفوو بكات) ئەوە خوای بەرز بە ئەندازەی ئەوە گوناهەكانی لێ دەسرێتەوە.

## بەسەرهاتێك لەم بارەیەوە[2]

بەسەرهاتێك دەگێڕینەوە دەربارەی ئەم ئایەتەی كە خوا دەفەموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِى ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلْكَٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾.

واتە: ئەوانەی كە لە كاتی خۆشیی‌و سەغڵەتیی دا (ماڵ و سامانی خۆیان لە پێناو خوادا) دەبەخشن، وە قوتدەرەوانی ڕقو تووڕەییو چاوپۆشیكەران لە خەڵكی، وە خوا چاكەكارانی خۆشدەوێن.

---

١) (رَوَاهُ أَحْمَد: (٢٢٧٩٤) وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألبَانِي فِي (السلسلة الصحيحة): (٢٢٧٣))

٢) ڕێگای صاڵح بوونو بەرەو خوا چوون، چاپی پێنجەم، نووسینگی تەفسیر.

دەگێڕنەوە: یەکێك لە پیاوچاکان خزمەتکارێکی دەبێ لە ماڵ، ئاوی لە دەست دەکات، (دیارە ویستوویەتی دەستنوێژ هەڵبگرێ) ئەو گۆزەو جەڕەی کە ئاوەکەی تێدایە لە دەستی خزمەتکارەکە دەکەوێتە خوار بەسەر دەستی پیاوە چاکەو، گۆزەکە دەشکێ‌و ئاوەکەش دەڕژێ، وە پیاوە چاکەکەش هەندێك ئازاری پێدەگات‌و لەو کاتەدا زۆر تووڕە دەبێ‌و سەیری خزمەتکارەکەی دەکات!! خزمەتکارەکەش یەکسەر ئەو ئایەتە دەخوێنێتەوەو دەڵێ: خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ﴾، ئەوانەی تووڕەیی خۆیان قووتدەدەنەوە، دەڵێ: ڕاستە، ئەوە منیش ڕقی خۆم قوتدایەوە، پاشان دەڵێ: وە فەرموویەتی: ﴿وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ﴾، ئەوانەی خەڵکی دەبوورن، دەڵێ: جا ئەوە عەفووشم کردی، دوایی دەڵێ وە فەرمووشیەتی: ﴿وَاللهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾، دەڵێ: دە بڕۆ ئەوە ئازادیشم کردی. (چونکە خزمەتکارەکە کۆیلە بووە).

کەواتە: ئێمە کاتێك لە کەسێك تووڕە دەبین، نابێ بڵێین: باشە باشە قسەی ناکەم جارێ، با بۆت لە نێو پارووە نانێکی گەرم بێ!! یان ئەو دڕکەت لە بن پێ هەر دەردێنم!! بەڵکو دوای ئەوەی قسە ناکەین‌و تووڕەییەکە قووتدەدەینەوە، دەبێ یەکسەر ئەوەی لە نێو دڵیشمان دا هەیە دەریبێنین‌و فڕێی بدەین، وە هەوڵبدەین چاکەش لەگەڵ ئەو کەسە بکەین، ئنجا چاوەڕێی ئەم پاداشتە گەورە بکەین.

# پایەو پاداشتی

## داپۆشینی عەیبی خەڵکی

ئینسانی مسوڵمان دەبێ بەردەوام لە خەمی برای مسوڵمانی خۆی دابێ، وە هەرچی بۆ خۆی پێناخۆشە دەبێ بۆ ویش پێی ناخۆش بێ، وە بە پێچەوانەوەش چی بۆ خۆی پێ خۆشە بۆ ویش پێی خۆشبێ، بێگومان کە مسوڵمانێك عەیبی برای مسوڵمانی خۆی دادەپۆشێت، واتە: عەیبی خۆی داپۆشێوە، چونکە مسوڵمانان بران و هەموو کەسیش حەز دەکات عەیب و کەم و کورتی و ناتەواوی برای ئاشکرا نەبێ، وە خوای پەروەردگاریش تەئکید لەسەر ئەو برایەتیەی نێوانمان دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٠﴾ فصلت ﴾.

واتە: بێگومان ئیمانداران برای یەکدین، جا نێوان براکانی خۆتان چاك بکەن و، پارێز لە خوا بکەن، بەڵکو خواش ڕەحمتان پێ دەکات.

بۆیە ئینسان دەبێ هەوڵبدات کەم و کورتیی و عەیبی خوشك و براکانی خۆی داپۆشێ، چونکە بێگومان باسکردنی عەیب و کەم و کورتی گوناهێکی زۆر گەورەیە، بۆیە سزای زۆر گەورەو سەختیشی بۆ دانراوە، وەك لە ئایەتی ژمارە (١٩)ی سوورەتی (النور)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٩﴾ ﴾.

واتە: بێگومان ئەوانەی کە حەز دەکەن فاحیشە لە نێو ئەوانەدا بڵاوبێتەوە کە ئیمانیان هێناوە، ئازارێکی بە ئێشیان هەیە لە دنیاو دوارۆژدا، وە خوا دەزانێ و ئێوە نازانن،

کە دیارە لێرەدا مەبەست لە فاحیشە بریتیە لە هەڵبەستانی بوختانو عەیبو کەمو کورتی دیتنەوە بۆ یەکدی.

بە پێچەوانەوەش پارێزگاری کردنو ئاشکرانەکردنی کەمو کورتییش پایەو پاداشتی زۆر بەرزو مەزنی بۆ دانراوە، وە ئەم سیفەتە یەکێکە لە سیفەتە هەرە بەرزەکانی ئینسانی پارێزکار (مُتَّقِي)و چاکەکار (مُحْسِن)، چەند فەرمایشتێك لەوبارەوە:

{عَنْ أَبِي اَلدَّرْدَاءِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنْ اَلنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ رَدَّ عَنْ عِرْضِ أَخِيهِ بِالْغَيْبِ، رَدَّ اَللهُ عَنْ وَجْهِهِ اَلنَّارَ يَوْمَ اَلْقِيَامَةِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[1]

واتە: ئەبوو دەرداء خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك پارێزکاری بکات لە ناموسی برای مسوڵمانی لە پاشملە، ئەوە خوای پەروەردگار لە ڕۆژی قیامەتدا ڕووی ئەو کەسە دەپارێزێ لە ئاگری دۆزەخ.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا، نَفَّسَ اللهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الآخِرَةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ، يَسَّرَ اللهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللهُ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، وَاللهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ، وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْماً، سَهَّلَ اللهُ لَهُ بِهِ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ، وَمَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللهِ، يَتْلُونَ كِتَابَ اللهِ، وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ، إِلاَّ نَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَحَفَّتْهُمُ الْمَلائِكَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ، وَمَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ، لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

---

١) (رَوَاهُ التِّرْمِذِيُّ: (١٩٣١) وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٢٨٤٨))

٢) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٧٠٢٨))

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك ناخۆشییەك لە ناخۆشییەکانی دنیا لەسەر مسوڵمانێك سووك بکات، خوا ناخۆشییەك لە ناخۆشییەکانی ڕۆژی دوایی لەسەر سووك دەکات، هەر کەسێك باری شانی مسوڵمانێکی تەنگ دەست سووك بکات خوا باری شانی لە دنیاو دوا ڕۆژ سووك دەکات، وە هەر کەسێك کەمو کورتییو عەیبی مسوڵمانێك دابپۆشێ خوا لە دنیاو دوا ڕۆژدا کەمو کورتییو عەیبی ئەو دادەپۆشێ، بەردەوام خوا لە یارمەتیدانی بەندەی خۆی دایە هەتا ئەوان لە یارمەتیی دانی براکانیان بن، هەر کەسێك ڕێگایەکی گرت بۆ فێربوونی زانست خوا بەهۆیەوە ڕێی بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات، هیچ کۆمەڵێك نیە دابنیشن لە ماڵێك لە ماڵەکانی خوا قورئان بخوێننو یەکدی فێربکەن، ئەوە حەتمەن سەکینەتو ئارامیان بەسەر دا دێتە خوار، وە خوا فریشتە دەنێرێتە سەریانو بە ڕەحمەتی خۆی دایان دەپۆشێو چوار دەوریان بە فریشتە دەگرێتو خوا باسیان دەکات لای ئەوانەی لای خۆین (واتە: فریشتەکان)، وە هەر کەسێك کردەوەکانی پاشی بخەن ڕەچەڵەکەکەی پێشی ناخات.

{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ سَتَرَ عَوْرَةَ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ، سَتَرَ اللهُ عَوْرَتَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ كَشَفَ عَوْرَةَ أَخِيهِ الْمُسْلِمِ، كَشَفَ اللهُ عَوْرَتَهُ حَتَّى يَفْضَحَهُ بِهَا فِي بَيْتِهِ»} حديثٌ صَحيح[1]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك کەمو کورتییو عەیبی برای مسوڵمانی خۆی دابپۆشێ، خوای پەروەردگار لە ڕۆژی قیامەت کەمو کورتییو عەیبی دادەپۆشێ، وە هەر کەسێکیش کەمو کورتییو عەیبی برای مسوڵمانی خۆی ئاشکرا بکات (بۆ خەڵکی) خوای پەروەردگار کەمو

---

[1] (رَوَاهُ إبنُ مَاجَهْ: (٢٥٤٦)، وَصَحَّحَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (صحيح إبنُ مَاجَه): (٢٠٦٣))

کورتیی‌و عەیبی ئاشکرا دەکات‌و هەتا ئابرووی دەبات ئەگەر لە نێو ماڵەکەی خۆیشی دا بێ.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «لا يَسْتُرُ عَبْدٌ عَبْداً فِي الدُّنْيَا إِلاَّ سَتَرَهُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ، فەرموویەتی: هیچ بەندەیەك نیە کەم‌و کورتیی‌و عەیبی بەندەیەکی دیکە داپۆشێ‌و ئاشکرای نەکات، ئەوە بە مسۆگەری خوای (داپۆشەری عەیبەکان) لە ڕۆژی قیامەت کەم‌و کورتیەکانی‌و عەیبی ئەو دادەپۆشێ.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ سَتَرَ مُسْلِماً سَتَرَهُ اللهُ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك کەم‌و کورتیی‌و عەیبی مسوڵمانێك داپۆشێ‌و ئاشکرای نەکات خوا (عەیبەکانی) دادەپۆشێ لە دنیاو دوا ڕۆژدا.

{عَنْ أَسْمَاءَ ابْنَةِ يَزِيدَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيه وسَلَّم) يَقُولُ: «مَنْ ذَبَّ عَنْ عِرْضِ أَخِيهِ فِي الْغَيْبَةِ كَانَ حَقًّا عَلَى اللهِ أَنْ يُعْتِقَهُ مِنَ النَّارِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[3]

واتە: ئەسمائی کچی زەید خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێك بەرپەرچی باسکردنی ناموسی برای ئایینی خۆی بداتەوە لە کاتی پەنهانی (واتە: کەسەکە خۆی لەوێ نەبێ)، ئەوە هەقێکە لەسەر خوای پەروەردگار لە ئاگری دۆزەخ ئازادی بکات.

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٦٧٦٠))
٢) (رَوَاهُ ابْنُ مَاجَةَ: (٢٥٤٤)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٢٣٤١))
٣) (رَوَاهُ الطَّبَرانِيُّ في (الأوسط): (٤٤٣) وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٦٢٤٠))

{عَنْ أَبِي رَافِعٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى الله عَلَيه وسَلَّم) يَقُولُ: «مَنْ غَسَّلَ مَيتاً فَكَتَمَ عَلَيْهِ، غَفَرَ اللهُ لَهُ أربَعِينَ مَرَّةً»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: ئەبوو ڕافیع خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك مردووەك بشۆرێ‌و کەم‌و کورتیەکانی لە لای کەس باس نەکات، ئەوە خوای لێبوردە چل جاران چاوپۆشی لە گوناهو کەم‌و کورتیەکانی ئەو دەکات.

جا دەڵێم: ئەگەر داپۆشینی کەم‌و کورتی کەسێکی مردوو کە ئیدی پەیوەندی بە دنیا نەماوە ئەوە پاداشتی بێ، دەبێ پاداشتی داپۆشینی عەیب‌و کەم‌و کورتی کەسی زیندوو چەند بێ لەلای خوای بێ پەروەردگارو داپۆشەری عەیبەکان؟!

# پـایەو پـاداشتی
# بێ دەنگی‌و پاراستنی زمان

زمان یەکێکە لەو پێنج هەستەوەرەی کە ئینسان بە هۆیانەوە دەتوانێ درك بەو شتانە بکات کە بە هۆی ئەو پێنجە هەستەوەرەوە دەتوانرێ بزانرێ، ئنجا دیارە هەر یەك لەو پێنج هەستەوەرە کە خوای بەخشەر بە بەندەی خۆی داوە شوێنی خۆی دەگرێ‌و هیچ کامێکیان جێگای ئەویدیکە ناگرێتەوە، بۆیە کاریگەریشیان بەپێی گرنگیی‌و تایبەتمەندیی خۆیان دەگۆڕێ، وە سەرەکیترین بەشی ئەو پێنج هەستەوەرە بریتیە لە زمان، کە بەڕاستی دەورێکی زۆر کاریگەر دەبینێ لە ژیانی ئینسان، جا چ بە چاکە بەکاریبێنێ یان بە خراپە، ئەگەر بەباری چاکەکەی بەکاری بینی دیارە ئەوە کاری زۆر گەورەو بەرهەمداری پێی ئەنجام دەدرێ، وە بە پێچەوانەوەش ئەگەر بەباری خراپە بەکاربهێنرێ ئەوە ئەنجامی زۆر خراپ‌و تێکدەرانەی لێدەکەوێتەوە، بۆیە فەرمایشت زۆرن لەسەر بەکارهێنانی زمان لە چاکەو قەدەغەکردنی لە گوتن‌و بەکارهێنانی لە خراپە، بەڵام پێش فەرمایشتەکانی سەروەرمان خوای بەرزو بەڕێز لە قورئانی بەپێز لەوبارەوە فەرمایشتی هەن، پێویست دەکات سەرەتا

---

[1] (رَوَاهُ الحَاكِمُ: (١٣٠٧)، وَقَالَ: صَحيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألبَاني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٣٤٩٢))

لەو فەرمایشتە موبارەکانەی خوا (عَزَّوَجَلَّ) دەست پێ بکەین، کە فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞۖ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمۡ أَن يَأۡكُلَ لَحۡمَ أَخِيهِ مَيۡتٗا فَكَرِهۡتُمُوهُۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٞ رَّحِيمٞ ﴿١٢﴾ ﴾الحجرات.

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! خۆتان لە زۆرێك لە گومانەكان بپارێزن، چونكە بەڕاستی هەندێك لە گومانەكان گوناهو تاوانن، جاسوسیی مەكەن (و بە دوای یەكدیدا مەگەڕێن) وە لە پاشملە (بە خراپ) باسی یەكدی مەكەن، ئایا هیچ كام لە ئێوە پێی خۆشە كە گۆشتی برا (ئایینی یەكەی) بخوات بە مردوویی؟! (دیارە كە) قێزتان لێی دێتەوەو پێتان ناخۆشە، وە لە خوا بترسنو پارێزی لێبكەن بێگومان خوا تۆبە وەرگری بەبەزەیی یە.

وە لە ئایەتی ژمارە (٣٦)ی سوورەتی (الإسراء)دا فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَقۡفُ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۚ إِنَّ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡبَصَرَ وَٱلۡفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا ﴿٣٦﴾ ﴾، واتە: وە بەدوای شتێك مەكەوە (و قسەی لێ مەكە) كە زانیارییت دەربارەی نیە، چونكە بێگومان گوێو چاوو دڵ هەموو ئەوانە (خاوەنەكانیان) پرسیار لێكراوە. وە لە سوورەتی (ق)یش دا خوای پەنهانزان فەرموویەتی: ﴿ مَّا يَلۡفِظُ مِن قَوۡلٍ إِلَّا لَدَيۡهِ رَقِيبٌ عَتِيدٞ ﴿١٨﴾ ﴾.

واتە: هەر بێژە (قسەیەك) لە دەم دەربچێ چاودێرێكی بەسەرەوەیەو (دەینووسێ)، وە بێگومان فەرمایشتیش زۆر زۆرن لەوبارەوە، یەكێكە لە فەرمایشتەكان ئەمەیە: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْراً أَوْ لِيَصْمُتْ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ، فەرموویەتی: هەر كەسێك بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە با قسەی چاك بكات، یان بێدەنگ بێو قسە نەكات! وە لە فەرمایشتێكی دیكە زۆر باش ڕوونیی دەكاتەوە كە مەبەستی لەم

---

١) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ: (٥٦٧٢)، وَمُسْلِمٌ: (١٨٢))

فەرمایشتەی پێشێ چی بووە، {عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «أَكْثَرُ خَطَايَا ابْنِ آدَمَ فِي لِسَانِهِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود دەڵێ: گویم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: زۆربەی گوناهو هەڵەکانی وەچەی ئادەم بە هۆی زمانەکەیەتی.

بۆیە ئیمام نەوەوی ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: ئەم ئایەتو فەرمایشتانە، بە تایبەتی فەرمایشتی یەکەم بەڵگەیەکی زۆر ڕوونن لەسەر ئەوەی پێویستە ئینسان هیچ قسەیەك نەکات مەگەر چاك بێت، وە ئەگەر بۆی دەرکەوت ئەو قسەی کە دەیەوێ بیکات بەرژەوەندیی تێدابوو، تەنانەت ئەگەر گومانی هەبوونی لە چاکیی ئەو قسەیەی کە دەیەوێ بیکات ئەوە لەم حاڵەتە نابێ بیکات، وە بەڕاستی پێشینانی ئێمە بۆیە جێگای ئەوەن شوێن پێیان هەڵبگرین، چونکە خاوەن ئەو جۆرە بیرکردنەوانە بوون.

وە جێی سەرسووڕمانە!! لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا زۆر بە داخەوە دەڵێم: کە سەردەمی زانستو تەکنەلۆجیایە، وە زانست لەو پەڕی پێشکەوتنو بەرەو پێش چوون دایە، لە جیاتی سوود وەرگرتنو بەهرەمەند بوون! کەسانێك هەن ئەو ئامێرو تەکنەلۆجیایەیان خواستۆتەوە بۆ ناوزڕاندنی خەڵكو گوتنی قسەی ناشیرینو تانەو تەشەرو تەنانەت غەیبەتو درۆو بوختان بۆ هەڵبەستان، کە بەڕاستی زۆر جێی سەرنجە تا ئەو ڕادەیە ئینسان هەست بە چاودێری خوای بینەرو بیسەرو ئەو فریشتانە نەکات کە لەسەری چاودێرن!! دیارە تاکە هۆکاریش داڕووخانە لە لایەنی عەقیدەوەو نەشارەزاییە بە سیفەتەکانی خوای بێ وێنە، وە بە تایبەتی سیفەتی بینین، وە پێم وایە هەر ئەو تەکنەلۆجیایەی کە ئەو کاری لەسەر دەکاتو وێنەی خەڵکی پێ دەستکاری دەکاو ڕاستییەکانی پێ پێچەوانە دەکاتەوەو خۆی پێ وا لێ دەکات کە شایانی تووڕەیی خوابێ،

---

[1] (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي (الكبير): (٤٤٦)، وَصَحَّحَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٥٣٤))

گەورەترین هۆکارو موعجیزەن بۆ ئەوەی هەست بە چاودێری‌و ترس‌و سام‌و هەیبەتی خوای زاڵی تۆڵە سێنەر بکات، چۆن؟ چونکە خوای پەنهانزان لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿... كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ حَسَرَٰتٍ عَلَيْهِمْ ... ﴿١٦٧﴾﴾، واتە: ئاوا خوا کردەوەکانیان پێشان دەدا، بۆ ئەوەی بۆیان ببێتە مایەی غەم‌و پەژارەوە، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە لە قیامەتێ خوا کردەوەکان بۆ ئینسان بەرجەستە دەکات، چاك بن یان خراپ، کردەوەکانی بەبەرجەستە کراویی دەبینێ، ئەم مەسەلەیەش ئیعجازێکی زانستی تێدایە، چونکە لە سەردەمێك دا کە قورئان هاتۆتە خوارێ کەس نەیزانیوە کردەوەکان چۆن ڕۆژی دوایی بەرجەستە دەکرێنەوە؟ بەڵام ئێستا هەر قسەو کردارێك بویسترێ تۆمار بکرێ، بە کامێرای ڤیدیۆ دەگیرێ، دوایی دەڵێن ئەوە تۆنی؟ ناتوانی بڵێی نا، وەك دەزگا هەولگریی‌و جاسوسییەکان بەکاری دێنن، کامێرای شێراوە دادەنێن هەموو حەرەکەو سەکەنەی ئەو کەسە تۆمار دەکرێ‌و دوایی کە حاشای کرد، دەڵێن: ئا ئەوە نیە تۆی؟! جا ئەوە لە چەند شوێنێك لە قورئاندا ئاماژەی پێدراوە، لە سوورەتی (البقرة) دەفەرموێ: ﴿... كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ حَسَرَٰتٍ عَلَيْهِمْ ... ﴿١٦٧﴾﴾، واتە: ئاوا کردەوەکانیان دەخەینەوە بەرچاو.

وە لە سوورەتی (الكهف)دا دەفەرموێ: ﴿وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرًا ﴿٤٩﴾﴾، واتە: ئەوەی کردبوویان ئامادەبوو، بە ئامادەیی بینییان، وە لە سوورەتی (الجاثية)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٩﴾﴾. واتە: ئێمە نوسخە بەرداریمان لێکرد، فۆتۆکۆپییمان دەکرد ئەوەی ئێوە دەتانکرد.

کەواتە: کردەوەکانمان فۆتۆکۆپی دەکرێن، دیارە ئەگەر ئینسان بتوانێ بە کامێرای ڤیدیۆ شت فۆتۆکۆپێ بکات، دەبێ فریشتەکان کە خوا بەسەر ئێمەوە کردوونیە چاودێر، چ ئامێرێکی گەشەسەندوویان پێبێ کە هەموو کردەوەو حەرەکەو سەکەنەی ئێمە تۆمار بکەن!! بۆیە داواکارم ئەو چەند ئایەتە ببێتە هۆکاری بە خۆداچوونەوەو تۆبە کردنێکی

یەکجارەکیی‌و پەشیمان بوونەوە لە هەموو ئەو کارە نابەجێیانەی تا ئێستا ئەنجامدراون!!

ئێستا کاتی ئەوە هاتوە چەند فەرمایشتێك لەو بارەوە بنووسین:

{عَنْ أَبِي مُوْسَى رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالُوا: يَا رَسُوْلَ اللهِ! أَيُّ الإِسْلاَمِ أَفْضَلُ؟ قَالَ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ» } **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(١)

واتە: ئەبوو مووسا خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ! کام مسوڵمان زۆر باشە؟ فەرمووی: ئەو کەسەی کە مسوڵمانان لە زمان‌و دەستی سەلامەت بن.

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: لَقِيَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم) أَبَا ذَرٍّ فَقَالَ: «يَا أَبَا ذَرٍّ ! أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى خَصْلَتَيْنِ هُمَا أَخَفُّ عَلَى الظَّهْرِ وَأَثْقَلُ فِي الْمِيزَانِ؟ قَالَ: بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: «عَلَيْكَ بِحُسْنِ الْخُلُقِ وَطُولِ الصَّمْتِ، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مَا عَمِلَ الْخَلاَئِقُ بِمِثْلِهِمَا» } **حَدِيثٌ حَسَنٌ**(٢)

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە ئەبوو زەڕ، پێی فەرموو: ئەی ئەبوو زەڕ! ڕێنماییت بکەم بۆ دوو سیفەت کە هەردووکیان ئەنجامدانیان سووك‌و ئاسانن‌و لە تەرازووش گرانن؟ گوتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: داوات لێدەکەم بە ڕەوشت جوانی‌و کەم قسە کردن، وە سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە، هیچ دروستکراوێك بە وێنەی ئەوانی نەکردوە. (یانی: کارێکی وای نەکردوە پاداشتی هێندەی وانی لەسەر بە دەست بێنی).

{عَنْ ثَوْبَانَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «طُوبَى لِمَنْ مَلَكَ لِسَانَهُ، وَوَسِعَهُ بَيْتُهُ، وَبَكَى عَلَى خَطِيئَتِهِ» } **حَدِيثٌ حَسَنٌ**(٣)

واتە: ثەوبان خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرموویەتی: خۆشی بۆ ئەو کەسەی زاڵ بێ لەسەر زمانی (واتە: خاوەنی نەفسی خۆی بێ‌و کۆنترۆڵی بکات)،

---

١) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ: (١١) وَاللَّفْظُ لَهُ، وَمُسْلِمٌ: (١٧٢))

٢) (رَوَاهُ البَزَّار: (٧٠٠١)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٩٣٨))

٣) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ: (٢١٢)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني فِي (صحيح الجامع): (٣٩٢٩))

لە ماڵی خۆی دانیشێ‌و زیانی بۆ خەڵك نەبێ‌و، بگریێ کاتێك بیر لە هەڵەو گوناهەکانی خۆی دەکاتەوە.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ حَفظَ مَا بَيْنَ لِحْيَيْهِ، وَمَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ دَخَلَ الجَنَّةَ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ**(1)

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك ئەو شتەی لە نێوان هەردوو شەویلگە (واتە: زمان)و هەردوو ڕانی دایە (واتە: عەورەتی لە حەرام) بپارێزێ دەچێتە بەهەشتەوە.

{عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ رَفَعَهُ قَالَ: «إِذَا أَصْبَحَ ابْنُ آدَمَ فَإِنَّ الأَعْضَاءَ كُلَّهَا تُكَفِّرُ اللِّسَانَ فَتَقُولُ: اتَّقِ اللهَ فِينَا فَإِنَّمَا نَحْنُ بِكَ فَإِنِ اسْتَقَمْتَ اسْتَقَمْنَا وَإِنِ اعْوَجَجْتَ اعْوَجَجْنَا»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(2)

واتە: ئەبوو سەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرموویەتی: هەموو بەیانیەك کە ڕۆژ دەبێتەوە، گشت ئەندامەکانی وەچەی ئادەم خۆیان ملکەچیی زمان دەکەن‌و پێی دەڵێن: لە خوا بترسە بۆ ئێمە، چونکە ئێمە پەیوەستین بە تۆوە، ئەگەر تۆ ڕاستبی ئەوە ئێمەش واین، وە ئەگەر تۆ خوارو ناڕاستبی ئەوە ئێمەش واین.

{عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، قَالَ: كُنْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي سَفَرٍ، فَأَصْبَحْتُ يَوْمًا قَرِيبًا مِنْهُ وَهُوَ يَسِيرُ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ يُدْخِلُنِي الجَنَّةَ وَيُبَاعِدُنِي مِنَ النَّارِ؟ قَالَ: «لَقَدْ سَأَلتَ عَنْ عَظِيمٍ، وإِنَّهُ لَيَسِيرٌ عَلَى مَنْ يَسَّرَهُ اللهُ تَعَالَى عَلَيْهِ: تَعْبُدُ اللهَ لا تُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً، وَتُقِيمُ الصَّلاَةَ، وتُؤتِي الزَّكَاةَ، وتَصُومُ رَمَضَانَ، وتَحُجُّ البَيْتَ»، ثُمَّ قَالَ: «أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى أَبْوابِ الخَيْرِ؟ الصَّوْمُ جُنَّةٌ، وَالصَّدَقَةُ تُطْفِئُ الخَطِيئَةَ كَمَا يُطْفِئُ المَاءُ النَّارَ، وَصَلاَةُ الرَّجُلِ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ» ثُمَّ تَلا:

---

١) (رَوَاهُ الحَاكِمُ: (٨٠٥٨)، قَالَ الشيخ الألباني: حَسَنٌ صَحِيحٌ، (صحيح الجامع): (٦٢٠٢))

٢) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٢٤٠٧)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٢٨٧١))

﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾السجدة، ثُمَّ قَالَ: «ألا أُخْبِرُكَ بِرأسِ الأَمْرِ، وَعَمُودِهِ، وَذِرْوَةِ سِنَامِهِ؟»، قُلْتُ: بَلَى يَا رسولَ اللهِ، قَالَ: «رَأسُ الأَمْرِ الإِسْلامُ، وَعَمُودُهُ الصَّلاةُ، وَذِرْوَةِ سِنَامِهِ الجِهادُ»، ثُمَّ قَالَ: «ألاَ أُخْبِرُكَ بِمِلاكِ ذَلِكَ كُلِّهِ؟»، قُلْتُ: بلَى يَا رَسُولَ اللهِ، فَأَخَذَ بِلِسانِهِ وقال: «كُفَّ عَلَيْكَ هَذَا»، قُلْتُ: يَا رَسُولَ الله وإنَّا لَمُؤاخَذُونَ بما نَتَكَلَّمُ بِهِ ؟ فقالَ: «ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ ! وَهَلْ يَكُبُّ النَّاسَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ إِلاَّ حَصَائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ؟»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتە: موعاذی کوڕی جەبەل خوا لێی ڕازیی بێ، دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووم لە سەفەرێك، ڕۆژێك لە بەیانییەکەی لێی نیزیك بوومو ئەویش دەڕۆیشت، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا هەواڵم بدەرێ بە کردەوەیەك بیکەم بمخاتە بەهەشتو دوورم بخاتەوە لە ئاگر، فەرمووی: بەڕاستی دەربارەی شتێکی زۆر گەورە پرسیارت کرد، بەڵام ئەوە ئاسانە بۆ کەسێك ئەگەر خوای بەرز بۆی ئاسان بکات!! خوا بپەرستەو هیچ شتێکی بۆ مەکە بە هاوبەشو نوێژ بکەو، زەکات بدەو ڕۆژووی ڕەمەزان بگرە، حەجی ماڵی خوا بکە، پاشان فەرمووی: ئایا هەواڵت پێبدەم دەربارەی دەرگاکانی خێرو چاکە؟ ڕۆژوو سوپەر (قەڵغانە)، وە صەدەقە گوناح لادەباتو نایهێڵێ وەك چۆن ئاو ئاگر لادەباتو دەیکوژێنێتەوە، وە نوێژی پیاو لە ناوەڕاستی شەودا، پاشان (ئەو ئایەتەی) خوێندەوە:**

﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾السجدة.

**واتە: تەنیشتیان دوور دەکەوێتەوە لە جێگای خەوتنیان (لە خەو هەڵدەستن و شەو نوێژ دەکەن)، هاوارو نزا لە پەروەردگاریان دەکەن بە ترسو هیواوە، وە لەو ڕزقو**

---

١) (رَواهُ التِّرمِذِيُّ: (٢٦١٦)، وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَابْنُ مَاجَه: (٣٩٧٣)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٥١٣٦))

ڕۆژییەی پێمان داون دەبەخشن . ئنجا هیچ کەس نازانێ چی شاراوەتەوە بۆیان لە (بەهەشت دا کە هۆی) گەشبوونی چاوانن ئەم پاداشتە (دەدرێنەوە) بە هۆی ئەو کردەوانەی کە کردوویانە . پاشان فەرمووی: سەری ئەم فەرمانەو کۆلەگەی و لووتکەی دونگەکەیت پێنەڵێم؟! گوتم: با، ئەی پێغەمبەری خوا ! فەرمووی: سەری ئەم ئیسلامە کارکردنە، کۆلەگەکەی نوێژە، لووتکەی دونگەکەی جیهادە، ئنجا فەرمووی: ئەدی پێت نەڵێم: خاوەنی هەموو ئەمانە کێن؟ گوتم: با، ئەی پێغەمبەری خوا ! زمانی گرتو فەرمووی: بەس زمانت بگرە ئاوا، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە بە هۆی ئەوەی قسە بە زمانمان دەکەین گوناهبار دەبین، فەرموو: لەبار دایکت بچووبایەو دایکت بۆت بگرییێ!! ئەدی ئەم خەڵکە سەراو سەر دەخرێنە ئاگرەوە بە هۆی زمانیانەوە نیە؟!!

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ صَمَتَ نَجَا»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرۆ خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بێ دنگ بوو، ئەوە ڕزگاری بوو.

## دوو بەسەرهات لەم بارەیەوە[2]

- دەگێڕنەوە جارێکی کابرایەك جنێوو قسەی ناشیرین بە یەکێك لە خواناسانی پایە بڵند دەدات، ئەویش ڕادەوەستێ هەتا جنێوەکانی تەواو دەکات، پاشان پێی دەڵێ: کاکە گیان! ئەگەر ڕاست بکەی خوا لە من ببورێ، وە ئەگەر درۆش بکەی خوا لە تۆ ببورێ!

- هەروەها جارێکی دیکە کابرایەك قسەی خراپی بە خواناسێك گوتن، ئەویش پێی گوت: برای خۆم! ئەگەر من دۆزەخی بم شیاوی لەوەش خراپ ترم کە تۆ گوتت، وە ئەگەر بەهەشتی بم قسەکانی تۆ زیانێکم لێ نادەن، بڕۆ خوات لەگەڵ!

---

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٢٦١٦)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٥٣٦))

٢) ڕێگای صالح بوونو بەرەو خوا چوون، چاپی پێنجەم، نوسینگەی تەفسیر.

# پایەو پاداشتی پاراستنی داوێن‌و چاو

چاویش کە یەکێکە لە پێنج هەستەوەرەکان وەك پێشتر باسمان کرد، ئەویش هۆکارێکە بۆ ئەنجامدانی کاری چاك‌و خراپ، کە بێگومان ئینسانی مسوڵمان چەند شتێکی لێ قەدەغەکراوەو نابێ سەیریان بکات، جا لە ئەنجامی پابەند بوون پێیەوە دەبێتە خاوەن پایەو پاداشتێکی زۆرو زەوەندە، وە ئەگەر پابەندیش نەبوو بەو فەرمایشتانە، شایستەی سزاو جەزرەبەی خوای دادگەر دەبێ، وە هەر کارێکی خراپیش کە داوێن دەیکات هۆکارەکەی هەر چاوە، جا خوای پەروەردگار لەوبارەوە لە ئایەتی ژمارە: (٣٠)ی سوورەتی (النور)دا فەرموویەتی: ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا۟ مِنْ أَبْصَـٰرِهِمْ وَيَحْفَظُوا۟ فُرُوجَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾﴾

واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ: بە پیاوانی ئیماندار چاوی خۆیان (لە سەیر کردنی ئافرەتی نامەحرەم) دابخەن‌و بپارێزن، وە عەورەتیان (لە داوێن پیسیی)، بپارێزن ئەوە چاکترەو پاکترە بۆ ئەوان، بێگومان خوا شارەزایەو بە ئاگایە بە هەموو کردەوەیەك کە دەیکەن.

هەروەها بەهەمان شێوە دەربارەی ئافرەتانیش خوای پەنهانزان هەر لە سوورەتی (النور)دا فەرموویەتی: ﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَـٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَـٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ ... ﴿٣١﴾﴾، واتە: وە بە ئافرەتانی ئیماندار بڵێ: چاوی خۆیان لابدەن لە سەیر کردنی نامەحرەم‌و شتی قەدەغەکراو، یانی: وەك چۆن تەماشا کردن‌و سەیر کردنی پیاوان بۆ ئافرەتان قەدەغەیە، بە هەمان شێوە سەیرکردنی ئافرەتانیش بۆ پیاوان قەدەغەیە.

وە کە باسی ئیماندارانی سەرفرازو سەرکەوتوو دەکات دەفەرموێ: ﴿قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ فِى صَلَاتِهِمْ خَـٰشِعُونَ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنِ ٱللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَوٰةِ فَـٰعِلُونَ ﴿٤﴾ وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَـٰفِظُونَ ﴿٥﴾﴾المؤمنون.

واتــە: بەڕاسـتی بـڕواداران سـەرفرازن، سـەرکەوتوون . ئـەو کەسـانەی کـە لـە نوێژەکانییاندا لە خوا دەترسن گـەردن کەچن بۆ خـوا . وە ئەوانـەی لەشتی بێ هودە خۆیـان دوور دەگـرن . وە ئەوانـەی کـە زەکاتی (سامانیان) دەردەکـەن . وە ئەوانـەی کە پارێزەری داوێنیانن لە شەروالْ پیسیی.

**خوێنەری بەڕێز!**

هەمیشە ئەم قسەی ئەنەسی کوڕی مالیکت لە بیر بێ، کە یەکێکە لـە صـەحابە هـەرە بەڕێزەکان و، وە بەوەش لە هاوەڵانی دی جیادەکرێتەوە کە دە ساڵی تـەواو لـە خزمـەتی پێغەمبـەری خـوادا قوتـابی و شـاگرد بـووە، گوتوویـەتی: {إذا مَرَّت بِكَ امرَأةٌ فَغمِّض عَينَيكَ حَتَّى تُجَاوِزَكَ} !!، واتـە: ئەگـەر ئافرەتێك بـە لات داهات، چاوەکانت لێی لابدە هەتا لە تۆ ڕەت دەبێ!! چ تەماشا کردنی پیاو بۆ ئافرەت، یان بە پێچەوانەوە، هەرچەندە شتێکە بڕیاری خوای لەسـەر دراوە، هـەر دەبێ ڕوو بدات، وەك لـەم فەرمایشتە هاتوە: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّ اللهَ كَتَبَ عَلَى ابْنِ آدَمَ حَظَّـهُ مِنَ الزِّنَـا أَدْرَكَ ذَلِكَ لاَ مَحَالَـةَ، فَزِنَـا الْعَيْنَيْنِ النَّظَرُ، وَزِنَـا اللِّسَانِ النُّطْقُ، وَالنَّفْسُ تَتَمَنَّى وَتَشْتَهِي، وَالْفَرجُ يُصَدِّقُ ذَلِكَ كُلَّـهُ أَوْ يُكَذِّبَـهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: ئەبوو هوڕەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بێگومان خوای گـەورە بەشی زینـای لەسـەر وەچـەی ئـادەمی نووسیوەو هـەر دەشبێ پێـی بگـەن، زینای دوو چاوەکان تەماشا کردنە، وە زینای زمان قسە کردنە، وە نەفس تەماننای دەکاو ئارەزووی بۆی دەچێ، وە داوێنیش هەموو ئەوانە بەڕاست دادەنێ یان بە درۆی دادەنێ.

بەڵام ئازایی بۆ ئەو کەسەی چاوەڕوانی ئـەم پاداشتـەی خوارەوە دەکات و بـە هـەموو شێوەیەك خۆی دەپارێزێ لە تەماشا کردنی نامەحرەم.

---

١) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ: (٥٨٨٩) وَاللَّفْظُ لَهُ، وَمُسْلِمٌ: (٦٩٢٤))

{عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ حَيْدَةَ قَالَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ رَسُولُ اللهِ: ثَلاثَةٌ لا تَرَى أَعْيُنُهُمُ النَّارَ: «عَيْنٌ حَرَسَتْ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَعَيْنٌ بَكَتْ مِنْ خَشْيَةِ اللهِ، وَعَيْنٌ كَفَّتْ عَنْ مَحَارِمِ اللهِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**(١)

**واتە: موعاویەی کوڕی حیدە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سێ کەس هەن چاویان ئاگر نابینێ (لە ڕۆژی دوایی): چاوێك ئێشکگری کردبێ لە پێناوی خوا، چاوێك گریابێ لە ترسی خوا، چاوێك سنووری قەدەغەکراوەکانی خوای نەشکاندبێ.**

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنْ رَسُوْلِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ قَالَ: «تَقَبَّلُوا لِي بِسِتٍّ أَتَقَبَّلْ لَكُمْ بِالْجَنَّةِ»، قَالُوا: وَمَا هِيَ؟ قَالَ: «إِذَا حَدَّثَ أَحَدُكُم فَلاَ يَكْذِبْ، وَإِذَا وَعَدَ فَلاَ يُخْلِفْ، وَإِذَا اؤتُمِنَ فَلاَ يَخُنْ، غُضُّوا أَبْصَارَكُمْ، وَكُفُّوا أَيْدِيَكُم، وَاحْفَظُوا فُرُوجَكُمْ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**(٢)

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ئێوە شەش شتم لێ وەربگرن، منیش بەهەشتتان بۆ مسۆگەر دەکەم، گوتیان: ئەو (شەش شتە) چییە؟ فەرمووی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە قسەی کرد درۆ نەکات، وە ئەگەر بەڵێن و پەیمانی دا با سەرپێچیی نەکات، ئەگەر ئەمانەتی پێسپێردرا با خیانەتی لێنەکات، چاوی خۆتان لادەن لە سەیر کردنی شتی حەرام، وە دەستی خۆتان بگرنەوە لە شتی قەدەغەکراو، وە عەورەتیی خۆتان بپارێزن.**

{عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِذَا صَلَّتْ الْمَرْأَةُ خَمْسَهَا، وَصَامَتْ شَهْرَهَا، وَحَفِظَتْ فَرْجَهَا، وَأَطَاعَتْ زَوْجَهَا، قِيلَ لَهَا ادْخُلِي الْجَنَّةَ، مِنْ أَيِّ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ شِئْتِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**(٣)

---

١) (أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِيُّ: (١٠٠٣)، بِإِسْنَادٍ رِجَالُهُ ثِقَاتٌ، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني، في (صحيح الترغيب والترهيب): (٣٣٢٦))

٢) (رَوَاهُ الحَاكِمُ: (٨٠٦٧) وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني، وَقَالَ في (السلسلة الصحيحة): (١٥٢٥))

٣) (رَوَاهُ أَحْمَد: (١٦٦١) وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (١٩٣٢))

واتە: عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئافرەت پێنج نوێژە فەرزەکانی کردو، ڕەمەزانیش بە ڕۆژوو بوو، داوێنی خۆشی پاراست لە حەرامو، گوێڕایەڵی مێردەکەشی کرد (لە شتی شەرعیی) ئەوە پێی دەگوترێ: بڕۆ بەهەشتێ لە کام دەرگای بەهەشتەوە پێت خۆشە.

{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «يَا شَبَابَ قُرَيْشٍ! لَا تَزْنُوا، وَاحْفَظُوا فُرُوجَكُمْ، أَلاَ مَنْ حَفِظَ فَرْجَهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[1]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی گەنجانو لاوانی قورەیش! زینا مەکەنو داوێنی خۆتان بپارێزن، چونکە هەر کەسێك داوێنی خۆی لە حەرام بپارێزێ دەچێتە بەهەشتەوە.

{عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ تَوَكَّلَ لِي مَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ وَمَا بَيْنَ لَحْيَيْهِ تَوَكَّلْتُ لَهُ بِالْجَنَّةِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

واتە: سەهلی کوڕی سەعدی ساهیلیی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك گرەنتی پاراستنی زمانو دامێنیم بداتێ، (کە بیانپارێزێ لە حەرام) من گرەنتی چوونە بە هەشتی دەدەمێ.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ حَفِظَ مَا بَيْنَ لِحْيَيْهِ، وَمَا بَيْنَ رِجْلَيْهِ دَخَلَ الجَنَّةَ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيح**[3]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك ئەو شتەی لە نێوان هەردوو شەویلگە (واتە: زمان) و هەردوو ڕانی دایە (واتە: عەورەت) بپارێزێ (لە حەرام) دەچێتە بەهەشتەوە.

---

١) (رَوَاهُ البَزَّار: (٤٧٢٩)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٢٦٩٦))

٢) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٦٤٢٢))

٣) (رَوَاهُ الحَاكِمُ: (٨٠٥٨) وَقَالَ: صَحِيح الإسناد، قَالَ الشيخ الألباني: حَسَنٌ صَحِيحٌ، أنظر: (صحيح الجامع): (٦٢٠٢))

{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لاَ تَزْنُوا؛ فَإِنَّهُ مَنْ سَلَّمَ اللَّهُ له شَبَابَهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[1]

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زینا مەکەنو داوێنی خۆتان بپارێزن، چونکە هەر کەسێك بە گەنجێتی خوا سەلامەتی کردبێ لە داوێنی پیسیی، دەچێتە بەهەشتەوە.**

## بەسەرهاتێك لەمبارەیەوە

**(ابن الجوزي) دەڵێ: گەنجێکی هەژار لە کۆڵانەکان شتی دەفرۆشت، ڕۆژێك ئافرەتێك بانگی کرد بچێتە ماڵی تا کەلو پەلەکان ببینێ، کە چووە ژوور، ئافرەتەکە دەرگای داخستو گوتی: دەبێ زینام لەگەڵ دا بکەی، گەنجەکە ڕازی نەبوو، ئەویش گوتی: بە دەنگی بەرز هاوار دەکەمو دەڵێم ئەو گەنجە هاتوە زینام لەگەڵدا بکات ئەو کاتە یان زیندان دەکرێی یان دەکوژرێی، زۆر ئامۆژگاری ئافرەتەکەی کرد سوودی نەبوو، گەنجەکە گوتی: باشە، بەڵام ڕێگەم بچمە سەر ئاو، کە چوو جەستەی خۆی بە پیسایی کرد، کە بینی زۆر بە پەلە دەری کرد لە ماڵ، کە بە کۆڵاندا دەڕۆیی منداڵ دوای کەوتن بە گاڵتەوە دەیانگوت شێتە، کە گەیشتە ماڵ خۆی شۆرد، لە دوای ئەمە بەردەوام بۆنی میسکی لێدەهات تا مرد.**

---

[1]) (رَوَاهُ الطيالسي: (٢٧٥٦)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٢٦٩٦))

# پایەو پاداشتی سەلام كردن

خوای پەروەردگار یەكێك لە ناوە بەرزو جوانەكانی بریتیە لە: (السَّلَام)، واتە: ئاشتی و سەلامەتی، وە بێگومان (ئاشتی)یش گەورەترین هۆكاری بەختەوەریی ئینسانەكانە لە ژیانی دنیا، وەك دەبینین خوای پەروەردگار منەت دەكاتە سەر قورەیش كە بەر لە ئیسلام ئاشتی و ئاسایشیان نەبووەو ئەم حاڵەتە بە هۆی هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بووە واقیعێكی بەرجەستەكراو، نەك هەر لە نێو وڵات، بەڵكو لە نێو دڵی ئینسانەكانیشدا، وەك لە سوورەتی (قریش)دا فەرموویەتی: ﴿ فَلْيَعْبُدُوا۟ رَبَّ هَٰذَا ٱلْبَيْتِ ۝٣ ٱلَّذِىٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍۭ ۝٤ ﴾، واتە: دەبا خاوەنی ئەم خانە (كەعبە)یە بپەرستن، ئەو كەسەی كە لە برسیێتی (ڕزگار كردن و) خواردەمەنی بۆ ناردن وە لە ترس و بیم (پاراستنی و) دڵنیایی كردن.

وە مەبەستی ئێمە لە وشەی: (السَّلَام) كە لێرەدا بەكارمان هێناوە بریتیە: لەو چەند وشەیەی كە برایەكی مسوڵمان دەگات بە برا مسوڵمانەكەی خۆی دەریدەبڕێ و پێی ڕادەگەیەنێ، كە ئەو خۆشەویستە لە لای وی، وە دووعای خێری بۆ دەكات و بە شێوەیەكی زۆر جوان وەسفی دەكات كە بریتیە لە (بەرەكەتی خوا)!! ئنجا دەربارەی سەلام كردنیش خوا لە قورئانی بەڕێزدا فەموویەتی: ﴿ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا۟ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَسِيبًا ۝٨٦ ﴾النساء، واتە: هەر كاتێك سڵاویكتان لێكرا ئەوە بە چاكتر لەو سڵاوە سڵاو بكەن، یان وەك خۆی بیسەننەوە، بێگومان خوا بەردەوام چاودێرەو لەسەر هەموو شتێك لێتان دەپرسێتەوە.

وە خوای زاناوشارەزا هەواڵی پێداویان كە قسەی سەر زمانی فریشتەكانیش لە بەهەشت هەر سەلام كردنە لە بەهەشتیەكان و تەنانەت خوای پەروەردگار بۆ زێدە دڵنیابوون و دڵخۆشكردنی ئیمانداران سەلامیان لێ دەكات وەك دەفەرموێ: ﴿ لَهُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ ۝٥٧ سَلَٰمٌ قَوْلًا مِّن رَّبٍّ رَّحِيمٍ ۝٥٨ ﴾یس، واتە: (بەهەشتیەكان لە

بەهەشت)، هەموو جۆرە میوەیەکیان بۆ هەیە، هەموو داوایەکیان بۆ جێبەجێ دەکرێ، (سەلام)یان لێ دەکرێ بە قسەیەکی (شیرین) لەلایان پەروەردگاریانەوە.

وە بەپێی فەرمایشتی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ، سەلام کردن هۆکاری چوونە بەهەشتو نیزیك بوونەوەیە لە خوای پەروەردگار، کە ئەمە دەقی فەرموودەکەیە: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لاَ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا، وَلاَ تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا، أَلاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى أَمْرٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ؟ أَفْشُوا السَّلاَمَ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[١]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە، ناچنە بەهەشت هەتا ئیمان نەهێنن، وە تا یەکدیشتان خۆشنەوێ ئیمانتان نەهێناوە! ئایا کارێکتان پێ بڵێم ئەگەر ئەنجامی بدەن بە هۆیەوە یەکدیتان خۆشدەوێ؟ لە نێو خۆتان سەلام بڵاو بکەنەوە.

{عَنْ عِمْرَانَ أَنَّ رَجُلاً جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ فَرَدَّ عَلَيْهِ، ثُمَّ جَلَسَ، فَقَالَ: «عَشْرٌ»، ثُمَّ جَاءَ آخَرُ فَقَالَ السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ فَرَدَّ عَلَيْهِ، ثُمَّ جَلَسَ، فَقَالَ: «عِشْرُونَ»، ثُمَّ جَاءَ آخَرُ فَقَالَ: السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ فَرَدَّ عَلَيْهِ، ثُمَّ جَلَسَ، فَقَالَ: «ثَلاَثُونَ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[٢]

واتە: عیمڕان خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ) پێغەمبەریش ﷺ وەڵامی دایەوەو پاشان پیاوەکە دانیشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە پاداشتی ئەم سەلامە دە چاکەی بۆ نووسرا، پاشان یەکێکی دیکە هاتە خزمەتیو گوتی: (السَّلاَمُ

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٠٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٢٣٦) وَاللَّفْظُ لَهُ، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني)

٢) (رَوَاهُ أَحْمَدُ: (١٩٩٦٢)، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ قوي عَلَى شَرْطِ مُسْلِم رجاله ثقات، وَأَبُو دَاوُدَ: (٥١٩٧)، وَالطَّبَرَانِيُّ في (الأوسط): (٥٩٤٨)، وَالتِّرمِذِيُّ: (٢٦٨٩))

عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ) پێغەمبەریش ﷺ وەڵامی دایەوەو پاشان پیاوەکە دانیشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە پاداشتی ئەم سەلامە بیست چاکەی بۆ نووسرا، پاشان پیاوێکی دیکە هات گوتی: (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ) پێغەمبەریش ﷺ وەڵامی دایەوەو پاشان پیاوەکە دانیشت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە پاداشتی ئەم سەلامە سیی چاکەی بۆ نووسرا.

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ لِي رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «يَا بُنَيَّ! إِذَا دَخَلْتَ عَلَى أَهْلِكَ، فَسَلِّمْ، يَكُنْ بَرَكَةً عَلَيْكَ، وَعَلَى أَهْلِ بَيْتِكَ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[1]

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: ڕۆڵە گیان! هەر کات چوویەوە ماڵێ: سەلامیان لێ بکە، چونکە ئەو سەلامە دەبێتە بەرەکەت‌و پێز هەم بۆ خۆت، وە هەم بۆ خزم‌و کەسی نێو ماڵەکەت.**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنْ رَسُوْلِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِذَا لَقِيَ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَلْيُسَلِّمْ عَلَيْهِ، فَإِنْ حَالَتْ بَيْنَهُمَا شَجَرَةٌ أَوْ جِدَارٌ أَوْ حَجَرٌ، ثُمَّ لَقِيَهُ، فَلْيُسَلِّمْ عَلَيْهِ أَيْضاً»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە بە برای مسوڵمانی خۆی گەیشت با سەلامی لێبکات، وە ئەگەر دارێك یان دیوارێك یان بەردێك کەوتە نێوانیان، پاشان پێی گەیشتەوە، با دیسان سەلامی لێبکاتەوە.**

---

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ، وَقَالَ: حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَحَسَّنَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (١٦٠٨))

٢) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (٥٢٠٢)، وَصَحَّحَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٨٦))

{عَنْ أَبِي أُمَامَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ أَوْلَى النَّاسَ بِاللهِ مَنْ بَدَأَهُمْ بِالسَّلَامِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[١]

واتە: ئەبی ئومامە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شایستەترین‌و لە پێشترین کەس بە چاودێری خوا ئەو کەسەیە کە لە پێش دا سەلام بکات.

{عَنْ أَبِي أُمَامَةَ وَعَنْهُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُوْلَ اللهِ! الرَّجُلَانِ يَلْتَقِيَانِ أَيُّهُمَا يَبْدَأُ بِالسَّلَامِ؟ فَقَالَ: «أَوْلَاهُمَا بِاللهِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[٢]

واتە: ئەبی ئومامە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا کاتێک دوو پیاو دەگەنە یەکدی، ئایا کامیان بە سەلام دەست پێدەکات؟ فەرمووی: ئەوەیان کە شایستەترو لە پێشترە بە چاودێری خوا.

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ قَالَ: «إِنَّ السَّلَامَ اسْمٌ مِنْ أَسْمَاءِ اللهِ وَضَعَهُ فِي الأَرْضِ فَأَفْشُوهُ بَينَكُمْ، فَإِنَّ الرَّجُلَ الْمُسْلِمِ إِذَا مَرَّ بِقَومٍ فَسَلَّمَ عَلِيهِم فَرَدُّوا عَلَيهِ، كَانَ لَهُ عَلَيهِم فَضْلُ دَرَجَةٍ بِتَذكِيرِهِ إِيَّاهُمُ السَّلَامَ، فَإِنْ لَمْ يَرُدُّوا عَلَيهِ، رَدَّ عَلَيهِ مَنْ هُوَ خَيرٌ مِنْهُمْ وَأَطْيَب»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[٣]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: بەڕاستی سەلام ناوێکە لە ناوەکانی خوا لەسەر زەوی داناوە ئێوەش لە نێو خۆتان بڵاوی بکەنەوە، وە بێگومان هەر پیاوێکی مسوڵمان کاتێک بە لای کۆمەڵێکدا تێپەڕی‌و سەلامی لێکردن ئەوانیش وەڵامی سەلامەکەیان داوە، ئەوە پلەیەکی لەسەر هەمووان هەیە بە هۆی ئەوەی کە سەلامەکەی بیرخستوونەتەوە، وە ئەگەر وەڵامیان نەدایەوە، کەسانێک وەڵامی دەدەنەوە کە زۆر لەوان باشترو چاکترن (کە دیارە مەبەست پێی فریشتە بەڕێزەکانن).

---

١) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (٥١٩٩)، وَصَحَّحَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٣٣٨٢))

٢) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٢٦٩٤)، وَصَحَّحَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (المشكاة): (٤٦٤٦))

٣) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ في (الأدب المفرد): (١٠٣٩) مَوْقُوفَاً، وَالبَزَّار: (١٧٧١) مَرْفُوعَاً، وَاللَّفْظُ لَهُ، وَحَسَّنَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٦٠٧))

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «يُسَلِّمُ الصَّغِيرُ عَلَى الْكَبِيرِ، وَالْمَارُ عَلَى الْقَاعِدِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[١]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بچووک سەلام لە گەورە دەکات، وە کەسی پیادە سەلام لە دانیشتوو دەکات، وە کەم سەلام لە زۆر دەکات.**

{عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «الْحَجُّ الْمَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزَاءٌ إلاَّ الْجَنَّةَ»، قَالُوا: يَا نَبِيَّ اللهِ، مَا الْحَجُّ الْمَبْرُورُ؟ قَالَ: «إِطْعَامُ الطَّعَامِ، وَإِفْشَاءُ السَّلَامِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[٢]

**واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەجی قبووڵ کراو جگە لە بەهەشت پاداشتێکی دیکەی بۆ نیە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ! حەجی قبووڵ کراو چییە؟ فەرمووی: نان دانە خەڵک و بڵاو کردنەوەی سەلام. واتە: پاداشتی ئەنجامدانی ئەم دوو کارە بەهەشتە.**

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) أَيُّ الإِسْلَامِ خَيْرٌ ؟ قَالَ: «تُطْعِمُ الطَّعَامَ، وَتَقْرَأُ السَّلَامَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[٣]

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمر خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد، ئایا کام کردەوە لە ئیسلامەتی دا سوودو پاداشتی باشترە؟ فەرمووی: نان دان بە خەڵک، وە سەلام بکەی لە کەسێک بیناسی یان نەیناسی.**

---

١) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: الْبُخَارِيُّ: (٥٨٧٧) وَاللَّفْظُ لَهُ، وَمُسْلِمٌ: (٥٧٧٢))

٢) (رَوَاهُ ابْنُ حِبَّانَ: (١٤٥٢٢)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٣١٧٠))

٣) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: الْبُخَارِيُّ: (٢٨)، وَمُسْلِمٌ: (١٦٩))

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَا مِنْ أَحَدٍ يُسَلِّمُ عَلَيَّ إِلاَّ رَدَّ اللهُ عَلَيَّ رُوحِي حَتَّى أَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلاَمَ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کەسێك نیە کە سەلامم لێبکات حەتمەن خوای پەروەردگار ڕووحەکەم بۆ دەگێڕێتەوە هەتاکو وەڵامی سەلامەکەی دەدەمەوە.**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِذَا انْتَهَى أَحَدُكُمْ إِلَى مَجْلِسٍ، فَلْيُسَلِّمْ، وَإِذَا قَامَ، فَلْيُسَلِّمْ فَلَيْسَتِ الأُوْلَى بِأَحَقَّ مِنَ الآخِرَةِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[2]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یەکێك لە ئێوە گەیشتە نێو مەجلیسێك، با سەلام بکات، وە ئەگەر هەڵساو ویستی بڕوا، دیسان سەلام بکات، چونکە سەلامی یەکەم لە سەلامی دووەم لە پێشترو شایستەتر نیە.**

{عَنْ أَبِي أُمَامَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «ثَلاَثَةٌ كُلُّهُمْ ضَامِنٌ عَلَى اللهِ: إِنْ عَاشَ رُزِقَ وَكُفِيَ، وَإِنْ مَاتَ أَدْخَلَهُ اللهُ الْجَنَّةَ، مَنْ دَخَلَ بَيْتَهُ فَسَلَّمَ فَهُوَ ضَامِنٌ عَلَى اللهِ، وَمَنْ خَرَجَ إِلَى الْمَسْجِدِ فَهُوَ ضَامِنٌ عَلَى اللهِ، وَمَنْ خَرَجَ فِي سَبِيلِ اللهِ فَهُوَ ضَامِنٌ عَلَى اللهِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[3]

**واتە: ئەبوو ئومامەی باهیلی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرموویەتی: سێ کەس هەن هەموویان زامنن لە لایەن خواوە: ئەگەر ژیا ڕۆزی دەداو**

---

١) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (٢٠٤٣)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٢٢٦٦))

٢) (رَوَاهُ ابْنُ حِبَّانَ: (٤٩٥)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (المشكاة): (٤٦٦٠))

٣) (رَوَاهُ ابْنُ حِبَّانَ: (٤٩٩)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٢٣١))

کیفایەتی دەکات، وە ئەگەر مرد خوا دەیخاتە بەهەشتەوە، کەسێك کە چووە ماڵەوە سەلامی کرد، ئەوە زامنە لەلایەن خواوە، وە کەسێك لە ماڵ دەچوو بۆ مزگەوت زامنە لەلایەن خواوە، وە کەسێك دەرچوو بۆ جیهاد لە پێناوی خوادا زامنە لەلایەن خواوە. یانی: خوا ئەوانە دەخاتە ئەستۆی خۆی.

{عَنِ الْبَرَاءِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَلْتَقِيَانِ فَيَتَصَافَحَانِ إِلاَّ غُفِرَ لَهُمَا قَبْلَ أَنْ يَفْتَرِقَا»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: بەرائی کوڕی عازیب خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر دوو مسوڵمانێك بە یەکدی بگەنو تەوقە بکەن، ئەوە بە مسۆگەریو دڵنیایی پێش ئەوەی لە یەکدی جیاببنەوە خوا لە گوناهی هەردووکیان خۆش دەبێ.

## ماچ کردنی پیاوان لە نێوان خۆیان ڕێگەی پێنەدراوە!

{عن أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ! الرَّجُلُ مِنَّا، يَلْقَى أَخَاهُ، أَوْ صَدِيقَهُ أَيَنْحَنِي لَهُ؟ قَالَ: «لاَ» قَالَ: أَفَيَلْتَزِمُهُ وَيُقَبِّلُهُ؟ قَالَ: «لاَ» قَالَ: أَفَيَأْخُذُ بِيَدِهِ وَيُصَافِحُهُ؟ قَالَ: «نَعَمْ»} **حديث حسنٌ**[2]

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! کاتێك پیاوێك لە ئێمە دەگاتە برادەرێکی خۆی، یان دۆستێکی خۆی ئایا بۆی بچەمێتەوە؟ فەرمووی: نەخێر، گوتی: ئەی دەستی بکاتە ملیو ماچی بکات؟ فەرمووی: نەخێر، گوتی: ئەی دەستی بخاتە نێو دەستیو تەوقەی لەگەڵ بکات؟ فەرمووی: بەڵێ. کەواتە: ئەوە سوننەتە!!

---

١) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (٥٢١٤)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٥٢٥))

٢) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٢٧٢٨) وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح سُنن التِّرمِذِي)

ڕوونکردنەوە:

هەندێك لە زانایان لە چەند کاتێك ڕێگەیان داوە:

١- هاتنەوە لە سەفەرێکی دوور.

٢- نەبینینی یەکدی بۆ ماوەیەکی زۆر.

٣- لە کاتی موناسەبەتەو بۆنەکان وەك جەژن.

## بەسەرهاتێك دەربارەی سەلام کردن [١]

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی‌و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیویست بچێتە حەج (نیەتی عومرەی هەبوو لە مانگی ڕەمەزان)، ئافرەتێکیش بە مێردەکەی خۆی گوت: منیش حەز دەکەم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بچمە حەجێ، پیاوەکەش گوتی: ئاخر ژنێ ئێمە هیچ شتێکمان نیە پێی بچیە حەجێ! ژنەکەش گوتی: با بە فلان حوشترت دەچمە حەجێ، کابراش گوتی: ئاخر ژنێ ئەوە تەرخان کراوە بۆ جەنگ‌و جیهاد لە پێناوی خوا، پیاوەکەی چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: سەلام لە پێغەمبەری خوا بکە، وە داواشی لێکردووم تا حەج لەگەڵ تۆ بکات، منیش پێم گوت: ئاخر ژنەکە ئێمە هیچمان نیە پێی بچی بۆ حەج، کەچی دەڵێ: با بە فلان حوشترەت، منیش گوتم: ئاخر ئەوە بۆ جەنگ‌و جیهاد تەرخان کراوە، لە وەڵامدا پێغەمبەری خوا بەو پیاوەی فەرموو: {«أَقْرِئْهَا السَّلاَمَ وَرَحْمَةَ اللهِ وَبَرَكَاتِهِ، وَأَخْبِرْهَا أَنَّهَا تَعْدِلُ حَجَّةً مَعِي»، يَعْنِي عُمْرَةً فِي رَمَضَانَ}، واتە: سەلام‌و ڕەحمەت‌و بەرەکەتی منی پێ ڕابگەیەنەو، پێشی بڵێ: ئەوە بۆ وی لە بەرانبەر پاداشتی ئەوەیە کە عومرەکەم لەگەڵ بکات لە مانگی ڕەمەزاندا.

---

[١] (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (١٩٩٠) وقال الشيخ الألباني: حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ).

# پایەو پاداشتی

# ڕووخۆشیو قسەخۆشی

ڕووخۆشیو زەردەخەنەی سەر لێو یەکێکە لە سیفەتە هەرە دیارو هەمیشەییەکانی سەروەرمان ﷺ، وە یەکێکە بوو لە هۆکارە گرنگەکان بۆ سەرنج ڕاکێشانی خەڵکی، وە دیارە ئەم سیفەتە بە یەکێك لە ڕەوشتە ئیسلامییە زۆر پەسندو بەرزەکان دادەنرێت، خوای پەروەردگار لە چەند شوێنێك لە قورئانی بەرزو بەڕێزدا ئاماژەی بۆ کردوە تەنانەت ئەگەر بەیەك وشەی جوانیش بێ ئینسان دەتوانێ ببێتە خاوەنی ئەم ڕەوشتە جوانە، وەك خوای بەبەزەیی لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەموێ: ﴿قَوۡلٌ مَّعۡرُوفٌ وَمَغۡفِرَةٌ خَيۡرٌ مِّن صَدَقَةٖ يَتۡبَعُهَآ أَذٗىۗ وَٱللَّهُ غَنِيٌّ حَلِيمٞ ﴿٢٦٣﴾﴾

واتە: قسەیەکی باشو لێبوردنێك (لەگەڵ کەسی هەژاردا) لە خێرکردنێك باشترە کە ئازاردانی بە دوادابێ (یانی خێرێك بکەیو دوای بە چاوی کابرای خێرپێکراوی دا بدەیەوە)، وە خوا بێ نیازەو هێدیی یە.

{عَنْ عَلِيٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ فِي الْجَنَّةِ غُرَفًا تُرَى ظُهُورُهَا مِنْ بُطُونِهَا، وَبُطُونُهَا مِنْ ظُهُورِهَا، فَقَامَ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: لِمَنْ هِيَ يَا رَسُولَ اللهِ ؟ قَالَ: هِيَ لِمَنْ قَالَ طَيِّبَ الْكَلَامَ، وَأَطْعَمَ الطَّعَامَ، وَأَفْشَى السَّلَامَ، وَصَلَّى بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ»} **حديثٌ حسنٌ**[1]

واتە: ئیمامی عەلی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بەڕاستی کۆشكو خانووی وا لە بەهەشت هەن دەرەوەی لە ناوەوەی دەبینرێ، وە ناوەوەی لە دەرەوەی دەبینرێ، پیاوێکی دەشتەکی هەڵساو گوتی: ئەوە هی کێیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: ئەوە هی ئەو کەسەیە کە قسەی خۆشو زمان شیرین بێو ناندەربێو سەلام بڵاوبکاتەوەو بە شەوان شەونوێژ دەکات لە کاتێکدا خەڵك خەوتوون.

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (١٩٨٤)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (المشكاة): (٢٣٣٥))

{عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «اتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ»} **حديث صحيح**(١)

واتە: عەدیی کوڕی حاتیم خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆتان بپارێزن لە ئاگر ئەگەر بە پارچە خورمایەکیش بێ، ئەگەر ئەویشتان نەبوو بە قسەیەکی خۆش‌و جوان.

{عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: لِيَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لَا تَحْقِرَنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ شَيْئًا، وَلَوْ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(٢)

واتە: ئەبوو زەڕ خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: هیچ شتێك لە چاکەکردن بە کەم مەزانە، ئەگەر تۆ بگەیە برای خۆت بە ڕوویەکی گەش‌و خۆشەوە (چاکەت بۆ دەنووسرێ).

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّكُمْ لَا تَسَعُونَ النَّاسَ بِأَمْوَالِكُمْ، وَلَكِنْ لِيَسَعْهُمْ بَسْطُ الْوَجْهِ، وَحُسْنُ الْخُلُقِ»} **حديث حَسَنٌ**(٣)

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئێوە بە ماڵ‌و سامانتان فریای هەموو خەڵك ناکەون، بەڵام لە ڕوو خۆشیتان بە ڕەوشتی جوان فریایان بکەون، (واتە: بە ڕووی گەش‌و ڕەوشتی جوان دەتوانن لەگەڵ هەمواندا مامەڵە بکەن، ئەخلاقی جوان‌و ڕوو خۆشیی فراوانەو بەشی هەموو کەس دەکات، بەڵام ماڵ وسامان بەشی هەموو کەس ناکات‌و سنووردارە، دەتوانی لەگەڵ هەموو کەس دا ڕووت خۆشبێ‌و قسەت خۆشبێ‌و ڕێزی هەموو کەس بگری، بەس ناتوانی هەر کەسێك داوای هاوکاریی ماددیی کرد بۆی جێبەجێ بکەی).

---

١) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ: (١٣٥١)، ومُسْلِمٌ: (٢٣٩٦))

٢) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٦٨٥٧))

٣) (رَوَاهُ الحَاكِمُ: (٤٢٧) وَصَحَّحَهُ، وَحَسَّنَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (صحيح الرغيب والترهيب): (٢٦٦١))

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَكْثَرُ مَا يُدْخِلُ اَلْجَنَّةَ تَقْوى اَللهِ وَحُسْنُ اَلْخُلُقِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**(1)

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زۆربەی خەڵکی کە دەخرێنە بەهەشت بە هۆی ڕەوشت جوانیانەوەیە.**

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَلاَمٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «يَا أَيُّهَا اَلنَّاسُ! أَفْشُوا اَلسَّلَامَ، وَصِلُوا اَلأَرْحَامَ، وَأَطْعِمُوا اَلطَّعَامَ، وَصَلُّوا بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ، تَدْخُلُوا اَلْجَنَّةَ بِسَلَامٍ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(2)

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی سەلام خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی خەڵکینە!! سەلام بڵاو بکەنەوەو، صیلەی خزمایەتی جێبەجێ بکەن‌و، نان بدەن بە خەڵك، وە نوێژ بکەن بە شەو لە کاتێك خەڵك نوستوون، دەچنە بەهەشتێ بە سەلامەتی‌و خۆشی.**

{عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «كُلُّ مَعْرُوفٍ صَدَقَةٌ، وَإِنَّ مِنَ الْمَعْرُوفِ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلِقٍ، وَأَنْ تُفْرِغَ مِنْ دَلْوِكَ فِي إِنَاءِ أَخِيكَ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(3)

**واتە: جابیر خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو چاکەیەك خێرێکە، وە لە چاکەکاریە ئەگەر تۆ بگەیە برای خۆت بە ڕوویەکی گەش‌و خۆشەوە (واتە: چاکەت بۆ دەنووسرێ)، یاخود جامێکی ئاوی پێ بدەی لە دۆلکەو جامی خۆت.**

---

١) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ في (الأدب المفرد): (٢٨٩)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الأدب المفرد): (٢٢٢))

٢) (رَوَاهُ الحَاكِمُ: (٤٢٨٣)، وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شَرْطِ الشَيْخَين، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٥٦٩))

٣) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ: (٥٦٧٥)، وَمُسْلِمٌ: (٢٣٧٥)، وَالتِّرمِذِيُّ: (١٩٧٠) وَاللَّفْظُ لَهُ، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٢٦٨٤))

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ العَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بِالكَلِمَةِ مِنْ رِضْوَانِ اللهِ تَعَالَى مَا يُلْقِي لَهَا بَالاً يَرْفَعُهُ اللهُ بِهَا دَرَجاتٍ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**(١)

واته: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان جاری وایه بەندەیەك قسەیەك دەكات‌و وشەیەك دەڵێ له ڕەزامەندیی خوای بەرز، بەبێ ئەوەی هیچ گرنگی پێ بداو له ماناكەشی وردبێتەوە، خوای گەورەش چەندان پلەی بەرز دەكاتەوە بە هۆی ئەم وشەی كە دەیڵێ.

{عَنْ شُرَيْحٍ، عَنْ جَدِّهِ هَانِئِ بْنِ يَزِيدَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَخْبِرْنِي بِشَيْءٍ يُوجِبُ لِي الْجَنَّةَ؟ قَالَ: «عَلَيْكَ بِحُسْنِ الْكَلَامِ، وَبَذْلِ الطَّعَامِ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**(٢)

واته: شورەیح له باپیری دەگێڕێتەوە خوا لێی ڕازی بێ، كه گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵم بدەرێ بە شتێك كه بیكەم‌و بەهەشتم بۆ واجب بێ؟ ئەویش فەرموویەتی: قسەت خۆش‌و ڕێك‌و پێك بێ، نانده‌ریش بە.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «الْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ، وَمَشْيُكَ إِلَى الْمَسْجِدِ صَدَقَةٌ»} **حَدِيثٌ صَحِيح**(٣)

واته: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: قسەی خۆش خێرەو بە صەدەقە دەنووسرێ، وە ڕۆیشتن‌و هەنگاونان بەرەو مزگەوت خێرەو بە صەدەقە دەنووسرێ.

---

١) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٦١١٣))
٢) (رَوَاهُ إِبْنُ أَبِي شَيبه: (٦١١٣)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٢٦٩٠))
٣) (رَوَاهُ أَحْمَد: (٨٠٩٦)، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْن)

# پـایەو پـاداشتی

## چاکە کردن لەگەڵ دایك‌و باب

خوای پەروەردگار لە چەندان ئایەتی قورئانی پیرۆزدا فەرمانی بە چاکەکردن لەگەڵ دایك‌و بابی کردوە، تەنانەت ڕەزامەندی خۆی بەستۆتەوە بە ڕەزامەندی دایك‌و بابەوە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {رِضَى الرَّبِّ فِي رِضَى الْوَالِدِ، وَسَخَطُ الرَّبِّ فِي سَخَطِ الْوَالِدِ} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: ڕەزامەندی پەروەردگار لە ڕەزامەندی (دایك‌و) باب دایە، وە تووڕەیی پەروەردگار لە تووڕەیی (دایك‌و) باب دایە.

واتە: ئەگەر دایك‌و بابت لێت ڕازی بن ئەوە خواش لێت ڕازی دەبێ، بەڵام بۆ بەرچاو ڕوونی زیاتر لەم فەرموودە، با گوێ لەو قسانەی لوقمانی حەکیم بگرین‌و بزانین چۆن ئامۆژگاری ڕۆڵە شیرینەکەی دەکات، وە سنووری گوێڕایەڵی کردنی دایك‌و بابانی بۆ ڕوون دەکاتەوە،

## پەندی لوقمان( ٢ )

جا لوقمان ڕۆژێك کوڕی پەند ئەدا فەرمووی ڕۆڵەکەم هاوبەش بۆ خودا
دامەنێ هاوبەش بۆ خودا دانان ستەمێکی زۆر گەورەیەو گران
ڕۆڵەکەم خوداش وەسیەت ئەکاتن بۆ دایك و بابمان هانمان ئەداتن
خزمەتیان بکەین فەرمان ڕەوابین بۆ هەموو فەرمان وێنەی گەدابین
مافی دایك و باب مافی خودایە بۆ داییك لە باب زۆرتر داندرایە
چونکە لە زگی زۆر هەڵگرتوە دوو ساڵ لە مەمکی تێری کردوە

---

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (١٨٩٩)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (السلسلة الصحيحة برقم: (٥١٦))

٢) جواترین داستان چیرۆکی قورئان، نووسینی: شیخ محمد شێخ تاها بالیسانی، چاپی یەکەم، چاپخانەی نارین.

بۆت مـاندوو بووە بۆ بـەخێو کـردن — لە باوکت هەم بۆ بەزەیی کردن
لەگەڵ ئەو حاڵەش گەر فەرمان بدەن — هـاوبەش بۆ خـودا دانێن وا مـەکەن
هەم بۆ گوناهو دەرچوون لـە ئایین — بەقسەیان مەکەن بەڵام لەڕووی ژین
لە دونیا چاکەو لێیان کـەم مـەکـەن — هەتا ئەتوانن خزمەتیان بکەن

ئنجا با سەرنجی چەند ئایەتێك بدەین، دەربارەی چاکە کردن لەگەڵ دایك و باب، بۆ نموونە: لە سوورەتی (الإسراء)دا خوا دەفەموێ:

﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا ﴿٢٤﴾﴾

واتە: وە پەروەردگارت بڕیاری داوە کە شتێك نەپەرستن جگە لەو، وە لەگەڵ دایك و بابتان چاکە بکەن، ئەگەر یەکێکیان (واتە: بابت یان دایکت) یان هەردووکیان لای تۆ پیربوون قسەی ناخۆشیان پێ مەڵێ تەنانەت (ئۆف)یش! وە تێیان مەخوڕەو پێیان هەڵمەشاخێ، (بەڵکو) قسەی نەرم و بەڕێزیان لەگەڵ بەکاربهێنە . وە باڵی خۆ بەکەم زانینیان بۆ ڕابخە لەبەر بەزەیی و میهرەبانیت پێیان، بڵێ: ئەی پەروەردگارم ڕەحمییان پێبکە وەك چۆن ئەوان منیان پەروەردە کرد بە بچووکی و منداڵی.

وە لە سوورەتی (الأحقاف)یش دا دەفەرموێ: ﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَـٰنًا ۖ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ۖ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَـٰلُهُۥ ثَلَـٰثُونَ شَهْرًا ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَـٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِى فِى ذُرِّيَّتِىٓ ۖ إِنِّى تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنْهُمْ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟ وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّـَٔاتِهِمْ فِىٓ أَصْحَـٰبِ ٱلْجَنَّةِ ۖ وَعْدَ ٱلصِّدْقِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿١٦﴾﴾

واتە: وە ئێمە ئامۆژگاریی ئینسانمان کرد بە چاکە کردن لەگەڵ دایكو بابی دا، کە دایکی بە ناڕەحەتییو زەحمەتەوە هەڵیگرتووە، وە بە ئازارو ناڕەحەتیشەوە بوویەتی ماوەی دووگیان بوون (ی دایك) پێیەوەو لە شیر بڕینەوەی سی مانگە تا دەگاتە تافی لاوی (و پێگەیشت)و دەگاتە چل ساڵی دەڵێ: ئەی پەروەردگارم ڕام بێنە تا سوپاسگوزاریی ئەو بەهرەو چاکە بکەم کە ڕشتوتە بەسەر منو دایكو باوکم دا، وە (ڕام بێنە) کردەوەی چاك بکەم کە تۆ پێی ڕازیبی، نەوەکانیشم چاكو صاڵح بکە بێگومان بۆ لای تۆ گەڕاومەوەو تۆبەم کردوەو بەڕاستی من لە مسوڵمانانی گەردنکەچم . (خوا دەفەرموێ:) ئەوانە کەسانێکن کە ئێمە کردەوە چاکەکانیان لێ وەردەگرین، وە چاوپۆشیی دەکەین لە خراپەکانیان لە ڕیز بەهەشتیاندان، ئەمە ئەو بەڵێنە ڕاستەیە کە بەڵێنیان پێدرابوو لە دنیادا.

هەروەها لە سووڕەتی (النساء)دا فەرموویەتی: ﴿وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَبِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَالْجَارِ ذِي الْقُرْبَى وَالْجَارِ الْجُنُبِ وَالصَّاحِبِ بِالْجَنْبِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ مَنْ كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا ﴿٣٦﴾﴾



واتە: وە خوا بپەرستنو هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیار مەدەن، وە لەگەڵ دایكو باب چاك بن، وە لەگەڵ خزمو کەسو هەتیووانو نەدارانو هاوسێی خزمو هاوسێی بێگانە یان دوورو هاوڕێی هەمیشەیی یان هاوڕێی سەفەرو ڕێبوارو ئەوانەی بوون بە موڵکتان (چاکبن لەگەڵیان دا)، وە بێگومان خوا کەسانی خۆ بە زلزانو شانازی کەری خۆشناوێن!

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَيُّ الأَعْمَالِ أَحَبُّ إِلَى اللهِ؟ قَالَ: «الصَّلاَةُ عَلَى وَقْتِهَا»، قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «ثُمَّ بِرُّ الْوَالِدَيْنِ»، قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «ثُمَّ الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللهِ»} **حديثٌ صَحيحٌ**[1]

---

١) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ: (٥٦٢٥)، وَمُسْلِمٌ: (٢٦٤) وَاللَّفْظُ لَهُ)

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد: چ کردەوەیەك لە هەموو کردەوەکان خۆشەویستترە لە لای خوا ؟ فەرمووی: نوێژ لە کاتی خۆیدا، گوتم: دوای ئەو؟ فەرمووی: چاکە لەگەڵ دایك و باب، گوتم: دوای ئەو؟ فەرمووی: تێکۆشان لە پێناوی خوادا.

سُبْحَانَ اللهِ!! ڕیزبەندیی یەکی چەند ڕێك و پێك و، چەند سەرنج ڕاکێشە!! ئەنجامدانی نوێژ لەکاتی خۆیدا، هەقی خوایە کە ئینسان دەبێ پێوەی پابەندبێ، وە چاکە کردن لەگەڵ دایك و بابیش، هەقی نزیکترین کەسە کە دایك و بابن، تێکۆشان لە پێناوی خوادا، هەقی ئوممەتە، ئەم سێ کردەوەیە لە هەموو کردەوەکان چاکترن و باشترن، وە پاداشتیشیان لە هەموو کردەوەکان زیاترە، جا با چەند فەرمایشتێك لەوبارەوە بخوێنینەوە:

{عَنْ طَلْحَةَ بْنِ مُعَاوِيَةَ السُّلَمِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: جِئْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنِّي أُرِيدُ الْجِهَادَ مَعَكَ فِي سَبِيلِ اللهِ، أَبْتَغِي بِذَلِكَ وَجْهَ اللهِ، قَالَ: «حَيَّةٌ أُمُّكَ»؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: «الْزَمْهَا»، قُلْتُ: مَا أَرَى فَهِمَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنِّي، فَأَعَدْتُ عَلَيْهِ مِرَارًا، فَقَالَ: «الْزَمْ رِجْلَيْهَا فَثَمَّ الْجَنَّةُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: طەڵحەی کوڕی موعاویەی ئەسلەمی خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: چووم بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ! من دەمەوێ لەگەڵ تۆدا بێمە جیهاد، بۆ ئەوەی ڕەزامەندی خوا بەدەست بێنم، فەرمووی: ئایا دایکت زیندووە؟ گوتم: بەڵێ، فەرمووی: بڕۆ خزمەتی بکەو دەستی پێوە بگرە، گوتم: پێغەمبەری خوا ﷺ،

---

١) (رَوَاهُ ابنُ مَاجَهْ: (١٨٩٩)، وَصَحَّحَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٢٤٨٤))

تێمنەگەیشت، بۆیە چەند جارێك دووبارەم کردەوە، فەرمووی: بڕۆ دەست بە پێیەکانیەوە بگرەو پاشان بەهەشتت بۆ هەیە.

{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «دَخَلْتُ الْجَنَّةَ فَسَمِعْتُ قِرَاءَةً، فَقُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ فَقِيلَ: حَارِثَةُ بْنُ النُّعْمَانِ كَذَلِكُمُ الْبِرُّ، كَذَلِكُمُ الْبِرُّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ» وَكَانَ أَبَرَّ النَّاسِ بِأُمِّهِ»} **حديثٌ صحيحٌ**[1]

واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کاتێك چوومە بەهەشت گوێم لە خوێندنەوەیەك بوو، گوتم: ئەوە کێیە؟ گوترا: حاریسی کوڕی نوعمانە، وە ئەوەتان باشترینتانە، ئەوەتان باشترینتانە خوا لێی ڕازی بێ، جا (دەڵێ:) ئەو هاوەڵە بەڕێزە باشترینی خەڵکی بووە لەگەڵ دایکی.

{عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ، قَالَ: كَانَ رَجُلٌ مِنَّا بَرًّا بِوَالِدَيْهِ فَأَمَرَاهُ أَوْ أَمَرَهُ أَحَدُهُمَا أَنْ يَتَزَوَّجَ، فَتَزَوَّجَ، فَوَقَعَ بَيْنَ أُمِّهِ وَبَيْنَ امْرَأَتِهِ شَرٌّ، وَوَافَقَهُ أَهْلُهُ، فَقَالَتْ لَهُ أُمُّهُ: طَلِّقْهَا، قَالَ: فَاشْتَدَّ عَلَيْهِ أَنْ يُطَلِّقَ امْرَأَتَهُ، وَاشْتَدَّ عَلَيْهِ أَنْ يَعُقَّ أُمَّهُ، قَالَ: فَرَحَلَ إِلَى أَبِي الدَّرْدَاءِ، فَقَصَّ عَلَيْهِ قِصَّتَهُ، فَقَالَ: مَا كُنْتُ آمُرُكَ أَنْ تُطَلِّقَ امْرَأَتَكَ، وَلا أَنْ تَعُقَّ أُمَّكَ، وَلَكِنْ إِنْ شِئْتَ حَدَّثْتُكَ حَدِيثاً سَمِعْتُهُ مِنَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «الْوَالِدُ أَوْسَطُ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ، فَحَافِظْ إِنْ شِئْتَ أَوْ ضَيِّعْ»} **حديثٌ صحيحٌ**[2]

واتە: ئەبوو عەبدەڕڕەحمان دەڵێ: پیاوێك لە ئێمە لەگەڵ دایك وبابی زۆر چاکەکار بوو، فەرمانیان پێکرد یاخود یەکێکیان فەرمانی پێکرد کە ژن بهێنێ، ژنی هێنا، کێشەیەك لە نێوان دایکی‌و ژنەکەی ڕوویدا، کە ئەهلەکەی پێی ڕازیبوون، دایکی گوتی: ئەم ژنە تەڵاق بدە، دەڵێ: ئەویش

١) (رَوَاهُ ابْنُ حِبَّانَ: (٧٠١٤)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٩١٣)، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْطِ الشَيْخَيْن)

٢) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (١٩٠٠)، وَقَالَ: حَدِيثٌ صَحِيحٌ، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٩١٤))

زۆر لەسەری توند بوو کە خێزانەکەی تەڵاق بدات، وە پێشی ناخۆش بوو سەرپێچیی فەرمانی دایکی بکات، چوو بۆ لای ئەبوو دەرداء چیرۆکەکەی خۆی بۆ گێڕایەوە، (ئەبو دەرداء گوتی:) من ناڵێم ژنەکەت تەڵاق بدەو، وە ناشڵێم سەرپێچیی دایکت بکە، بەڵکو فەرموودەیەکت بۆ دەگێڕمەوە کە لە پێغەمبەرم ﷺ بیستوە، (فەرموویەتی: باب دەرگای نێوەڕاستی بەهەشتە، ئەگەر دەتەوێ بیپارێزەو دەستی پێوە بگرە، یان لە دەست خۆتی بدەو زایەی بکە! واتە: ئەگەر باب دەرگای نێوەڕاستی بەهەشت بێ، دەبێ دایک چ بێ؟!!

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «رِضَى الرَّبِّ فِي رِضَى الْوَالِدِ، وَسَخَطُ الرَّبِّ فِي سَخَطِ الْوَالِدِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[(1)]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ خوا لێی ڕازی بێ، لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ڕەزامەندیی خوا پەیوەستە بەڕەزامەندیی (دایک‌و) باب، وە تووڕەیی خوا پەیوەستە بە تووڕەیی (دایک‌و) باب.

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُمَدَّ لَهُ فِي عُمْرِهِ وَيُزَادَ لَهُ فِي رِزْقِهِ فَلْيَبَرَّ وَالِدَيْهِ وَلْيَصِلْ رَحِمَهُ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[(2)]

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیک خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك حەز دەکات تەمەنی درێژ بکرێتەوەو ڕزق‌و ڕۆزی بۆ فراوان بێ، ئەوە با چاکەکاربێ لەگەڵ دایك‌و بابی، وە پەیوەندی خزمایەتیش بەجێبهێنێ.

---

١) (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ فِي (الأدب المفرد): (٢) قَالَ الشيخ الألباني: حَسَنٌ مَوْقُوفاً وَصَحَّ مَرْفُوعاً، وَالتِّرمِذِيُّ: (١٨٩٩)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح سُنَنِ التِّرمِذِي))

٢) (رَوَاهُ أَحْمَد: (١٣٨٣٨)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني، تعليق شعيب الأرنؤوط: حَدِيثٌ صَحِيحٌ، وَهَذَا إِسْنَادُ حَسَن)

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، يَقُولُ: «اِنطَلَقَ ثَلاثَةُ نَفَرٍ مِمَّنْ كَانَ قَبْلَكُمْ حَتَّى آوَاهُمُ المَبيتُ إِلى غَارٍ فَدَخلُوهُ، فانْحَدرَتْ صَخْرَةٌ مِنَ الجَبَلِ فَسَدَّتْ عَلَيْهِمُ الغَارَ، فَقَالُوا: إِنَّهُ لاَ يُنْجيكُمْ مِنْ هذِهِ الصَّخْرَةِ إلاَّ أنْ تَدْعُوا اللهَ بصَالحِ أعْمَالِكُمْ، قَالَ رَجُلٌ مِنْهُمْ: اللَّهُمَّ كَانَ لِي أَبَوانِ شَيْخَانِ كَبيرَانِ، وكُنْتُ لاَ أَغْبِقُ قَبْلَهُمَا أهْلاً وَلاَ مَالاً، فَنَأَى بِي طَلَب الشَّجَرِ يَوْماً، فَلَمْ أرِحْ عَلَيْهِمَا حَتَّى نَامَا، فَحَلَبْتُ لَهُمَا غَبُوقَهُمَا فَوَجَدْتُهُما نَائِمَينِ، فَكَرِهْتُ أنْ أوقِظَهُمَا وَأَنْ أغْبِقَ قَبْلَهُمَا أهْلاً أو مالاً، فَلَبثْتُ (والْقَدَحُ عَلَى يَدِي) أنْتَظِرُ اسْتِيقَاظَهُما حَتَّى بَرِقَ الفَجْرُ، والصِّبْيَةُ يَتَضَاغَوْنَ عِنْدَ قَدَمَيَّ، فاسْتَيْقَظَا فَشَرِبا غَبُوقَهُما. اللَّهُمَّ إنْ كُنْتُ فَعَلْتُ ذلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ فَفَرِّجْ عَنَّا مَا نَحْنُ فِيهِ مِنْ هذِهِ الصَّخْرَةِ، فانْفَرَجَتْ شَيْئاً لا يَسْتَطيعُونَ الخُروجَ مِنْهُ...»} **حَديثٌ صَحيحٌ**[1]

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: سێ کەس لەوانەی کە لە پێش ئێوە بوون بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشتن، پەنایان بۆ ئەشکەوتێك برد لە کێوێك، بەردێك لەسەر کێوەکە بەربۆوەو دەرگای ئەشکەوتەکەی داخست، (هەرسێکیان لە نێوان خۆیاندا) گوتیان: لەو بەردە ڕزگارتان نابێ مەگەر بە پاڕانەوە بە هۆی کردەوەیەکی چاکتان کە بۆ خوا ئەنجامتان داوە، پیاوێك لە نێویان گوتی: ئەی خوایە! من باب و دایکێکی پیرو بە تەمەنم هەبوو، (لەگەڵ چەند منداڵێکی ورد، شوانیم بۆیان دەکرد، کە شیرم دەدۆشی) لە پێشێ بەشی دایکمو بابم دەدا ئنجا دەمدا بە منداڵەکانم، ڕۆژێك بەدوای لەوەڕی باشدا بووم دوورکەوتمەوەو درەنگ هاتەوە شەو بوو، تەماشام کرد هەردووکیان نووستوون، منیش شیرم دۆشیو بۆم بردن بەڵام پێمخۆش نەبوو هەڵیانبستێنم، وە لەبەر وانیش حەزم نەکرد شیر بدەم بە منداڵەکان، کە منداڵەکانیشم لەبەر پێم هەر دەلالانەوە لە برسان، وە جامە شیرەکەشم لەسەر دەستی بوو چاوەڕێم کرد تا ڕۆژهەڵاتو شیرەکەیان خوارد، جا ئەی خوایە! من ئەوەم بۆ ڕەزامەندی تۆ کردوە ڕزگارمان بکە لەو بەردەی کە دەرگاکەی داخستووە، خوا دەروویەکی لێکردنەوە بەڵام نەیانتوانی دەربچن...، دوو کەسەکەی دیکەش یەکێ چاکەیەکیان کردبوو، باسیان کردو خواش بە هۆی ئەو سێ کارە باشەیانەوە دەرگاکەی لێکردنەوە بە تەواویو دەربازیان بوو لە نێو ئەم ئەشکەوتە.

---

١) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ: ( ٢١٥٢)، وَمُسْلِمٌ: (٧١٢٧))

{عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ أَبَرَّ الْبِرِّ صِلَةُ الْمَرءِ أَهْلَ وِدِّ أَبِيهِ بَعْدَ أَنْ يُوَلِّي»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[١]

**واتە: عەبدوللای کوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان چاکترین کردەوەی چاکە ئەوەیە ماڵو منداڵی دۆستو برادەری باوك بەسەر بکرێنەوە.**

{عَنْ أَبِي بُرْدَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَدِمْتُ الْمَدِيْنَةَ فَأَتَانِي عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ فَقَالَ: أَتَدْرِي لِمَ أَتَيْتُكَ؟ قَالَ: قُلْتُ: لاَ، قَالَ سَمِعْتُ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَنْ أَحَبَّ أَنْ يَصِلَ أَبَاهُ فِي قَبْرِهِ فَلْيَصِلِ إِخْوَانَ أَبِيهِ بَعْدَهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[٢]

**واتە: ئەبو بوردە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: چوومە مەدینە عەبدوللای کوڕی عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) هاتە لامو گوتی: ئایا دەزانی بۆچی هاتمە لات؟ دەڵێ: منیش گوتم: نەخێر نازانم، گوتی: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستوە، دەیفەرموو: هەر کەسێك حەز دەکات پەیوەندی لەگەڵ بابی هەبێ لە نێو گۆڕەکەی، با پەیوەندیو صیلەی ڕەحم لەگەڵ برادەرەکانی بەجێ بگەیەنێ دوای مردنی.**

{عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنِّي أَذْنَبْتُ ذَنْباً عَظِيماً، فَهَلْ لِي مِنْ تَوْبَةٌ؟ قَالَ: «هَلْ لَكَ مِنْ أُمٍّ»؟ قَالَ: لا، قَالَ: «هَلْ لَكَ مِنْ خَالَةٍ»؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: «فَبِرَّهَا»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[٣]

**واتە: عەبدوللای کوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! گوناهێکی زۆر گەورەم ئەنجامدایە، ئایا بۆم هەیە تۆبە بکەمو بگەڕێمەوە؟ فەرمووی: ئایا دایکت ماوە؟ گوتی: نەخێر، فەرمووی: ئایا پلکت (واتە: خوشکی دایکت) ماوە؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: ئێ دەبڕۆ**

---

١) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (٥١٤٥)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح سُنَن التِّرمِذِي): (١٩٨٣))

٢) (رَوَاهُ ابْنُ حِبَّانَ: (٤٣٢)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٤٣٢)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْطِ البُخَارِيّ)

٣) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (١٩٠٤)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٢٥٠٤))

چاکەی لەگەڵ بکە (واتە: پاداشتی چاکە لەگەڵ کردنەکە دەبێتە هۆی سڕینەوەی ئەو گوناهەی کردوتە).

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ لَيَرْفَعُ الدَّرَجَةَ لِلْعَبْدِ الصَّالِحِ فِي الْجَنَّةِ، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ! أَنَّى لِي هَذِهِ؟ فَيَقُولُ: بِاسْتِغْفَارِ وَلَدِكَ لَكَ»} **حديثٌ حَسَنٌ**[1]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی خوای زاڵی پایەدار پلەی بەندەی صالح بەرز دەکاتەوە لە بەهەشت، (ئەویش) دەڵێ: ئەی پەروەردگارم! ئەوە لە کوێوە بۆ من هاتوە، پێی دەگوترێ: بە هۆی داوای لێخۆشبوون کردنی منداڵەکەتە کە دووعای بۆ کردووی.

## چوار بەسەرهات لەم بارەیەوە

- موحەممەدی کوڕی مونکەدیر ڕەحمەتی خوای لێ بێ، کە دەچووە بەرانبەر دایکی ڕوومەتی خۆی دەخستە سەر زەوی‌و دەیگوت دایە گیان! پێی خۆت بخەرە سەر ڕوومەتم! کە دیارە لەوکارەی دا مەبەستی بە دەستهێنانی ڕەزامەندی دایکی بووە، کە ئەوەش خۆی لە ڕەزامەندیی خوا دەبینێتەوە.

- هەروەها موحەممەدی کوڕی سیرین کاتێك دەچووە لای دایکی دەنگی زۆر زۆر نزم دەکردەوەو زۆر بە نەرم‌و نیانیشەوە قسەی لەگەڵ دەکرد! واتە: بەوپەڕی خۆ بەکەمگری‌و هاوسۆزیی‌و دڵسۆزیی هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرد.

- عەبدوڕڕەحمانی حوبولی (کە یەکێکە لە تابیعین) دەڵێ: لەلای عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێیان ڕازی بێ دانیشتبووم، پیاوێکی خەڵکی یەمەن دایکی لەسەر هەردوو شانی خۆی دانابوو تەوافی کەعبەی پێدەکرد، هەتا تەوافەکەی پێ تەواو کرد، ئنجا لەسەر زەوی دانا، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر بانگی کرد، گوتی: ئەو ئافرەتە کێ

---

١) (رَوَاهُ أَحْمَدُ: (١٠٦١٨)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٥٩٨))

بوو تەوافی کەعبەت پێکرد؟ گوتی: ئەوە دایکم بوو، عەبدوڵڵاش گوتی: خۆزگەم دەخواست بگەیشتبامە دایکمو ئاوا تەوافێکم پێکردبووایە هەروەك تۆ تەوافت بە دایکت کرد.

- ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ ئیمانی هێنابوو، ببوە مسوڵمان، بەڵام دایکی بە کافری مایەوەو ئیمانی بە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهێنا، ئەبوو هورەیرە زۆر دووعای بۆ دەکرد تا خوا دڵی ڕووناك بکاتەوەو بە نووری ئیسلامو هیدایەت بدرێ، بەڵام چونکە کاتی ئەوە نەهاتبوو ئیمان بێنێ، هەر بە کافری مایەوە، بۆیە ئەبوو هورەیرە بە ناچاری ڕۆژێك گوتیە دایکی داوات لێدەکەم ئیمان بێنی بە پێغەمبەری خواو ﷺ بە ڕاستی بزانی، داکیشی زۆر لێی توورە بوو، لە ئاکام قسەی ناشیرینی بە پێغەمبەری خوا ﷺ گوتن، ئیدی ئەبوو هورەیرە دڵی زۆر تووند بوو، هاڵسا چووە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، زۆر بە کوڵ گریاو بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوات لێدەکەم دووعا بۆ دایکم بکەی تا خوا هیدایەتی بدات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (اللَّهُمَّ اهْدِ أُمَّ أَبِي هُرَيْرَةَ)، واتە: خوایە هیدایەتی دایکی ئەبوو هورەیرە بدە، ئەبوو هورەیرە زۆر دڵخۆش بوو بە دووعاکەی پێغەمبەر ﷺ لەبەر ئەوەی پێی وابوو دووعاکەی قبووڵ دەبێ، زۆر بە پەلە گەڕایەوە بۆ ماڵ، بینی دەرگاکە داخراوەو دایکیشی خەریکە خۆی دەشوات، دایکی داوای کرد چاوەڕێ بێ، پاشان کە جلەکانی لەبەر کرد هاتە لایو دەرگای لێکردەوەو گوتی: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُه) ئەبوو هورەیرە زۆر دڵخۆش بوو، دیسان چۆوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دووعا بکە منو دایکم لە لای ئیمانداران خۆشەویست بینو ئەوانیش لە لای ئێمە خۆشەویست بن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (اللَّهُمَّ حَبِّبْ عُبَيْدَكَ وَأُمَّهُ إِلَى عِبَادِكَ الْمُؤْمِنِينَ، وَحَبِّبْهُمْ إِلَيْهِ)، واتە: خوایە ئەو بەندەو دایکی خۆشەویست بکە لە لای بەندە ئیماندارەکانت، وە ئیماندارانیش خۆشەویست بکەی لە لای ئەوان[1].

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٦٥٥١))

# پایەو پاداشتی
# چاکەکردن لەگەڵ خەڵك

یارمەتی دانی خەڵك جا بە دەستو زمان بێ، یان بە ماڵو سامان، یان بەهەر شێوەیەکی دیکە کاریگەریەکی یەکجار بەرهەم دار دەبینێ لە بەدەستهێنانی پایەو پاداشت، لەو بارەیەوە دەقی قورئانو سوننەت زۆرن، بۆ وێنە، خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرْكَعُواْ وَٱسْجُدُواْ وَٱعْبُدُواْ رَبَّكُمْ وَٱفْعَلُواْ ٱلْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ۝٧٧﴾ الحج

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ڕکووع بەرنو سەجدە بەرنو پەروەردگارتان بپەرستنو، چاکە بکەن بۆ ئەوەی سەر فراز بن. وە لە سووڕەتی (المائدة) فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ۝٢﴾، واتە: هاوکاری یەکدی بکەن لەسەر چاکەکاریی و پارێزکاریی.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {مَنْ كَانَ فِي حَاجَةِ أَخِيهِ كَانَ اللهُ فِي حَاجَتِهِ} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: هەر کەسێك ئیشی برایەکی پێك بهێنێ خواش کاری دەسازێنێ.

وە فەرموویەتی: {وَاللهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

واتە: بەردەوام خوا لە یارمەتیدانی بەندەی خۆی دایە هەتا بەندە لە یارمەتیدانی برای خۆی دابێ.

---

١) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٢٣١٠)، وَمُسْلِمٌ: (٦٧٤٣) عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)
٢) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٧٠٢٨)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «الْمَعْرُوفُ إِلَى النَّاسِ يَقِي صَاحِبَهَا مَصَارِعَ السُّوءِ وَالآفَاتِ وَالْهَلَكَاتِ، وَأَهْلُ الْمَعْرُوفِ فِي الدُّنْيَا هُمْ أَهْلُ الْمَعْرُوفِ فِي الآخِرَةِ»} **حديثٌ صحيحٌ**[1]

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: چاکە کردن لەگەڵ خەڵکی خاوەنەکەی دەپارێزێ لە مردن لە شوێن و کاتی خراپ، وە لە ئافات و لە لەناو چوون، وە ئەهلی چاکە لە دنیاو لە دواڕۆژیش هەر ئەهلی چاکەن.

{عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «الْمُؤْمِنُ يَأْلَفُ وَيُؤْلَفُ، وَلا خَيْرَ فِيمَنْ لا يَأْلَفُ وَلا يُؤْلَفُ، خَيْرُ النَّاسِ أَنْفَعُهُمْ لِلنَّاسِ»} **حديثٌ صحيحٌ**[2]

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا خوا لە خۆی بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئیماندار (ی تەواو) خەڵکی هۆگری خۆی دەکات و بۆ خۆشی هۆگری خەڵکی (باش) دەبێ، وە خێر لەو کەسەدا نیە کە نەتوانێ خەڵکی هۆگری خۆی بکات، نە بۆخۆشی هۆگری خەڵکی (باش) بێ، وە باشترینی خەڵکی سوود بەخشترینیانە بۆ خەڵکی.

{عَنْ أَبِي سَعِيْدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «صَدَقَةُ السِّرِّ تُطْفِيءُ غَضَبَ الرَّبِّ، وَصِلَةُ الرَّحِمِ تَزِيْدُ فِي الْعُمرِ، وَفِعلُ الْمَعْرُوف يَقِي مَصَارِعَ السُّوءِ»} **حديثٌ صحيحٌ**[3]

واتە: ئەبوو سەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خێرکردن بە نهێنی تووڕەیی خوا دەکوژێنێتەوە، وە بەجێهێنانی پەیوەندیی خزمایەتی و سەردانی کردنیان تەمەن زیاد دەکات، وە کردەوەی چاك دەپارێزێ لە مردن لە حاڵەتی خراپ.

---

١) (رَوَاهُ الحَاكِمُ: (٤٢٩)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٣٧٩٥))

٢) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ: (٥٧٨٧)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٤٢٦))

٣) (رَوَاهُ البَيْهَقِيُّ في (شعب الإيمان): (٣٤٤٢)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٣٧٦٠))

{عَنِ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنهُما، أَنَّ رَجُلا جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَيُّ النَّاسِ أَحَبُّ إِلَى اللهِ؟ وَأَيُّ الأَعْمَالِ أَحَبُّ إِلَى اللهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَحَبُّ النَّاسِ إِلَى اللَّهِ تَعَالَى أَنْفَعُهُمْ لِلنَّاسِ، وَأَحَبُّ الأَعْمَالِ إِلَى اللهِ تَعَالَى سُرُورٌ تُدْخِلُهُ عَلَى مُسْلِمٍ، أَوْ تَكَشِفُ عَنْهُ كُرْبَةً، أَوْ تَقْضِي عَنْهُ دَيْنًا، أَوْ تَطْرُدُ عَنْهُ جُوعًا، وَلأَنْ أَمْشِيَ مَعَ أَخٍ فِي حَاجَةٍ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَعْتَكِفَ فِي هَذَا الْمَسْجِدِ "يَعْنِي مَسْجِدَ الْمَدِينَةِ" شَهْرًا، وَمَنْ كَفَّ غَضَبَهُ سَتَرَ اللهُ عَوْرَتَهُ، وَمَنْ كَظَمَ غَيْظَهُ وَلَوْ شَاءَ أَنْ يُمْضِيَهُ أَمْضَاهُ مَلأَ اللهُ قَلْبَهُ رَجَاءً يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ مَشَى مَعَ أَخِيهِ فِي حَاجَةٍ حَتَّى يُثْبِتَهَا لَهُ أَثْبَتَ اللَّهُ قَدَمَهُ يَوْمَ تَزُولُ الأَقْدَامِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[1]

واتە: پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! خۆشەویستترینی خەڵك کامەیە لە لای خوا؟ وە خۆشەویستترینی کردەوەکان لە لای خوا کامەیە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خۆشەوسیترینی خەلکی لە لای خوای بەرز ئەوەیانە سوودی زۆری بۆ خەڵك هەبێ، وە خۆشەویسترینی کردەوەکان لە لای خوای بەرز ئەوەیە: خۆشییەك بیخەیە دڵی مسوڵمانێك، یاخود ناخۆشییەکی لەسەر لابدەی، یان قەرزی بۆ بدەیەوە، یان برسیەتی لێ دوور بخەیەوە، وە ئەگەر لەگەڵ برایەك بڕۆم بۆ ئەوەی پێداویستیەکی بۆ جێبەجێبکەم پێم خۆشترە لەوەی کە یەك مانگ لەو مزگەوتە دابنیشمو عیبادەت بکەم، (واتە: مزگەوتی مەدینە)، وە هەر کەسێك ڕقو تووڕەیی خۆی قوتداتەوەو ڕێگری بکات لەبەر خواو دەری نەبڕێ ئەوە خوا کەمو کورتیی دادەپۆشیو نهێنییەکانی دەپارێزێ، وە هەر کەسێك لەبەر خوا تووڕەیی خۆی بخواتەوە ڕێگری لێبکاتو دەری نەبڕێ، لەگەڵ ئەوەش ئەگەر بیەوێ دەریببڕێ بتوانێ دەریببڕێ، ئەوە خوا دڵی پڕ دەکات لە ئومێدو ترس لە ڕۆژی قیامەت، وە هەر کەسێك لەگەڵ براکەی بڕوات بۆ جێبەجێکردنی پێداویستیەکەی هەتاکو کارەکەی بۆ تەواو دەکات خوای پەروەردگار پێیەکانی دەچەسپێنێ لە ڕۆژێك کە پێیەکان تێیدا دەخلیسکێن.

---

١) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي (الكَبِير): (١٣٦٤٦) وَاللَّفْظُ لَهُ، وَحَسَّنَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٩٠٦))

{عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ قَالَ: لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيْكَ لَـهُ، لَـهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيْر، أَوْ مَنَحَ مَنِيحَةً، أَوْ هَدَى زُقَاقاً، كَانَ كَمَنْ أَعْتَقَ رَقَبَة»} **حَديثٌ صَحيحٌ**[1]

**واتە: بەڕائی کوڕی عازیب خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بڵێ: هیچ پەرستراوێك نیە بەهەق جگە لە خوا تەنیایەو هیچ هاوەڵی نیە، موڵك هەر بۆ ئەوەو سوپاسو ستایش هەر بۆ ئەوە، دەژیێنیو دەمرێنی، خێرو چاکە بەدەستی ئەوە، وە بەسەر هەموو شتێك بە توانایە، یان حوشترێك ببەخشێت (بۆ ئەوەی خەڵك سوودی لێ ببیننو لە شیرەکەی بخۆنەوە، بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، دوایی بۆی بگەڕێننەوە)، یان ڕێی ڕاست بە کەسێکی ونبوو، یان کوێرێك پێشان بدات (لە پاداشت) وەك ئەو کەسەیە کە کۆیلەیەکی ئازاد کردبێت.**

{عَنْ مَعْقِلٍ الْمُزَنِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ أَمَاطَ أَذَى عَنِ طَرِيقِ المسلمين كُتِبَ لَـهُ حَسَنَةٌ، وَمَنْ تقبلَتْ لَـهُ حَسَنَةٌ دَخَلَ الْجَنَّةَ»} **حَديثٌ حَسَنٌ**[2]

**واتە: مەعقیلی موزنی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك ئەزیەتو ئازارێك (دارێك، بەردێك) لەسەر ڕێگەی مسوڵمانان لابداو (ڕێیان بۆ خۆش بکات) چاکەیەکی بۆ دەنووسرێ، وە هەر کەسێکیش چاکەیەکی لێ قبووڵ بکرێ، ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە.**

---

١) (رَوَاهُ أَحْمَدُ: (١٨٥٥٤)، وَقَالَ: شعيب الأرنؤوط: حَدِثٌ صَحِيحٌ، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (١٥٣٥))

٢) (رَوَاهُ البُخَاري في (الأدب المفرد): (٥٩٣)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٢٣٠٦))

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سُئِلَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): أَيُّ الأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «أَنْ تُدْخِلَ عَلَى أَخِيْكَ الْمُؤْمِنِ سُرُوراً، أَوْ تَقْضِي لَهُ دَيْناً، أَوْ تُطْعِمَهُ خُبْزاً»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(١)

**واته: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازای بێ، دەڵێ: پرسیار کرا له پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا باشترین کردەوە کامەیە؟ فەرمووی: بچی بۆ لای برای ئیمانداریتو دڵی خۆش بکەی، یاخود قەرزێکی لەسەربێ بۆی بدەیتەوە، یاخود خواردنی پێبدەی.**

{عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «كُلُّ مَعْرُوفٍ صَنَعْتَهُ إِلَى غَنِيٍّ أَوْ فَقِيرٍ فَهُوَ صَدَقَةٌ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(٢)

**واته: جابیر خوا لێی ڕازای بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کارێکی باش که مسوڵمان دەیکات لەگەڵ کەسێك جا دەوڵەمەند بێ یاخود هەژار بۆی به خێرو چاکه دەنووسرێ.**

{عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «خَيْرُ النَّاسِ أَنْفَعُهُمْ لِلنَّاسِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(٣)

**واته: جابیر خوا لێی ڕازای بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترینی خەڵکی ئەوانەن که سوودیان زۆرە بۆ خەڵکی.**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا، نَفَّسَ اللهُ عَنهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الآخِرَةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ، يَسَّرَ اللهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِمًا سَتَرَهُ اللهُ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، وَاللهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ، وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْماً، سَهَّلَ اللهُ لَهُ بِهِ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ، وَمَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي

---

١) (رَوَاهُ الْبَيْهَقِيُّ فِي (شعب الإيمان): (٧٦٧٨)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٤٩٤))

٢) الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع للخطيب البغدادي، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٢٠٤٠))

٣) (مسند الشهاب: (١٢٣٤)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٣٢٨٩))

بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللهِ، يَتْلُونَ كِتَابَ اللهِ، وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ، إِلاَّ نَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَحَفَّتْهُمُ الْمَلاَئِكَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ، وَمَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ، لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك ناخۆشییەك لە ناخۆشییەکان لەسەر مسوڵمانێك سووك بکات، خوا ناخۆشییەك لە ناخۆشییەکانی ڕۆژی دوایی لەسەر سووك دەکات، هەر کەسێك باری شانی مسوڵمانێکی تەنگ دەست سووك بکات خوا باری شانی لە دنیاو دوا ڕۆژ سووك دەکات، وە هەر کەسێك کەم‌و کورتیی‌و عەیبی مسوڵمانێك دابپۆشێ خوا لە دنیاو دوا ڕۆژدا کەم‌و کورتیی‌و عەیبی ئەو دادەپۆشێ، بەردەوام خوا لە یارمەتیدانی بەندەی خۆی دایە هەتا ئەوان لە یارمەتیی دانی براکانیان بن، هەر کەسێك ڕێگایەکی گرت بۆ فێربوونی زانست خوا بەهۆیەوە ڕێی بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات، هیچ کۆمەڵێك نیە دابنیشن لە ماڵێك لە ماڵەکانی خوا قورئان بخوێنن‌و یەکدی فێربکەن، ئەوە حەتمەن خوا سەکینەتیان بەسەردا دەبارێنێ، وە فریشتە دەنێرێتە سەریان‌و بە ڕەحمەتی خۆی دایان دەپۆشێ‌و چوار دەوریان بە فریشتە دەگرێت‌و خوا باسیان دەکات لای ئەوانەی لای خۆین (واتە: فریشتەکان)، وە هەر کەسێك کردەوەکانی پاشی بخەن ڕەچەڵەکەکەی پێشی ناخات.**

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ نَصَرَ أَخَاهُ بِظَهْرِ الْغَيْبِ نَصَرَهُ اللهُ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[2]

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك لە کاتی پەنهان‌و لە پاشملە بەرگری لە برایەکی مسوڵمانی خۆی بکات‌و سەری بخات، ئەوە خوای باڵادەست لە دنیاو دواڕۆژ سەری دەخاو سەرکەوتووی دەکات.**

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٧٠٢٨))

٢) (رَوَاهُ البَيْهَقِيُّ في (الكبرى): (١٦٤٦٢) وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٢١٧))

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُزَحْزَحَ عَنِ النَّارِ، وَيُدْخَلَ الْجَنَّةَ فَلْتَأْتِهِ مَنِيَّتُهُ وَهُوَ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، وَلْيَأْتِ إِلَى النَّاسِ الَّذِي يُحِبُّ أَنْ يُؤْتَى إِلَيْهِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[(١)]

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك حەز دەکات لە ئاگر دووربخرێتەوەو بخرێتە بەهەشتەوە، با لە کاتێکدا دەمرێ شایەدیی بدات کە بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوی دیکەنین، وە موحەممەد ڕەوانەکراوی خوایە، وە با ئەوە لەگەڵ خەڵکی بکات کە پێی خۆشە خەڵك لەگەڵی بکەن، یانی: بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ خەڵك بکات، کە پێی خۆشە خەڵك مامەڵەی لەگەڵ بکەن.**

{عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنْ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ قَالَ: «مَنْ زَحْزَحَ عَنْ طَرِيقِ الْمُسْلِمِينَ شَيْئًا يُؤْذِيهِمْ، كَتَبَ اللهُ لَهُ بِهِ حَسَنَةً، وَمَنْ كُتِبَ لَهُ عِنْدَهُ حَسَنَةٌ أَدْخَلَهُ اللهُ بِهَا الْجَنَّةَ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[(٢)]

**واتە: ئەبوو دەرداء خوا لێی ڕازی بێ، لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێك شتێك لە ڕێگا لابدات کە مسوڵمان ئەزیەتی پێ ببینن، خوا چاکەیەکی بۆ دەنووسی، وە هەر کەسێکیش چاکەیەکی هەبێ لە (ڕۆژی دوایی) خوا بە هۆیەوە دەیخاتە بەهەشتێ.**

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: مُرَّ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) بِجَنَازَةٍ فَأَثْنَوا عَلَيْهَا خَيْرَاً، فَقَالَ: النَّبِيّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «وَجَبَتْ وَجَبَتْ وَجَبَتْ»، وَمُرَّ بِجَنَازَةٍ فَأَثْنَوا عَلَيْهَا شَرَّاً فَقَالَ: النَّبِيّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «وَجَبَتْ وَجَبَتْ وَجَبَتْ»، فَسَأَلَهُ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عنهُ قَالَ: «مَنْ أَثْنَيتُمْ عَلَيهِ خَيْرَاً وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةَ، وَمَن أَثْنَيتُمْ شَرّاً وَجَبَتْ لَهُ النَّار، أَنْتُمْ شُهَدَآءُ اللهِ في الأَرض»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[(٣)]

---

١) (رَوَاهُ أَحْمَد: (٦٨٠٧)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صَحِيح الجَامع): (٢٤٠٣))
٢) (رَوَاهُ البزَّار: (٢٧٤٧٩) وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٢٣٠٦))
٣) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٢٦٤٢)، وَمُسْلِم: (٢١٩٧)، وَالنَّسَائِيُّ: (١٩٣١)، وَاللَّفْظُ لِمُسْلم)

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: ڕۆژێك جەنازەیەکیان هێنا (دیارە لەو شوێنە پێغەمبەر ﷺ وەستاوە کە کۆمەڵێك لە هاوەڵانی لێ بوون)، خەڵك مەدحی ئەو خاوەن جەنازەیان کرد، گوتیان: ئینسانی باش بوو، پێغەمبەر ﷺ سێ جاران فەرمووی: پێویست بوو، پێویست بوو، پێویست بوو، دوای ماوەیەك جەنازەیەکی دیکەیان هێنا، خەڵکەکە لێی وەستابوون، دیسان پێغەمبەر ﷺ سێ جاران فەرمووی: پێویست بوو، پێویست بوو، پێویست بوو، عومەر خوا لێی ڕازی بێ لێی پرسی لەو بارەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەوەی کە ئێوە مەدحتان کردو بە چاکە باستان کرد بەهەشتی بۆ پێویست بوو، ئەوەش کە بە خراپە باستان کرد، ئاگری بۆ پێویست بوو، چونکە ئێوە شایەدیی دەرانی خوان، یاخود ئێوە بەڵگەی خوان سبحانە و تعالی لەسەر زەوی.

## قسەیەکی زۆر جوانی غەزالی دەکەمە دیاری بۆ هاوڕایانی

بێگومان بەسەر هات زۆرن دەربارەی هاوکاری کردنی خەڵکی لەسەر کاری چاك، بەڵام من تەنیا ئاماژە بەو قسە جوانەی زانای پایە بەرز (أبو حامد الغزالي) دەکەم، کە دەڵێ: {إِذَا أَحَبَّ اللهُ عَبْدَاً، أَكْثَرَ حَوَائِجَ الْخَلْقِ إِلَيْهِ} واتە: ئەگەر خوا بەندەیەکی خۆی خۆشویست، وای لێدەکات خەڵك زۆر ئیشیان پێی بێ![1]

مەبەست لەم قسەیە ئەوەیە خوا وا لەو بەندە دەکات هەمیشە لە یارمەتی دانی خەڵکی دابێ‌و ئیش‌وکارەکانیان بۆ جێبەجێ بکات، تاکو سەرەنجام ببێتە خاوەن پاداشتێکی زۆر.

---

[1] پێم وابێ ئیمامی غەزالی هەر لە خۆوە ئەم قسەیەی نەکردوە، حەتمەن لە گوتنی ئەم قسەیەیدا پشتی بەم فەرمایشتە موبارەکەی پێغەمبەر ﷺ بەستووە، کە دەفەرموێ: {إِذَا أَرَادَ اللهُ بِعَبْدٍ خَيْرًا اسْتَعْمَلَهُ، فَقِيلَ: كَيْفَ يَسْتَعْمِلُهُ يَا رَسُولَ اللهِ؟! قَالَ: يُوَفِّقُهُ لِعَمَلٍ صَالِحٍ قَبْلَ الْمَوْتِ} حَدِيثٌ صَحِيحٌ (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٢١٤٢) عَنْ أَنَسٍ، وَصَحَّحَهُ الألباني في (صَحِيح الجَامع): (٣٠٥))، واتە: ئەگەر خوا چاکەی بۆ بەندەیەکی خۆی بوێ بەکاری دێنێ، هاوەڵانیش خوا لێیان ڕازی بێ، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا چۆن بەکاری دێنێ؟! فەرمووی: وای لێدەکات کاری باش بکات‌و لەسەر کاری چاك بمرێ.

ئنجا هەر کەسێکیش لەسەر چ حاڵێك بمرێ لەسەر ئەو حاڵەتە زیندوو دەکرێتەوە، بەپێی ئەم دەقە: {يُبْعَثُ كُلُّ عَبْدٍ عَلَى مَا مَاتَ عَلَيْهِ} حَدِيثٌ صَحِيحٌ (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٧٤١٣) عَنْ جَابِرٍ).

# پایەو پاداشتی
# مەسرەف کێشانی ماڵ‌و منداڵ

خوای بەخشەر لە سوورەتی (البقرة)دا فەرموویەتی: ﴿مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِى كُلِّ سُنۢبُلَةٍ مِّا۟ئَةُ حَبَّةٍ ۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦١﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ لَا يُتْبِعُونَ مَآ أَنفَقُوا۟ مَنًّا وَلَآ أَذًى ۙ لَّهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٦٢﴾﴾

واتە: وێنەی ئەوانەی کە سامانەکانیان لە پێناو خوادا خەرج دەکەن، وەك وێنەی دەنکێك وایە کە حەوت گوڵان دەڕوێنێ، هەر گوڵێك سەد دەنکی تێدایە، وە خوا بۆ هەرکەسێك بیەوێ پاداشت چەند قات دەکاتەوە، وە خوا سیفەت فراوانی زانایە. ئەوانەی سامانەکانیان لەڕێی خوادا خەرج دەکەن پاشان هیچ جۆرە منەتکردن‌و ئازاردانێك وە دوای ئەوە ناخەن کە خەرجیان کردوە، لەلای پەروەردگاریان پاداشتی خۆیانیان هەیەو هیچ جۆرە ترسێکیان نابێ‌و خەماریش نابن.

لە کاتێکدا کە خوای بەخشەر دەفەرموێ: چاکەیەك یان خێرێك کە دەکرێ دە تا حەوت سەد بەرانبەرە ئەگەر لە پێناوی خوابێ، ئەوە بە دڵنیایی بەخشین‌و خەرج کردن بۆ ماڵ‌و منداڵ‌و لە پێناوی خزمەتی کردنیان خێری زۆر زیاترە، بەپێی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی: {«دِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَدِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ فِي رَقَبَةٍ، وَدِينَارٌ تَصَدَّقْتَ بِهِ عَلَى مِسْكِينٍ، وَدِينَارٌ أَنْفَقْتَهُ عَلَى أَهْلِكَ، أَعْظَمُهَا أَجْراً الَّذِي أَنْفَقْتَهُ عَلَى أَهْلِكَ»} **حديثٌ صحيحٌ**(١)

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دینارێك کە سەرفی دەکەی لە پێناوی خوا، وە دینارێك کە سەرفی دەکەی بۆ ئازاد

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٢٣٥٨) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)

کردنی کۆیلەیەك، وە دیناریك کە دەیکەیە خێرو دەیبەخشی بە نەداریك، وە دیناریك کە سەرفی دەکەی بۆ خێزانەکەت، ئەوەی کە بۆ خێزانەکەت سەرفت کردوە، پاداشتی لە هەموویان زیاترە. (سُبْحَانَ اللهِ! لێرەدا سەرف کردنی پارە بۆ ماڵو منداڵ ئەجرو پاداشتی گەورەترە لەو ماڵەی کە سەرف دەکرێ بۆ جەنگو جیهاد لە پێناوی خوا).

وە لە سوورەتی (الحدید)یش دەفەرموێ: ﴿ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِۖ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَأَنفَقُواْ لَهُمْ أَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿٧﴾ ﴾

واتە: بڕوا بێنن بە خواو بە پێغەمبەرەکەی، وە ببەخشن لە ڕێی خوادا لەو ماڵو سامانەی کە ئێوەی کردوە بە جێنشین لەسەری، ئەو کەسانەی بڕوایان هێناوە لە ئێوەو ماڵو سامانیان لە ڕێی خوادا دەبەخشن، پاداشتێکی گەورەیان بۆ هەیە.

وە هەر لە سوورەتی (الحدید) لە ئایەتی (١٨)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلْمُصَّدِّقِينَ وَٱلْمُصَّدِّقَٰتِ وَأَقْرَضُواْ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَٰعَفُ لَهُمْ وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ ﴿١٨﴾ ﴾

واتە: بێگومان پیاوانو ژنانی خێرخواز (بەخشەر)، وە ئەوانەش کە قەرز دەدەن بە خوا بە قەرزێکی باشو چاك، (واتە: یارمەتی هەژارانو ماڵ ومنداڵی خۆیان دەدەن)، چەند بەرانبەر دەیاندرێتەوە، وە بۆ ئەوان پاداشتێکی زۆر چاك هەیە.

وە پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە واتە: لەبارەی پایەو پاداشتی ماڵ بەخشینو خەرج کردن چەندان فەرمایشتی فەرموون، کە بۆ ئێمە جێگای پەندو سوود لێوەرگرتنن، بۆ نیزیك بوونەوەمان لە خوای پەروەردگار، وە تەنانەت تەمەنناو ئاوات خواستن بە یەکدیش لە بەخشینی ماڵ ڕێگەی پێدراوە وەك لە فەموودەیەکی (صحیح)دا هاتوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {لاَ حَسَدَ إلاَّ في اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللهُ مَالاً، فَسَلَّطَهُ عَلَى هَلَكَتِهِ في الحَقِّ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللهُ الحِكْمَةَ، فَهُوَ يَقْضِي بِهَا وَيُعَلِّمُهَا} **حديثٌ صَحيحٌ**[1]

---

[1] (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٧٣)، ومُسلِم: (١٩٣٣)، عَنْ عَبْدَ اللهِ بنَ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)

واتە: حەسوودیی دروست نیە، تەنیا لە دوو شتان دا نەبێ: پیاوێك خوا ماڵی داوەتێ وە دەسەڵاتیشی داوەتێ بەسەر خەرجکردنی لە ڕێی هەق دا، وە پیاوێکیش خوا زانست (حیکمەتی) داوەتێ، ئەویش بەکاری دێنێو خەڵکی لێ فێر دەکات.

دەربارەی وشەی: (حَسَد) زانایانی ئیسلام دەڵێن: (تَمَنِّي زَوَالِ نِعمَةٍ عَنْ مُسْتَحَقٍّ لَهَا) واتە: بە خۆزگە بخوازی نیعمەتێك لەسەر کەسێك لابچێ کە شایستەیەتی.

وە دەربارەی وشەی: (غِبْطَة) خاوەنی کتێبی (مختار الصحاح)، گوتوویەتی: (الغِبْطَةُ بالكَسْرِ أن تَتَمَنَّى مِثْلَ حَالِ الْمَغْبُوطِ مِنْ غَيْرِ أَن تُرِيدَ زَوَالَها عَنْهُ وَلَيْسَ بِحَسَدٍ) بە کەسری پیتی (غ)، ئەوەیە کە تۆ پێت خۆشبێ تۆش وەك ئەوت هەبێ بەبێ ئەوەی بتەوێ ئەو نیعمەتە لەسەر ئەو لابچێو نەمێنێ، کە ئەوە حەڕام نیە، لێرەدا مەبەست لە (حَسَد) (غِبْطَة)یە.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ أَنْفَقَ زَوْجَيْنِ فِي سَبِيلِ اللهِ نُودِيَ مِنْ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ يَا عَبْدَ اللهِ هذَا خَيْرٌ؛ فَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّلَاةِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّلَاةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجِهَادِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الْجِهَادِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصِّيَامِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الرَّيَّانِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّدَقَةِ دُعِيَ مِنْ بَابِ الصَّدَقَةِ» فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي، يَا رَسُولَ اللهِ! فَهَلْ يُدْعَى أَحَدٌ مِنْ تِلْكَ الأَبْوَابِ كُلِّهَا قَالَ: «نَعَمْ وَأَرْجُو أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ»} **حديثٌ صحيحٌ**[1]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازای بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك سەرپەرشتی دوو خێزان (ماڵان) بکات لە دەرگاکانی بەهەشت بانگ دەکرێ ئەی بەندەی خوا ئەوە چاکەکەتە، ئەوەی ئەهلی نوێژبێو نوێژکەربێ لە دەرگای نوێژ بانگی دەکرێ، ئەوەی ئەهلی جیهاد بێ، لە دەرگای جیهاد بانگ دەکرێ، ئەوەی ئەهلی ڕۆژوو بێ لە دەرگای ڕەییان (کە دەرگای ڕۆژووە) بانگ دەکرێ، ئەوەی ئەهلی خێرو صەدەقە بێ،

١) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (١٧٩٨)، وَمُسْلِمٌ: (٢٤١٨))

لە دەرگای خێرو صەدەقە بانگ دەکرێ، ئەبوو بەکر گوتی: بە دایكو بابمەوە بە فیدات بم، ئەی پێغەمبەری خوا! هیچ کەس هەیە لە هەموو دەرگاکان بانگ بکرێ، فەرمووی: بەڵێ، ئومێدم وایە تۆ لەو کەسانە بی کە لە هەموو دەرگاکان بانگ دەکرێن.

{عَنْ عِيَاضِ بْنِ حِمَارٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «أَهْلُ الْجَنَّةِ ثَلَاثَةٌ ذُو سُلْطَانٍ مُقْسِطٌ مُتَصَدِّقٌ مُوَفَّقٌ، وَرَجُلٌ رَحِيمٌ رَقِيقُ الْقَلْبِ لِكُلِّ ذِي قُرْبَى وَمُسْلِمٍ، وَفَقِيرٌ عَفِيفٌ مُتَصَدِّقٌ»} **حديثٌ صحيحٌ**[1]

واتە: عیاضی کوڕی حیمار خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو: ئەو سێ جۆرە کەسە بەهەشتین: دەستەڵاتداریی دادگەرو بەخشەری سەرکەوتوو، وە پیاوی دڵنەرمو بەبەزەیی بۆ هەموو خزمو کەسو کاری، وە بۆ هەموو مسوڵمانێك، وە هەژارێکی پاکی سواڵ نەکەر (لەگەڵ ئەوەی کە دەستی زۆر کورتە، بەڵام دەرۆزەش ناکات).

{عَنْ ثَوْبَانَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَفْضَلُ دِينَارٍ يُنْفِقُهُ الرَّجُلُ دِينَارٌ يُنْفِقُهُ عَلَى عِيَالِهِ، وَدِينَارٌ يُنْفِقُهُ الرَّجُلُ عَلَى دَابَّتِهِ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَدِينَارٌ يُنْفِقُهُ عَلَى أَصْحَابِهِ فِي سَبِيلِ اللهِ»} **حديثٌ صحيحٌ**[2]

واتە: ثەوبان خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین دینار ئەو دینارەیە پیاوێك بۆ خێزانەکەی سەرفی دەکات، وە ئەو دینارەی بۆ سوارەکەی سەرفی دەکات، کە دەبردرێت بۆ جەنگ لە پێناوی خوادا، وە دینارێك کە بۆ برادەرەکانی خۆی سەرفی دەکات لە پێناوی خوادا.

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَا أَعْطَى الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ فَهُوَ صَدَقَةٌ»} **حديثٌ صحيحٌ**[3]

---

[1] (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٧٣٨٦))

[2] (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٢٣٥٧))

[3] (رَوَاهُ أَحْمَدُ: (١٧٦٥٤)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٠٢٤))

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەمرِی كوڕی ئومەییە لە بابی دەگێڕێتەوە خوا لێیان ڕازی بێ، كە لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستوە فەرموویەتی: هەر شتێكی پیاو كە دەیبەخشێ بۆ خێزانەكەی ئەوە بۆی بە صەدەقە دەنووسرێ.

{عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُوْلُ: «إِذَا أَعْطَى اللهُ أَحَدَكُمْ خَيْراً فَلْيَبْدَأْ بِنَفْسِهِ وَأَهْلِ بَيْتِهِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: جابیری كوڕی سەموره خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: ئەگەر خوای پەروەردگار خێری بە یەكێك لە ئێوەدا (با لە بەخشینی ئەو خێرەدا) سەرەتا دەست پێبكات بە خۆی، وە پاشان بۆ ماڵ‌و منداڵەكەی.

{عَنِ الْعِرْبَاضِ بْنِ سَارِيَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا سَقَى امْرَأَتَهُ مِنَ الْمَاءِ أُجِرَ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

واتە: عیرباضی كوڕی ساریە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام بیست ﷺ دەیفەرموو: ئەگەر پیاو ئاو بداتە خێزانەكەی (ئەوە لەسەر ئەو ئاو پێدانە) پاداشتت بۆ دەنووسرێ.

{عَنْ عَبْدِ اللهُ بن عَمْرو رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «كُلُوا وَاشْرَبُوا وَتَصَدَّقُوا وَالْبسُوا، فِي غَيْرِ مَخِيْلَةٍ وَلاَ سَرَف، إِنَّ اللهَ يُحِبُّ أَنْ تُرَى نِعْمَتهُ عَلَى عَبْدِهِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[3].

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەمرِ خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بخۆن‌و بخۆنەوەو ببەخشن‌و لەبەر بكەن، بێ ئەوەی كەشخ‌و فیزو زێدەڕۆیی تێدا بكەن، چونكە بێگومان خوای پەروەردگار حەز دەكات‌و پێی خۆشە نیعمەتەكانی بەسەر بەندەكەیەوە ببینرێ.

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٤٨١٥))
٢) (رَوَاهُ أَحْمَدُ: (١٧١٩٥)، قَالَ شعيب الأرنؤوط: صحيح بِشَوَاهِدِهِ)
٣) (رَوَاهُ أَحْمَدُ: (٦٧٠٨)، وَحَسَّنَهُ شعيب الأرنؤوط، وَقَالَ أَحْمَدُ شاكر: إسنادُهُ صَحِيحٌ)

{عَنِ الْحَسَنِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَحَبُّ الْعِبَادِ إِلَى اللهِ تَعَالَى أَنْفَعُهُمْ لِعِيَالِهِ»} **حديثٌ حسنٌ**[1]

**واتە: حەسەن خوا لێی ڕازی بێ، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خۆشەویسترین بەندە لە لای خوای بەرز ئەو بەندەیە کە زۆرترین سوودیی بەخشین‌و مەسرف کێشانی بۆ ماڵ‌و منداڵ‌و خێزانەکەی خۆی هەیە.**

{عَنْ طَارِقِ الْمُحَارِبِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ، فَإِذَا رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَائِمٌ يَخْطُبُ النَّاسَ وَهُوَ يَقُولُ: «يَدُ الْمُعْطِي الْعُلْيَا، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ، أُمَّكَ وَأَبَاكَ، وَأُخْتَكَ وَأَخَاكَ، ثُمَّ أَدْنَاكَ أَدْنَاكَ»} **حديثٌ صحيحٌ**[2]

**واتە: طاریقی موحاریبیی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: کە چوومە مەدینە، لەو کاتە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاوەستا بوو وتاری بۆ خەڵك دەداو، دەیفەرموو: ئەو دەستەی کە دەبەخشێ بەرزە، وە (لە خێر کردن) لەوەوە دەست پێبکە کە سەرپەرشتی لە ئەستۆتە، دایك‌و بابت، وە خوشك‌و برات، پاشان نیزیك‌و نیزیك تر لێت.**

{عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «الصَّدَقَةُ عَلَى الْمِسْكِينِ صَدَقَةٌ، وَالصَّدَقَةُ عَلَى ذِي الرَّحِمِ اثْنَتَانِ: صَدَقَةٌ وَصِلَةٌ»} **حديثٌ صحيحٌ**[3]

**واتە: سەلمانی کوڕی عامیرِ خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خێرکردن بە نەدارو خەڵکی ئاتاج هەر خێرو چاکەیە، بەڵام بە خزمی نەدار، دوو شتە: هەم خێرو چاکەیەو هەم صیلەی ڕەحمیشی جێبەجێکردوەو پەیوەندی خزمایەتیشی گەیاندوە.**

---

[1] (الزهد لأحمَدُ بن حنبل، حَدِيث حَسَنٌ مُرْسَل، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع): (١٧٢))

[2] (رَوَاهُ ابنُ حِبَّان: (٣٣٣٠)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع): (٨٠٦٧))

[3] (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٦٥٨)،، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع): (٣٨٥٨))

{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِذَا أَنْفَقَتِ الْمَرْأَةُ مِنْ بَيْتِ زَوْجِهَا غَيرَ مُفْسِدَةٍ كَانَ لَهَا أَجْرُهَا، وَلَهُ مِثْلُهُ بِمَا اكْتَسَبَ، وَلَهَا بِمَا أَنْفَقَتْ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر ئافرەت لە ماڵ‌و سامانی مێردەکەی بکاتە خێرو ببیەخشێ، بێ ئەوە زێدەڕۆیی تێدا بکات ئەوە پاداشتی بۆ هەیە، هەروەها پاداشت بۆ مێردەکەشی دەنووسرێ.**

{عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: مَرَّ عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلٌ فَرَأى أَصْحَابَ رَسُوْلِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ جَلَدِهِ وَنَشَاطِهِ فَقَالُوا: يَا رَسُوْلَ اللهِ! لَوْ كَانَ هَذَا فِي سَبِيلِ اللهِ؟ فَقَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنْ كَانَ خَرَجَ يَسْعَى عَلَى وَلَدِهِ صِغَاراً فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَإِنْ كَانَ خَرَجَ يَسْعَى عَلَى أَبَوَيْنِ شَيْخَينِ كَبِيرَيْنِ فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَإِنْ كَانَ يَسْعَى عَلَى نَفْسِهِ يَعِفُّهَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَإِنْ كَانَ خَرَجَ رِيَاءً وَمُفَاخَرَةً فَهُوَ فِي سَبِيلِ الشَّيْطَانِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

**واتە: کەعبی کوڕی عوجرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێك بە لای پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕ بوو، زۆر تووندو چالاك بوو، هاوەڵانی بەڕێزیش کە بینیان، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەگەر ئێستا ئەوە لە پێناوی خوا (ئەو توانایەی بەکارهێنا بووایە)؟! پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئەوە هاتبێتە دەر لە ماڵ تا ماڵ‌و منداڵە بچووکەکانی بە خێو بکات ئەوە لە پێناوی خوایە، وە ئەگەر هاتبێتە دەر تاکو مەسرەفی دایك‌و باب‌ێکی پیرو بە تەمەنی بکێشێ ئەوەش لە پێناوی خوایە، وە ئەگەر لەبەر خۆی هاتبێتە دەر تاکو داوا لە خەڵکی نەکات(و خۆی بژیێنێ) ئەوەش هەر لە پێناوی خوایە، بەڵام ئەگەر هاتبێتە دەر بۆ ڕیابازی‌و ڕووپامایی‌و شانازیی بە خۆ کردن، ئەوە لە پێناوی شەیتانە!**

١) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ: (١٣٥٩)، وَمُسْلِمٌ: (٢٤١٣) وَاللَّفْظُ لَهُ)
٢) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ: (٢٨٢)، وَصَحَّحَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (١٦٩٢))

# پایەو پاداشتی

## چاكه كردن لەگەڵ كچان

تاریكترینو ناخۆشترین ڕۆژەكانی مرۆڤ پێش هاتنی ئیسلام بریتی بوو له هاتنه دنیاو له دایك بوونی كچۆڵەیەكی بەخشراوی خوا، لەم ڕۆژگاردا هەر كەسێك مۆژدەو هەواڵی ئەوەی پێدرا بووایه كچێكی بووه، زۆر هەستی به شەرمەزاری دەكردو زۆر بێهێز دەبوو، وه هەروەها دەمو چاویشی تاڵو ڕەش هەڵدەگەڕا، له بەرانبەر ئەم هەواڵە، بۆیه ڕاستەوخۆ بیری لەوه دەكردەوه چۆن به زووترین كات هەوڵی له ناوبردنی ئەو منداڵه بچووكی بدات كه تازه چاوی به دنیا هەڵێناوه، ئەمەش نەریتێك بوو زۆربەیان لەسەری پەروەردە بوو بوون، وەك خوای پەنهانزان بۆمان باس دەكاو دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلْقَوْمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ ۚ أَيُمْسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُۥ فِى ٱلتُّرَابِ ۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾ النحل، واتـه: (بێبڕوایـان) كاتێـك یەكێكیان مۆژدەی كچێكی پێ بدرێ دەمو چاوی ڕەش هەڵدەگەرێو پیش دەخواتەوه، وه خۆی دەشارێتەوه له خەڵكی لەبەر ئەو مۆژده خراپەی كه پێی دراوه، ئایا بیهێڵێتەوه به شەرمەزاریو سەرشۆڕی (و به خێوی بكات) یان زینده به چاڵی بكات؟! ئاگاداربنو بزانن ئای چەنده ئەوه چەنده بڕیارێكی خراپه دەیدەن.

وه هەر دەربارەی زینده به چاڵ كردنی كچۆڵانو پرسیار لێكرانیان له ڕۆژی دوایی خوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿ وَإِذَا ٱلْمَوْءُۥدَةُ سُئِلَتْ ﴿٨﴾ بِأَىِّ ذَنۢبٍ قُتِلَتْ ﴿٩﴾ ﴾ التكویر، واتـه: وه كاتێـك پرسـیار كـرا لـه كـچانی زینـده بـه چـاڵ. كـه بـه هـۆی چ گوناهێكەوه كوژران؟!! دیاره منداڵێك كه تازه بووه هیچ گوناهی نەبووه!

بەڵام دوای هاتنی شـەریعەتی پڕ حیكمـەتی خـوای پـەروەردگار بـۆ دەرباز كـردنی هەموو بەندەكان، ئافرەتان به گشتیو كچان بـه تایبـەتی ڕێزو پلەو پایەی خۆیـان بـۆ گێڕدرایەوه، بۆ ئەوەی ئەم قسەمان بسەلمێنین، با گوێ لەم دەقانەی خوارەوه بگرین:

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ عَالَ جَارِيَتَيْنِ حَتَّى تَبْلُغَا، جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَنَا وَهُوَ»، وَضَمَّ أَصَابِعَهُ} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(1)

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دوو کچۆڵە بە خێو بکات هەتا باڵغ دەبن، لە ڕۆژی قیامەت کە دێت من ئەو ئاواین، پەنجاکانی هێنا تەنیشت یەك!**

{أَنَّ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا زَوْجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَتْ: جَاءَتْنِي امْرَأَةٌ وَمَعَهَا ابْنَتَانِ لَهَا فَسَأَلَتْنِي فَلَمْ تَجِدْ عِنْدِي شَيْئًا غَيْرَ تَمْرَةٍ وَاحِدَةٍ، فَأَعْطَيْتُهَا إِيَّاهَا، فَأَخَذَتْهَا فَقَسَمَتْهَا بَيْنَ ابْنَتَيْهَا وَلَمْ تَأْكُلْ مِنْهَا شَيْئًا، ثُمَّ قَامَتْ فَخَرَجَتْ وَابْنَتَاهَا، فَدَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): فَحَدَّثْتُهُ حَدِيثَهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنِ ابْتُلِيَ مِنَ الْبَنَاتِ بِشَيْءٍ فَأَحْسَنَ إِلَيْهِنَّ كُنَّ لَهُ سِتْرًا مِنَ النَّارِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(2)

**واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، خێزانی پێغەمبەر ﷺ گوتوویەتی: ئافرەتێك هات بۆ لام دوو کچی خۆی لەگەڵ بوون، داوای (خواردنی) لێکردم منیش هیچ شتێکم لەلا دەست نەکەوت جگە لە یەك دەنکە خورما، وە ئەو دەنکە خومایەم پێدا، ئەویش لێی وەرگرتم‌و دابەشی کرد لە نێوان دوو کچەکەو خۆی هیچ شتێکی لێ نەخوارد، دوایی هەندێك وەستاو لەگەڵ دوو کچەکەی ڕۆیشتن، پاشان پێغەمبەر ﷺ هاتەوە لام، منیش ڕووداوەکەم بۆ باسکرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك تاقیی بکرێتەوە بە دوو کچان، ئەویش لەگەڵیان چاکەکار بوو ئەوە بۆی دەبنە بەربەست لە ئاگرو دەیپارێزن.**

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٦٨٦٤))
٢) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٦٨٦٢))

{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لَيْسَ أَحَدٌ مِنْ أُمَّتِي يَعُولُ ثَلاَثَ بَنَاتٍ، أَوْ ثَلاَثَ أَخَوَاتٍ، فَيُحْسِنُ إِلَيْهِنَّ، إِلاَّ كُنَّ لَهُ سِتْراً مِنَ النَّارِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ یەکێك نیە لە ئۆممەتی من سێ، کچ یان سێ خوشك بە خێوبکات، وە چاکەکاربێ لەگەڵیان، ئەوە بە دڵنیایی بۆی دەبنە بەربەستێك‌و دەیپارێزن لە ئاگری دۆزەخ.**

## بەسەرهاتێك لەم بارەیەوە

عەبدوڵڵای بابی جابیر خوا لێیان ڕازی بێ، دوای ئەوەی لە جەنگی ئوحود کوژراو پلەی شەهید پێ بەخشرا، نۆ کچی لە دوای خۆی بە جێ هێشت لەگەڵ جابیر، جابیریش ویستی ژن بێنی بەڵام بیری لەوە کردەوە بە جۆرێك زەواج بکات کە سەرەنجام لەو پرۆسەیە سەرکەوتووبێ، بۆیە بڕیاریدا ئافرەتێکی بە ئەزموون‌و هەڵکەوتوو بێنێ کە پێشتر شوویەکی دیکەی کردبوو، دوای ئەوەی گەیشتە پێغەمبەر ﷺ ئەو هەواڵەی پێدا، دیارە پێغەمبەریش ﷺ پرسیاری لێدەکات بۆچی کچێکی گەنجی نەهێناوەو ئەو ئافرەتەی هێناوە کە پێشتر شووی کردوە، واتە: حیکمەتەکەی چییە؟ جابیریش لە وەڵامدا دەڵێ: کە باوکم شەهید کرا نۆ کچی لە دوای خۆی جێهێشتوە، منیش پێم خۆشبوو ئافرەتێك بخوازم کە سەرپەرشتی‌و چاودێری خوشکەکانم بکات نەك هاوکوفی خۆیان بێ‌و نەتوانێ لەگەڵیان بگوزەرێنێ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ زۆر سەرسام بوو بەو پەرۆشیەی جابیر بۆ خوشەکەکانی‌و ئەم دوعایەی بۆ کرد: (بَارَكَ اللهُ لَكَ) خوا پیت‌و فەڕی خۆی برژێنێ بەسەر تۆ ئەی جابیر.[2]

---

[1] (رَوَاهُ البَيْهَقِيُّ فِي (شعب): (١١٠٢٣)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٥٣٧٢))

[2] (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٥٠٥٢)).

# پایەو پاداشتی

## یارمەتیدانی منداڵی هەتیو

خوای پەروەردگار لە قورئانی بەپێزو، پێغەمبەری بەڕێز ﷺ یش لە فەرمایشتە موبارەکەکانی زۆر تەئکیدیان لەسەر هاوکاریی‌و، یارمەتی دانی، منداڵی هەتیوو کردۆتەوە، خوای پەروەردگار لەوبارەوە فەرموویەتی: ﴿لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّۦنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُوا۟ ۖ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ البقرة﴾

واتە: چاکە ئەوە نیە کە ڕووی خۆتان بکەنە لای ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوا، بەڵکو چاکە چاکەی کەسێکە بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی‌و فریشتان‌و کتێب‌و پێغەمبەران بێنێ‌و ماڵی خۆیشی وێڕای خۆشویستنیشی بە خزمان‌و هەتیوان‌و نەداران‌و ڕێبواران‌و سواڵکەران‌و لە ئازادکردنی کۆیلان دا ببەخشێ، وە نوێژ بەرپا بکات‌و زەکات بدا، وە بەجێ هێنانی پەیمان کە پەیمانیان دا، وە خۆڕاگران لە حاڵەتی ئاتاجیی‌و نەخۆشیی‌و لە کاتی جەنگ دا، ئا ئەوانە کەسانێکن ڕاست دەکەن‌و ئەوانەن پارێزکاران.

وە دەربارەی بەخشینی ڕزق‌و ڕۆزیش بە هەتیوان خوای بەخشەر لە سوورەتی (البقرة)دا فەرموویەتی: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ ۖ قُلْ مَآ أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ ۗ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢١٥﴾﴾

واتە: پرسیارت لێدەکەن چی ببەخشن؟ بڵێ: هەرشتێك لە ماڵ وسامان ببەخشن بۆ باب ودایك‌و نزیکان‌و هەتیوان‌و نەداران‌و ڕێبواران، وە هەرشتێك لە چاکە بکەن ئەوە مسۆگەر خوا پێی زانایە.

**چەند فەرمایشتێك:**

{عَنْ سَهْلٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَنَا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ فِي الْجَنَّةِ هَكَذَا»، وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى وَفَرَّجَ بَيْنَهُمَا شَيْئاً} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتە: سەهل خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: منو سەرپەرشتیاری هەتیوو لە بەهەشت دا ئاواین، وە ئاماژەی بۆ پەنجەی شایەتمانیو پەنجەی نێوە ڕاستی كرد، وە هەندێكی لێككردنەوە (واتە: پەنجەكانی لە یەكدی دوورخستنەوە).**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «كَافِلُ الْيَتِيمِ لَهُ أَوْ لِغَيْرِهِ أَنَا وَهُوَ، كَهَاتَيْنِ فِي الْجَنَّةِ»، وَأَشَارَ مَالِكٌ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: منو سەرپەرشتیاری هەتیووێك (جا هەتیووەكەی خزمی خۆی بێ یان هی بێگانە) لە بەهەشتدا ئاواین، وە ئاماژەی بۆ پەنجەی شایەتمانیو پەنجەی نێوە ڕاستی كرد.**

{عَنْ أَبِي الدَرْدَاءَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: أَتَى النَّبِيّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَجُلٌ يَشْكُو قَسْوَةُ قَلْبِهِ، قَالَ: «أَتُحِبُّ أَنْ يَلِينَ قَلْبُكَ؟ وَتُدْرِكَ حَاجَتَكَ؟ ارْحَمِ الْيَتِيمَ وَامْسَحْ رَأْسَهُ وَأَطْعِمْهُ مِنْ طَعَامِكَ، يَلِنْ قَلْبُكَ وَتُدْرِكْ حَاجَتَكَ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[3]

---

١) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٤٩٩٨))

٢) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٧٦٦٠))

٣) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِي: (ج٣، ص٢٣٧)، وَحَسَّنَهُ العَلَّامَة الألباني في (صحيح الجامع): (٨٠))

واتە: ئەبوو دەرداء خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ سکاڵای کرد لەوەی کە دڵی زۆر ڕەقە، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئایا دەتەوێ دڵت نەرم بێ و بە پێویستیەکانی خۆت بگەی؟ بەبەزەیی بە لەگەڵ هەتیوو دەستی بەسەری دابێنەو لە خواردنی خۆت بەشی بدە، ئەوکاتە دڵت نەرم دەبێ و بە پێویستیەکانیشت دەگەی.

{عَنْ مَالِكِ بْنِ الْحَارِثِ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ ضَمَّ يَتِيمًا بَيْنَ أَبَوَيْنِ مُسْلِمَيْنِ إِلَى طَعَامِهِ، وَشَرَابِهِ حَتَّى يَسْتَغْنِيَ عَنْهُ، وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ الْبَتَّةَ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**(١)

واتە: مالیکی کوڕی حارث خوا لێی ڕازی بێ، گوێی لێ بووە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك مندڵێکی بێ باب بگرێتە ئەستۆی خۆی و کە دایك و بابی مسوڵمان بن، سەرپەرشتی بکات و لە خواردن و خواردنەوەی خۆی بداتێ هەتاکو گەورە دەبێ و پێویستی بەو نامێنێ، ئەو بە بەهەشتی بە تەواوی بۆ واجب دەبێ.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «السَّاعِي عَلَى الأَرْمَلَةِ وَالْمِسْكِينِ كَالْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللهِ، أَوْ الْقَائِمِ اللَّيلِ الصَّائِمِ النَّهَارِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(٢)

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی کە هەوڵدەدا بۆ (خزمەتکردنی) بێوەژن و کەسانی نەدار (بە مەبەستی ڕەزامەندی خوا)، (پاداشتی) وەك ئەو موجاهیدەیە کە لە ڕێی خوادا جیهاد دەکات، یان وەك ئەو کەسەیە کە بە شەو شەونوێژ دەکات و بە ڕۆژیش بەڕۆژوو دەبێ.

---

١) (رَوَاهُ أَحْمَد: (١٩٠٤٧)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٢٥٤٣))

٢) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ: (٥٠٣٨)، وَاللَّفْظُ لَهُ، وَمُسْلِمٌ: (٧٦٥٩))

# پایەو پاداشتی پارە بە قەرزدان

خوای بەخشەر لە سوورەتی (الحدید) دەربارەی بەخشینی ماڵ دەفەرموێ: ﴿ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُوا۟ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ ۖ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَأَنفَقُوا۟ لَهُمْ أَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿٧﴾﴾

واتە: بڕوا بێنن، بە خواو بە پێغەمبەرەکەی، وە ببەخشن لە ڕێی خوادا لەو ماڵ و سامانەی کە ئێوەی کردوە بە جێنشین لەسەری، ئەو کەسانەی بڕوایان هێناوە لە ئێوەو ماڵ‌و سامانیان لە ڕێی خوادا دەبەخشن، پاداشتێکی گەورەیان بۆ هەیە.

وە هەروەها باسی پاداشتی ئەوانەش دەکات کە قەرز بە خەڵکی دەدەن‌و دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْمُصَّدِّقِينَ وَٱلْمُصَّدِّقَـٰتِ وَأَقْرَضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَـٰعَفُ لَهُمْ وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ ﴿١٨﴾﴾ الحدید

واتە: بێگومان پیاوان‌و ژنانی خێرخواز (بەخشەر)، وە ئەوانەش کە قەرز دەدەن بە خوا بە قەرزێکی باش‌و چاك، (واتە: یارمەتی هەژاران دەدەن‌و پارەیان بە قەرز دەدەنێ)، چەند بەرانبەر دەیاندرێتەوە، وە بۆ ئەوان پاداشتێکی زۆر چاك هەیە.

وە دەربارەی پارە بە قەرزدان‌و چاوەڕوانکردنی قەرزاریش تا خوا دەرووی خێر لە قەرزار دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيْسَرَةٍ ۚ وَأَن تَصَدَّقُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٨٠﴾﴾ البقرة

واتە: وە ئەگەر (کەسی قەرزدار) تەنگدەست بوو، ئەوە چاوەڕێی بکەن هەتا بۆی ئاسان دەبێ، وە ئەگەر خێریش بکەن (چاوپۆشیی لە قەرزەکە بکەن) ئەوە بۆتان باشترە ئەگەر بزانن.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ، يَسَّرَ اللهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

---

١) (رَوَاهُ ابْنُ مَاجَهْ: (٢٤١٧)، وَصَحَّحَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٩٠٢)).

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك ئاسانکاری بۆ هەژارێکی قەرزار بکات (کە نەیبێ قەرزەکە بداتەوە)، خوا لە دنیاو دوارۆژدا ئاسانکاری بۆ دەکات.**

{عَنْ أَبِي الْيُسر رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ أَحَبَّ أَنْ يُظِلَّهُ اللهُ فِي ظِلِّهِ، فَلْيُنْظِر مُعْسِراً أَوْ لِيَضَعَ لَهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[١]

**واتە: ئەبوو یوسر (کە یەکێکە لە هاوەڵان) خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك حەز دەکات خوا بیخاتە ژێر سێبەری خۆی، با چاوەڕوانی قەرزارێکی تەنگ دەست بکات (کە نیەتی بیداتەوە لە کاتی دیاریکراو)، یاخود هەر لێی خۆشبێ‌و لێی وەرنەگرێتەوە.**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِراً أَوْ وَضَعَ لَهُ، أَظَلَّهُ اللهُ فِي ظِلِّ عَرْشِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[٢]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك چاوەڕوانی قەرزارێکی تەنگ دەست بکات (کە نیەتی بیداتەوە لە کاتی دیاریکراو)، یاخود هەر لێی خۆشبێ‌و وەرینەگرێتەوە، خوا دەیخاتە ژێری سێبەری عەرشی خۆی لە ڕۆژی قیامەت.**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِراً أَوْ وَضَعَ لَهُ، أَظَلَّهُ اللهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تَحْتَ ظِلِّ عَرْشِهِ يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[٣].

---

١) (رَوَاهُ ابْنُ مَاجَة: (٢٤١٩)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٩٠١))
٢) (رَوَاهُ أَحْمَدُ: (٨٦٩٦)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح الجامع): (٦١٠٧))
٣) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (١٣٠٦)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٩٠٩))

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك چاوەڕوانی کەسێکی تەنگ دەست بکات کە قەرزدارە، (با لەکاتی خۆشی نیپەرێت)، یاخود هەر لێی خۆشبێ و وەرینەگرێتەوە، خوا لە ڕۆژی قیامەتدا دەیخاتە ژێری سێبەری عەرشی خۆی کە لەو ڕۆژەدا هیچ سێبەرێك نیە جگە لە سێبەری وی (واتە: سێبەری عەرش).

{عَنْ أَبِي قَتَادَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَنْ نَفَّسَ عَنْ غَرِيمِهِ أَوْ مَحَا عَنْهُ كَانَ فِي ظِلِّ الْعَرْشِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(١)

واتە: ئەبوو قەتادە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ، دەیفەموو: هەر کەسێك لەسەر قەرزارەکەی سووك بکات (واتە: بۆی دوا بخات) یاخود لێی بسڕێتەوەو لەسەری لابەرێ (بۆ نموونە: سێ ملیۆن دیناری لەسەرە بڵێ: ئەوە من نیو ملیۆنم لەسەر لابردی مادام تەنگ دەستەو نیتە، یاخود بۆی دوا بخات بۆ ماوەیەکی دیکە ئەوە لە هەردوو حاڵاندا) لە ژێر سێبەری عەرشی خوا دادەبێ لە ڕۆژی قیامەت.

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ أَبَا قَتَادَةَ طَلَبَ غَرِيمًا لَهُ فَتَوَارَى عَنْهُ ثُمَّ وَجَدَهُ فَقَالَ: إِنِّي مُعْسِرٌ، فَقَالَ: آللهِ؟ قَالَ: آللهِ، قَالَ: فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُنْجِيَهُ اللهُ مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلْيُنَفِّسْ عَنْ مُعْسِرٍ أَوْ يَضَعْ عَنْهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(٢)

واتە: ئەبوو قەتادە خوا لێی ڕازی بێ (کە یەکێکە لە هاوەڵانی بەڕێز) دەگەڕا بە دوای قەرزارێکی خۆیدا (کەچی قەرزارەکە خۆی لێ شاردبۆوە)، دواتر بینی، قەرزارەکە گوتی: من تەنگ دەست و نەدارم، گوتی: توخودا تەنگ دەست و نەداری؟ گوتی: بە خوا تەنگ دەست و نەدارم، ئەویش گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەموو: هەر

---

١) (رَوَاهُ أَحْمَدُ: (٢٢٦١٢)، وَصَحَّحَهُ العلامة الألباني في (صحيح الجامع): (٢٦٤٠))

٢) (رَوَاهُ مُسلم: (٤٠٨٣))

کەسێك حەز دەکات خوا ڕزگاری بکات لە ناڕەحەتیەکانی ڕۆژی قیامەت، با ماوەی داواکردنەوەی قەرز لەسەر قەرزارەکی تەنگ دەست درێژ بکاتەوە یاخود لێی خۆشبێ‌و لەسەری هەڵبگرێ (واتە: پارەکەی هەر لێوەرنەگرێتەوە).

{عَنْ حُذَيْفَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «تَلَقَّتِ الْمَلَائِكَةُ رُوحَ رَجُلٍ مِمَّنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، فَقَالُوا: أَعَمِلْتَ مِنَ الْخَيْرِ شَيْئاً؟ قَالَ: لا، قَالُوا: تَذَكَّرْ، قَالَ: كُنْتُ أُدَايِنُ النَّاسَ، فَآمُرُ فِتْيَانِي أَنْ يُنْظِرُوا الْمُعْسِرَ وَيَتَجَاوَزُوا عَنِ الْمُوسِرِ قَالَ: قَالَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: تَجَاوَزُوا عَنْهُ» وَفِي لَفْظٍ: نَحْنُ أَحَقُّ بِذَلِكَ مِنْهُ، تَجَاوَزُوا عَنْهُ} **حديثٌ صحيحٌ**[1]

واتە: حوزەیفەی یەممانی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: فریشتەکان ڕووحی پیاوێك لەوانەی پێش ئێوەیان وەرگرت، ئنجا گوتیان: ئایا چ کاری چاکت کردوە؟ ئەویش گوتی: نەخێر، گوتیان: بیربکەوە، گوتی: من قەرزم دەدا بە خەڵك، وە فەرمانم بە خزمەتکارەکانم دەرکرد کە چاوەڕوانی دەنگ دەست بکەن‌و خاتری هەبووەکانیش بگرن‌و چاوپۆشی لێبکەن، فەرمووی: خوای عَزَّ وَجَلَّ بە فریشتەکانی فەرموو: ئێوەش لێی خۆشبن‌و لێی ببورن، (لە بێژە (لفظ)یەکی دیکە هاتوە: کە خوا دەفەرموێ: ئێمە لەو شایستەترو لە پێشترین بەوە کە لێی خۆشبین، لێی خۆشبن‌و بیبوورن).

{عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَه، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: سَمِعْتُ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِراً فَلَهُ بِكُلِّ يَوْمٍ مِثْلِهِ صَدَقَةٌ»، قَالَ: ثُمَّ سَمِعْتُهُ يَقُولُ: «مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِراً فَلَهُ بِكُلِّ يَوْمٍ مِثْلَيْهِ صَدَقَةٌ». قُلْتُ: سَمِعْتُكَ يَا رَسُوْلَ اللهِ تَقُولُ: «مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِراً فَلَهُ بِكُلِّ يَوْمٍ مِثْلِهِ صَدَقَةٌ»، ثُمَّ سَمِعْتُكَ تَقُولُ: «مَنْ أَنْظَرَ مُعْسِراً فَلَهُ بِكُلِّ يَوْمٍ مِثْلَيْهِ صَدَقَةٌ»} **حديثٌ صحيحٌ**[2]

واتە: سولەیمانی کوڕی بورەیدە لە بابی دەگێڕێتەوە خوا لێی ڕازی بێ، گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، کە فەرموویەتی: هەر کەسێك چاوەڕوانی کەسێکی تەنگ

---

١) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ: (١٩٧١)، وَمُسْلِم: (٤٠٧٦) وَاللَّفظُ لَهُ)
٢) (رَوَاهُ أَحمَدُ: (٢٣٠٩٦)، وَصَحَّحَهُ العلامة الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٨٦))

دەست بکات کە قەرزدارە، (با لەکاتی خۆشی تێپەڕێت) بە هەر ڕۆژێك بە ئەندازەی ئەو قەرزەی کە لەلایەتی خوا صەدەقەو خێری بۆ دەنووسێ، (بۆ نموونە: یەکێك چوار ملیۆن دیناری داوەتێ ساڵێکی بەسەردا تێپەڕیوە بە ماوەی ساڵێك داویەتی دوای ساڵەکە دەڵێ نیمە جارێ چاوەڕێم بکە، چەند ڕۆژانی صەبر لێ بگرێ هەموو ڕۆژان بە ئەندازەی قەرزەکە بۆی بە صەدەقە دەنووسرێ، یانی: هەر ڕۆژێك بۆی دەنووسرێ چوار ملیۆن دیناری کردە خێر) دەڵێ: دوای گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو فەرمووی: هەر کەسێك چاوەڕێی تەنگ دەستێك بکات بە هەر ڕۆژێك دوو بەرانبەری قەرزەکەی بۆی بە چاکەو خێر دەنووسرێ!

## بەسەرهاتێك لەم بارەیەوە

ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی گێڕاینەوە فەرمووی: پیاوێکی نەوەی ئیسرائیل دەچێتە لای پیاوێکی دی‌و داوای لێ دەکات هەزار دیناری بە قەرز بداتێ، ئەویش پێی دەڵێ: باشە، بەڵام با چەند شایەدێك ئاگایان لێ بێ، کابراش دەڵێ: خوای گەورە شایەدە، ئەویش بەسە کە شایەد بێ، ئنجا پێی دەڵێ: باشە، بەڵام کەفیلێکم بۆ بێنە، کابراش دەڵێ: خوا کەفیلمەو ئەویش بەسە کە کەفیل بێ، پیاوەکەش دەڵێ: ڕاست دەکەی‌و قەرزەکەی پێ دەدات بۆ ماوەیەکی دیاری کراو، (ئنجا ئەو کەسەی پارەکەی بە قەرز وەرگرت) ڕۆیشت‌و چووە سەفەر، سواری کەشتی بوو، کە ئیشەکەی تەواو بوو ویستی بگەڕێتەوە، بۆ ئەوەی لەو ماوەی کە دیاری کراوە قەرزەکەی بداتەوە، دوای هەوڵێکی زۆر کەشتی دەست نەکەوت، هەڵسا دارێکی هێناو ناوی هەڵکۆڵی، ئنجا هەزار دینارەکەو نامەیەکی خستە نێو دارەکەو زۆر توند پێچایەوەو بۆ ئەوەی تەڕ نەبێ هاتە کەناری دەریاو گوتی: ئەی خوایە! تۆ خۆت دەزانی من هەزار دینارم لە فلان کەس بە قەرز وەرگرت، کاتێك داوای شایەدی لێکردم، گوتم: خوای گەورە شایەدە،

ئەویش بەسە کە شایەد بێ، ئنجا داوای کەفیلی لێکردم گوتم: خوا کەفیلمەو ئەویش بەسە کە کەفیل بێ، ئەویش بەوە ڕازی بوو، ئێستاش کەسم دەستناکەوێ پێیدا بنێرمەوە، تاکو بیداتەوە، وە کەشتیش نیە سواری بم، من ئەوە تەسلیمی تۆی دەکەم، ئنجا فڕێی دایە نێو ئاوەکەو ڕۆیشت بۆ ئەوەی کەشتیەکی دەست بکەوێو پێی بگەڕێتەوە، کابرای خاوەن قەرزیش لەو بەری لە کەناری دەریاکە چاوەڕێی هاتنەوەی کەشتی بوو، بۆ ئەوەی پارەکە لە کابرای خاوەن قەرز وەربگرێتەوە، کەچی کەشتی دیار نەبوو، بەڵام چاوی بەو دارە کەوت کە (کابرای قەرزار ناردبووی) هەڵیگرتەوەو بردیەوەماڵێ، ئنجا کە خەریك بوو دەیشکاندو وردی دەکرد بۆ ئەوەی بیکاتە سووتەمەنی بەڵام پارەکەو نامەکەی لە نێو دۆزیەوە، دوای ماوەیەك کابرای قەرزار هاتەوە، چووە لای خاوەن قەرزو هەزار دینار بۆ بردو سوێندی بۆ خوارد کە لە کاتی خۆی کەشتی دەست نەکەوتووە، وا ئێستا قەرزەکەی بۆ هێناوەتەوە، خاوەن قەرزەکە لێی پرسی: ئەدی هیچی دیکەت بۆ نەناردووم؟ گوتی: وەك پێم گوتی: کەسم دەست نەکەوتو کەشتیش نەبوو، بەڵام باسی ئەوەی بۆ کرد کە چی کردوەو گوتوە لەگەڵ خوا دەربارەی نامەکەو پارەکە، خاوەن قەرزەکەش گوتی: خوای پەروەردگار ئەو پارەی لە نێو دارەکەت ناردبوو پێی گەیاندمو قەرزەکەی بۆ دایەوە (لە کاتی خۆی).

# پایەو پاداشتی

## چاکە کـردن لەگەڵ دراوسـێ

خوای پایەدار لە سوورەتی (النساء)دا دەربارەی چاکبوون لەگەڵ هەندێ کەسی تایبەت‌و بە تایبەتتریش دراوسێ فەرموویەتی: ﴿ وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا وَبِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡجَارِ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلۡجَنۢبِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخۡتَالٗا فَخُورًا ٣٦ ﴾

واتە: وە خوا بپەرستن‌و هیچ شتێك مەكەنە هاوبەشی، وە چاكە بكەن لەگەڵ باب‌و دایك‌و خزمان‌و هەتیوان‌و نەداران‌و داروسێی نیزیك‌و دراوسێی دوورو هاوەڵی هاودەم‌و ڕێبوارو ئەوانەی خاوەنیانن (كۆیلەكانتان)، بێگومان خوا كەسێكی خۆشناوێ كە خۆ پێ زۆرو شانازیی بەخۆكەربێ.

وە هەروەها پێغەمبەری خواش ﷺ دەربارەی مافی دراوسێ فەرموویەتی: {«مَا زَالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بِالْجَارِ، حَتَّى ظَنَنْتُ أَنَّهُ سَيُوَرِّثُهُ»} **حديثٌ صَحيحٌ**[1]

واتە: بەردەوام جیبریل ئامۆژگاری دەكردم‌و وەصیەتی پێدەكردم بە باشبوونم لەگەڵ دراوسێ، هەتا گومانم برد كە دراوسێ میرات لە دراوسێ دەگرێ!!

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «خَيْرُ الأَصْحَابِ عِنْدَ اللهِ خَيْرُهُمْ لِصَاحِبِهِ، وَخَيْرُ الْجِيْرَانِ عِنْدَ اللهِ خَيْرُهُمْ لِجَارِهِ»} **حديثٌ صَحيحٌ**[2]

واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەمەڕ خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: باشترین برادەر لە لای خوا ئەو برادەرەیە كە باشبێ بۆ برادەری خۆی، وە باشترین دراوسێ لە لای خوا ئەو دراوسێیەیە كە بۆ دراوسێیەكەی باشبێ.

---

١) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ: (٥٦٦٨)، وَمُسْلِمٌ: (٢٦٢٥) عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)،

٢) (رَوَاهُ أَحْمَد: (٦٥٦٦)، وَالتِّرْمِذِيُّ: (١٩٤٤)، وابْنُ حِبَّانَ: (٥١٩)، والحاكم: (٢٤٩٠)، وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الإسناد وَلَمْ يَخْرِجَاهُ وَصَحَّحَهُ العَلَّامَةُ الألباني)

{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لَهَا: «إنَّهُ مَنْ أُعْطِيَ حَظَّهُ مِنَ الرِّفْقِ فَقَدْ أُعْطِيَ حَظَّهُ مِنْ خَيْرِ الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، وَصِلَةُ الرَّحِمِ وَحُسْنُ الْخُلُقِ وَحُسْنُ الْجِوَارِ، يَعْمُرَانِ الدِّيَارَ وَيَزِيدَانِ فِي الأَعْمَارِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: هەر کەسێك بەشێکی لە نەرمو نیانی پێدرابێ ئەوە بە دڵنیایی چاکەی خۆی پێبەخشراوە لە دنیاو دواڕۆژدا، وە پەیوەندی خزمایەتییو ڕەوشت جوانییو باشبوون لەگەڵ دراوسێ، وڵات ئاوەدان دەکاو تەمەنیش درێژ دەکات.**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «يَا نِسَاءَ الْمُسْلِمَاتِ! لاَ تَحْقِرَنَّ جَارَةٌ لِجَارَتِهَا وَلَوْ فِرْسِنَ شَاةٍ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەی ئافرەتانی مسوڵمانان! بە کەمی مەزانن (لە چاکە کردن)ی دراوسێ لەگەڵ دراوسێکەی دا ئەگەر بە گۆشتێکی کەمیش بێ کە بە ئێسکی مەڕەوەبێ! (چونکە پاداشتی لەسەر وەردەگرن).**

{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّ لِي جَارَيْنِ فَإِلَى أَيِّهِمَا أُهْدِي؟ قَالَ: «إِلَى أَقْرَبِهِمَا مِنْكِ بَاباً»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[3]

**واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ! من دوو دراوسێم هەن، ئایا دیاری بۆ کامیان ببەم؟ فەرمووی: بۆ ئەو دراوسێیەی کە دەرگاکەی لێت نیزیکترە.**

---

١) (رَوَاهُ أَحْمَد: (٢٥٢٩٨)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٥١٩))

٢) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ: (٢٤٢٧) وَاللَّفْظُ لَهُ، وَمُسْلِمٌ: (١٠٣٠))

٣) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٢٤٥٥))

{عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَيُّ الذَّنْبِ عِنْدَ اللهِ أَكْبَرَ؟ قَالَ: «أَنْ تَجْعَلَ للهِ نِدّاً وَهُوَ خَلَقَكَ»، قُلْتُ: ثُمَّ أَيّ؟ قَالَ: «ثُمَّ أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ خَشْيَةَ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ»، قُلْتُ: ثُمَّ أَيّ؟ قَالَ: «أَنْ تُزَانِي بِحَلِيْلَةِ جَارِكَ»} **حَديثٌ صَحيح**(١)

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، کە چ گوناهێك لە هەموو گوناهان گەورەترە؟ فەرمووی: ئەوە کە هاوتاو هاوبەش بۆ خوا دابنێی، لە حاڵێکدا کە هەر ئەو تۆی دروستکردوە، گوتم: ئەدی دوای ئەو؟ فەرمووی: پاشان منداڵەکەت بکوژی لە ترسی ئەوەی نانت لەگەڵ بخوات، گوتم ئەدی دوای ئەو؟ فەرمووی: زینا لەگەڵ ئافرەتی دراوسێت بکەی.**

{عَنْ عَبدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللهِ! مَتَى أَكُونُ مُحْسِناً ؟ قَالَ: «إِذَا قَالَ جِيرَانُكَ: أَنْتَ مُحْسِنٌ، فَأَنْتَ مُحْسِنٌ، وَإِذَا قَالُوا: إِنَّكَ مُسِيءٌ، فَأَنْتَ مُسِيءٌ»} **حَديثٌ صَحيحٌ**(٢)

**واتە: عەبدوڵڵا خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، کەی من چاکەکار دەبم؟ (واتە: کەی من بە کەسێکی چاکە کار دادەنرێم)؟ فەرمووی: ئەگەر دراوسێکانت پێیان گوتی: چاکەکار، ئەوە تۆ لە چاکەکارانی، وە ئەگەر گوتیان: تۆ خراپی، ئەوە تۆ لە خراپەکارانی.**

---

١) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ: (٤٤٨٣) وَاللَّفْظُ لَهُ، وَمُسْلِمٌ: (٨٦))

٢) (رَوَاهُ ابْنُ حِبَّانَ: (٥٢٥)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: إسنَادُهُ صَحِيح عَلَى شَرْطِ الشَيخَين)

{عَنْ عَبدِ اللهِ رَضِـيَ اللهُ عَنْـهُ قَـالَ: قَـالَ رَجُلٌ لِرَسُوْلِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) كَيْفَ لِـي أَنْ أَعْلَمَ إِذَا أَحسنتُ وَإِذَا أَسَأْتُ؟ قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِذَا سَمِعْتَ جِيْرَانَكَ يَقُولُونَ: أَنْ قَدْ أَحْسَنْتَ، فَقَدْ أَحْسَنْتَ، وَإِذَا سَمِعْتَهُمْ يَقُولُونَ: قَدْ أَسَأْتَ، فَقَدْ أَسَأْتَ»} **حديثٌ صحيحٌ**[1]

**واتە: عەبدوڵڵا خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێك بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوت: من چۆن بزانم کەسێکی چاکم یان کەسێکی خراپم؟ پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئەگەر گوێت لە دراوسێکانت بوو دەیانگوت: چاکی، ئەوە چاکیت، وە ئەگەر گوێت لێیان بوو دەیانگوت: خراپی، ئەوە تۆ خراپی.**

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِـيَ اللهُ عَنْـهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَمُوتُ، فَيَشْهَدُ لَهُ أَرْبَعَةُ أَهْلِ أَبْيَاتٍ مِنْ جِيرَتِهِ الأَدْنَيْنَ أَنَّهُمْ لا يَعْلَمُونَ إِلاَّ خَيْراً، إِلاَّ قَالَ اللهُ (جَلَّ وَعَلاَ): قَدْ قَبِلْتُ عِلْمَكُمْ فِيهِ، وَغَفَرْتُ لَهُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ»} **حَديثٌ صَحيحٌ**[2]

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر مسوڵمانێك بمرێ، چوار کەس لە دراوسێ نیزیکەکانی شایەدیی بۆ بدەن کە هیچ شتێکی لەبارەوە نازانن جگە لە چاکەو خێرنەبێ، ئەوە حەتمەن خوای پایە بەرز دەفەرموێ: بە تەئکید زانیاریی ئێوەم دەربارەی ئەو کەسە وەرگرتو، وە لێشی خۆشبووم لەوەی کە ئێوە نایزانن.**

---

٣) (رَوَاهُ ابْنُ مَاجَـهْ: (٤٢٢٣)، وَصَـحَّحَهُ العَلاَّمَـةُ الألبـاني فـي (السلسلة الصحيحة): (١٣٢٧))

١) (رَوَاهُ ابْنُ حِبَّـانَ: (٣٠١٥)، وَصَـحَّحَهُ العَلاَّمَـةُ الألبـاني، وَقَـالَ شعيب الأرنـؤوط: صَحِيح)

{وَعَنْ نَافِعِ بْنِ عَبْدِ الْحَارِثِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مِنْ سَعَادَةِ الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ: الْمَسْكَنُ الْوَاسِعُ، وَالْجَارُ الصَّالِحُ، وَالْمَرْكَبُ الْهَنِيُّ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتە: نافیعی کوڕی عەبدولحاریث خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە بەختەوەریی ئینسانی مسوڵمان ئەوەیە: خانوویێکی فرەوان‌و دراوسێیەکی باش‌و سواریەکی چاکی هەبێ.**

## بەسەرهاتێك لەم بارەیەوە

{كَانَ لِعَبْدِ اللهِ بْنِ الْمُبَارَكِ جَارٌ يَهُودِيٌّ فَأَرَادَ أَنْ يَبِيعَ دَارَهُ، فَقِيلَ لَهُ: بِكَمْ تَبِيعُ؟ قَالَ: بِأَلْفَينِ، فَقِيلَ لَهُ: لا تُسَاوِي إِلاَّ أَلفاً، قَالَ: صَدَقْتُمْ، وَلَكِن أَلفٌ لِلدَّارِ وَأَلفٌ لِجِوَارِ عَبْد اللهِ بْنِ الْمُبَارَكِ!! فَأُخْبِرَ ابْنُ الْمُبَارَك بِذَلِكَ فَأَعْطَاهُ ثَمَنَ الدَّارِ وَقَالَ: لا تَبِعْهَا}

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك دراوسێیەکی جوولەکەی هەبوو، دەیویست خانووەکەی بفرۆشێ، پێی گوترا: بە چەند دەیفرۆشی؟ گوتی: بە دوو هەزار، گوترا: ئاخر ئەوە هەر هەزار دێنێ، گوتی: ڕاست دەکەن، بەڵام هەزار هەقی خانووەکەو هەزاریش هەقی دراوسێیەکەم کە عەبدوڵڵای کوڕی موبارەکە!! کە ئەمە هەواڵە بە عەبدوڵڵا گەیشتەوە، پارەی خانووەکەی دا بە دراوسێیە جوولەکەکەی‌و گوتی: مەیفرۆشە.**

---

١) (رَوَاهُ الحَاكِمُ: (٤٢٩)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٣٧٩٥))

# پایەو پاداشتی
# ئاشتکردنەوەی نێوان خەڵك

ئاشتکردنەوەی نێوان خەڵك یەکێکە لە سیفەت هەرە بەرزەکانی ئینسانی ئیماندار، لەبەر ئەوەی فەرمانی خوای پەروەردگاری لەسەرە، جگە لەوەش ئیسلام بە گشتی لەو وشەوە سەرچاوەی گرتوە، ئیسلام لە (سلام)ەوە هاتوە، ئەویش یانی ئاشتی، کەواتە: هەر مسوڵمانێك کە بەو کارە هەڵدەستێ واتە: چاك لە ئیسلام حاڵی بووەو بەرجەستەی کردوە لە ژیانی خۆیدا، وە خوای پەروەردگاریش دەربارەی پاداشتی ئاشتکردنەوەی نێوان خەڵك دەفەرموێ:

﴿لَّا خَيۡرَ فِي كَثِيرٖ مِّن نَّجۡوَىٰهُمۡ إِلَّا مَنۡ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوۡ مَعۡرُوفٍ أَوۡ إِصۡلَٰحِۭ بَيۡنَ ٱلنَّاسِۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِ فَسَوۡفَ نُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمٗا ١١٤﴾ النساء

واتە: زۆربەی چپەچپیان خێری تێدانیە، مەگەر کەسێك فەرمان بە بەخشین‌و چاکەو ئاشتەوایی نێوان خەڵك بکات، وە هەر کەسێك بە مەبەستی وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا ئەوە بکات، لەمەودوا (لە دوارۆژدا) پاداشتێکی مەزنی دەدەینێ.

وە زۆر گرنگە لە کاتی ئاشتکردنەوەی نێوان خەڵك ئاگاداری نیازو مەبەستی نێو دڵمان بین، چونکە ئەو کارەش هەر ئەوەندە ئاسان نیە، بەڵکو تێگەیشتنی تایبەت‌و ئەزموونی تایبەتی دەوێ، کە خواو پێغەمبەر ﷺ بۆیان باسکردووین، هەروەها دەبێ تەماشای ئەزموونی ئەوانەی پێش خۆشمان بکەین کە بەم کارە هەڵساون‌و تێیدا سەرکەوتوو بوون، وەك گوتم: خۆ یەکلاکردنەوە لە دڵەوەو تەنیا مەبەستی خوا بوون‌و خۆ دوور گرتن لەوەی ناوبانگ پەیدا بکەین، یاخود سوودێکی تایبەتی خۆمان لەو

کارە ببینینەوە، ئەگەر وابوو ئەوە بە ئیزنی خوا ئەو ئاشتبوونەوە سەر دەگریٚ و بەردەوامیش دەبیٚ إنشاءالله.

بەڵام ئەگەر بۆ ڕیابازیی و بەرزبوونەوەی ناودەنگ و ناوبانگ بیٚ (خوا پەنامان بدات) ئەوە زۆر دوور دەکەوینەوە لەو پاداشتەی کە خوا فەرمووی:

﴿.. وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِ فَسَوۡفَ نُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمًا ١١٤﴾ النساء

واتە: وە هەر کەسێك بە مەبەستی وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا ئەوە بکات، (هەر کارێکی چاك بکات) لەمەودوا (لە دوارِۆژدا) پاداشتێکی مەزنی دەدەینیٚ.

هەروەها دەربارەی ئاشتکردنەوەی نێوان مسوڵمانان خوا دەفەرمویٚ:

﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَ أَخَوَيۡكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ١٠﴾ الحجرات

واتە: بێگومان ئیمانداران برای یەکدین، جا نێوان براکانی خۆتان چاك بکەن و، پارێز لە خوا بکەن، بەڵکو خواش ڕەحمتان پیٚ دەکات.

{عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِأَفْضَلَ مِنْ دَرَجَةِ الصِّيَامِ وَالصَّلاَةِ وَالصَّدَقَةِ؟»، قَالُوا: بَلَى، قَالَ: «إِصْلاَحُ ذَاتِ الْبَيْنِ، فَإِنَّ فَسَادَ ذَاتِ الْبَيْنِ هِيَ الْحَالِقَةُ»} **حديثٌ صحيحٌ**[1]

واتە: ئەبوو دەرداء خوا لێی ڕازی بیٚ، دەڵیٚ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئایا هەواڵتان پێدەدەم بە شتێك کە پلەی باشترو چاکتربیٚ لە نوێژو ڕۆژوو و صەدەقە؟! گوتیان: با، ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: ئاشتکردنەوەی نێوان خۆتان، چونکە

---

[1] (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٢٥٠٩)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٢٥٩٥))

دینداریيەکەتان بێ هێز ئاشووبی نێوانتان ئایینەکەتان دەتاشێ! (وەك ئەوەی بڵێ: دینداریيەکەتان بێ هێز دەبێ و بەرەو لە ناوچوون دەچێ).

{عَنْ أَبُو أَيُوبَ ، قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وسَلَّم): ((أَلاَ أَدُلُّكَ عَلَى صَدَقَةٍ يُحِبُّهَا اللهُ وَرَسُولُهُ؟ تُصْلِحُ بَيْنَ النَّاسِ إِذَا تَبَاغَضُوا وَتَفَاسَدُوا))} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[1]

**واتە: ئەبوو ئەییوب خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ئایا هەواڵتان پێنەدەم بۆ ئەنجامدانی خێرێك کە خواو پێغەمبەرەکەی خۆشیان بوێ؟ ئەویش: ئاشتکردنەوەی نێوان خەڵکە کاتێك کە لێك توورە دەبن و ئاشووب دەنێنەوە.**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): ((مَا عَمِلَ ابنُ آدَمَ شَيْئاً أَفْضَلَ مِنَ: الصَّلاَةِ، وَصَلاَحُ ذَاتِ الْبَيْنِ، وَخُلُقٍ حسنٍ))} **حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ**[2]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ کردەوەیەکی بەنی ئادەم نیە باشتربێ لە نوێژو چاککردنەوەو ئاشتکردنەوەی نێوان خۆیان و ڕەوشت جوانی.**

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): ((إِنَّ مِنَ النَّاسِ مَفَاتِيحَ لِلْخَيْرِ مَغَالِيقَ لِلشَّرِّ، وَإِنَّ مِنَ النَّاسِ مَفَاتِيحَ لِلشَّرِّ مَغَالِيقَ لِلْخَيْرِ، فَطُوبَى لِمَنْ جَعَلَ اللهُ مَفَاتِيحَ الْخَيْرِ عَلَى يَدَيْهِ، وَوَيْلٌ لِمَنْ جَعَلَ اللهُ مَفَاتِيحَ الشَّرِّ عَلَى يَدَيْهِ))} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[3]

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازای بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بێگومان هەندێ کەس لە خەڵکی هەن کەرەوەی دەرگای خێرن و**

---

١) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ: (٣٩٢٢)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألبَانِي فِي (صحيح الترغيب والترهيب): (٢٨٢٠))

٢) (رَوَاهُ البَيْهَقِيُّ فِي (شعب الإيمان): (١١٠٩١)، وَقَالَ الشيخ الألباني حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، أنظر: (السلسلة الصحيحة): (١٤٤٨))

٣) رَوَاهُ ابْنُ مَاجَةَ: (٢٣٧)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألبَانِي فِي (السلسلة الصحيحة): (١٣٣٢))

داخەری دەرگای شەڕن، وە هەندێ کەسیش هەن کەرەوەی دەگای شەڕنو داخەری دەرگای خێرن، ئنجا خۆشی بۆ ئەو کەسەی کە خوا کردنەوەی دەرگای خێری لەسەر دەستی ئەو گێڕاوە، وە سزای سەخت بۆ ئەو کەسەش کە خوا کردنەوەی دەرگای شەڕی لەسەر دەستی ئەو گێڕاوە.

{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْها، تَقُولُ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «إِنَّهُ خُلِقَ كُلُّ إِنْسَانٍ مِنْ بَنِي آدَمَ عَلَى سِتِّينَ وَثَلَاثِمَائَةِ مَفْصِلٍ فَمَنْ كَبَّرَ اللهَ، وَحَمِدَ اللَّهَ، وَهَلَّلَ اللهَ، وَسَبَّحَ اللهَ، وَاسْتَغْفَرَ اللهَ، وَعَزَلَ حَجَرًا عَنْ طَرِيقِ النَّاسِ، أَوْ شَوْكَةً أَوْ عَظْمًا عَنْ طَرِيقِ النَّاسِ، وَأَمَرَ بِمَعْرُوفٍ، أَوْ نَهَى عَنْ مُنْكَرٍ، عَدَدَ تِلْكَ السِّتِّينَ وَالثَّلَاثِمِائَةِ السُّلَامَي فَإِنَّهُ يَمْشِي يَوْمَئِذٍ وَقَدْ زَحْزَحَ نَفْسَهُ عَنِ النَّارِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەموو ئینسانێك لە وەچەی ئادەم کە دروست کراوە، لە سێ سەدو شەست جومگە پێك هاتووە، جا هەر کەسێك (اللهُ أَكْبَر، والْحَمْدُلله، وَلاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَسُبْحَانَ الله، وأَسْتَغْفِرُالله) بکات، یان بەردێك لەسەر ڕێگای خەڵکی لابدات، یان دڕکێك، یان ئێسکێك لەسەر ڕێگای خەڵکی لابدات، یان فەرمان بە چاکە بکات، یاخود ڕێگری خراپە بکات، بە ئەندازەی ئەو سێ سەدو شەست جومگانە ئەو ڕۆژە خۆی لە ئاگری دۆزەخ لاداوە دوور خستۆتەوە.**

---

[1] (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٢٣٧٧))

# قسەی ناڕاست ڕێی پێدراوە بۆ ئاشتكردنەوەی خەڵك

{عَنْ أُمِّ كُلْثُومٍ بِنْتَ عُقْبَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّهَا سَمِعَتْ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «لَيْسَ الْكَذَّابُ الَّذِي يُصْلِحُ بَيْنَ النَّاسِ فَيَنْمِي خَيراً، أَوْ يَقُولُ خَيراً»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتە: لە ئوممو كەلثومی كچی عوقبەوە خوا لێی ڕازی بێ، كە لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستووە فەرموویەتی: بە درۆزن دانانرێ ئەو كەسەی قسە ڕێك دەخاو نێوانی خەڵكی پێ چاك دەكاتەوەو لە نێوانیان قسە دێنێو دەبات، یان قسەی خێر دەكات.**

{عَنْ أُمِّ كُلْثُومٍ بِنْتَ عُقْبَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: مَا سَمِعْتُ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) يُرَخِّصُ فِي شَيْءٍ مِنَ الْكَذِبِ إِلاَّ فِي ثَلاَثٍ، كَانَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «لاَ أَعدُّهُ كَاذِباً: الرَّجُلُ يُصْلِحُ بِيْنَ النَّاسِ، يَقُولُ الْقَوْلَ وَلاَ يُرِيدُ بِهِ إِلاَّ الإِصْلاَحَ، وَالرَّجُل يَقُولُ فِي الْحَربِ، وَالرَّجُل يُحَدِّثُ امْرَأتَهُ، وَالْمَرأَةُ تُحَدِّثُ زَوْجَهَا»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

**واتە: ئوممو كەلثومی كچی عوقبە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: لە پێغەمبەری خوام ﷺ نەبیستووە كە ڕوخصەتی دابی درۆ بكرێ لە هیچ كاتێك تەنیا لە سێ شتاندا نەبێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: بە درۆزن دانانرێ ئەو كەسەی قسە ڕێك دەخاو نێوانی خەڵكی چاك دەكاتەوە، وە قسەیەك دەكات كە جگە لە خێر هیچ مەبەستی دیكەی نیە، وە پیاوێك كە قسەیەك دەكات لە كاتی جەنگدا (واتە: قسەكی ناڕاست دەكات بۆ ئەوەی ورەی سوپای دوژمن تێكبشێنێ)، وە پیاوێك قسەیەك دەكات (بۆ ئەوە دڵی ژنەكەی ڕابگرێ)، یاخود ژنێك قسەیەك بۆ پیاوەكەی دەگێڕێتەوە (بۆ ئەوەی دڵی ڕابگرێ).**

---

١) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ: (٢٥٤٦)، وَاللَّفْظُ لَهُ، وَمُسْلِمٌ: (٦٧٩٩))

٢) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (٤٩٢٣)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألبَانِي فِي (السلسلة الصحيحة): (٥٤٥))

# پایەو پاداشتی
# بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتی

کۆبوونەوەو هاوکاریی‌و تەبایی نێوان مسوڵمانان، وە سەردانی کردنی یەکدی‌و خۆشویستنی یەکدیان لەبەر خوا، فەرمانی خوای پەروەردگار، وەك لە سوورەتی (المائدة)دا خوا پەروەردگار ڕوو لە خەڵك دەکات بە گشتی دەفەرموێ: ﴿ وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ... ﴿٢﴾ ﴾، واتە: هاوکاری یەکدی بکەن لەسەر چاکەکاریی‌و پارێزکاریی.

بۆیە مسوڵمانی باش، دەبێ سەرمەشق بێ، لە پتەو کردنی ئەو تەبایی‌و، یەك ڕیزیی‌و، پەیوەندیی نێوان مسوڵمانان‌و، هەوڵی بەجێهێنانیان بدات، وە هەمیشە پێویستە ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوای ﷺ بە بیر خۆی بێنێتەوە کە بوخاریی‌و موسلیم لە عوروەوە گێڕاویانەتەوە کە ئەویش حەکیم بن حیزام هەواڵی پێداوە، کە بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوتوە: {يَا رَسُولَ اللهِ! أَرَأَيْتَ أُمُورًا كُنْتُ أَتَحَنَّثُ "التَّعَبُّدُ" بِهَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ مِنْ صَدَقَةٍ أَوْ عَتَاقَةٍ أَوْ صِلَةِ رَحِمٍ أَفِيهَا أَجْرٌ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَسْلَمْتَ عَلَى مَا أَسْلَفْتَ مِنْ خَيْرٍ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئەو کارانەی کە پێشتر لەسەردەمی نەزانیی (بە نیەتی) خواپەرستی کردوومە، لە صەدەقەو، ئازاد کردنی کۆیلەو، بەجێ هێنانی صیلەی ڕەحم، ئایا لەسەری پاداشتم دەدرێتێ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لەسەر ئەو کارانەی کە لە ڕابردوو کردووتە مسوڵمان بووی.

---

١) (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ: (١٣٦٩)، وَمُسْلِمٌ: (١٢٣))

وە (ابْنُ رَجَب)یش ڕەحمەتی خوا لێ بێ دەڵێ: (هَذا يَدلُ عَلَى أَنْ الكَافِر إِذَا عَمل حَسَنَةً فِي حَالِ كُفْرِهِ ثُمَّ أَسْلَمَ، فَإِنَّهُ يُثَابُ عَلَيْهَا) ئەوە بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە کەسی کافر کاتێك کردەوەیەکی چاك دەکات لە کاتی بێبڕوایی‌و پاشان دەبێتە مسوڵمان، ئەوە بە دڵنیایی پاداشتی بۆ هەیە، وە دەشڵێ: (وَرَجَحَ هَذَا القَوْل ابْنُ بَطال وَالقَرطِي وَغَيْرهما)، واتە: ئەم قسەیەی من هەردوو زانایان (ابْنُ بَطال وَالقَرطِي)و جگە لەوانیش بە پەسندیان زانیوە.

وە لە فەرمایشتێکدا هاتوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {لَاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ قَاطِعُ رَحِمٍ} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: هەر کەسێك پەیوەندی خزمایەتی بپچڕێنی ناچێتە بەهەشت.

**خوشك‌و برایانی شیرینم!**

ئەگەر کەسێك لەسەردەمی نەزانی‌و کوفرو شیرکەوە صیلەی ڕەحمی بەجێ هێنابێ‌و، پاداشتی لەسەر وەرگرتبێ، ئەدی ئەو کەسەی کە مسوڵمانەو لەبەر خاتری خوا ئەو پەیوەندیە ناپچڕێنێ‌و بەردەوام بەهێزی دەکات دەبێ چ پایەو پاداشتێکی هەبێ؟!!

ئایا ئەگەر کەسێك حەزی دەکرد پەیوەندی خزمایەتی جێبەجێ بکات‌و، وە کەسی دووەم پێی خۆش نەبوو پەیوەندی لەگەڵی هەبێ، وە پێی گوت: نامەوێ پەیوەندیم لەگەڵت هەبێ، ئەو کەسە بۆی هەیە چی بکات؟

وەڵام: هەق بە لایەنی کەسی یەکەمەوەیەو پاداشت بۆ ئەوە، بە مەرجێك کە بەیەکجاریی پەیوەندی لەگەڵ نەپچڕێنێ، لەبەر ئەو

---

١) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٥٦٣٨)، وَمُسْلِمٌ: (٦٦٨٥)، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ)

فەرمایشتە موبارەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە دەڵێ: {أَنَّ رَجُلاً قَالَ يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّ لِي قَرَابَةً أَصِلُهُمْ وَيَقْطَعُونِي، وَأُحْسِنُ إِلَيْهِمْ وَيُسِيئُونَ إِلَيَّ، وَأَحْلُمُ عَنْهُمْ وَيَجْهَلُونَ عَلَيَّ، فَقَالَ ﷺ: «لَئِنْ كُنْتَ كَمَا قُلْتَ، فَكَأَنَّمَا تُسِفُّهُمُ الْمَلَّ، وَلاَ يَزَالُ مَعَكَ مِنَ اللهِ ظَهِيرٌ عَلَيْهِمْ مَا دُمْتَ عَلَى ذَلِكَ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! من خزمی نیزیکم هەن پەیوەندیان پێوە دەکەم ئەوان دەیپچڕێنن، وە من چاکەیان لەگەڵ دەکەم کەچی ئەوان خراپن لەگەڵم، وە زۆر پەرۆشیانم‌و دەیانبوورم‌و چاوپۆشیان لێدەکەم، کەچی ئەوان زۆر نەزانانە قسەی بێجێم لەسەر دەکەن، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر وابیت کە گوتت، ئەوە وەك ئەوە وایە کە خۆڵەمێشی گەرمیان دەرخوارد بدەی، وە بەردەوام پشتیوانێکت لەلایەن خواوە لەگەڵدا دەبێ، مادام لەسەر ئەو حاڵەتە بیت.

بۆیە لەبەر ئەم فەرمایشتە وا باشە هەرگیز پەیوەندی خزمایەتی نەپچڕێنرێ‌و واز لە یەکدی نەهێنرێ.

وە خوای پەروەردگار لە چەندین ئایەتی قورئاندا ئاماژەی بە بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتی کردوە، بۆ وێنە، لە سووڕەتی (الرعد) فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢١﴾ وَٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٢﴾﴾

واتە: وە ئەوانەی کە پەیوەستی دەکەن هەرچی خوا فەرمانی داوە کە پەیوەستی بکرێ (وەك بەسەر کردنەوەی خزمان)، وە لە پەروەردگاریان دەترسن‌و لە خراپەو سەختیی لێپرسینەوە دەترسن . وە ئەوانەی ئارمیانگرت بۆ مەبەستی ڕەزامەندیی پەروەردگاریان، وە نوێژیان بەجێهێناوەو لەو ڕۆزییەش کە پێمان داون بەخشیوویانە بە

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٦٦٨٩))

نهێنی‌و ئاشکرا، وە بە چاکە ڕێگری لە خراپە دەکەن (واتە: بە چاکە کردن خراپەکانیان دەسڕنەوەو لادەبەن).

وە هەروەها لە سوورەتی (الروم)یشدا فەرموویەتی: ﴿ فَـَٔاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ وَجْهَ ٱللَّهِ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٣٨﴾ ﴾

واتە: خزم مافی خۆی پێبدە، هەروەها نەدارو ڕێبوارانی لێبڕاو، ئەوە بۆ کەسانێك کە ڕەزامەندیی خوایان دەوێ چاکترە، وە هەر ئەوانەن سەرفرازان.

وە پێغەمبەری خۆشەویستیش، چەندین فەرمایشتی بە نرخی فەرموون لەوبارەوە، کە بەڕاستی هەر یەکەی بۆ خۆی گەوهەرێك‌و مرواریییەکە، کە دەبنە هۆی ڕێکخستنی شیرازەی هەر کۆمەڵگایەك ئەگەر کاری پێ بکەن، وە زۆر فەرمایشت هەن باس لە پایەو پاداشتی ئەو کارە گەورە دەکەن، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا سزاو تووڕەیی زۆریش لەلایەن خواوە بۆ ئەو کەسە دانراوە کە هەڵناستن بە جێبەجێکردنی صیلەی ڕەحم‌و سەردانی کردنی خزمان‌و، بە پێچەوانەوە ئەم پەیوەندیە دەپچڕێنن! یەکێك لەوانە ئەم فەرمایشتەیە: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «تُعْرَضُ أَعْمَالُ النَّاسِ فِي كُلِّ جُمُعَةٍ مَرَّتَيْنِ يَوْمَ الإِثْنَيْنِ وَيَوْمَ الْخَمِيسِ فَيُغْفَرُ لِكُلِّ عَبْدٍ مُؤْمِنٍ إِلاَّ عَبْدًا بَيْنَهُ وَبَيْنَ أَخِيهِ شَحْنَاءُ، فَيُقَالُ: اتْرُكُوا هَذَيْنِ حَتَّى يَفِيئَا»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازای بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەموو هەفتەیەك دوو جار کردەوەکانی خەڵك پێشان دەدرێن لە ڕۆژی دووشەممەو لە ڕۆژی پێنج شەممە، وە خوا لە هەموو بەندەیەکی ئیماندار خۆش دەبێ تەنیا لەو بەندەیە خۆشنابێ کە لە

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٦٧١٢))

نێوان ئەوو براکەی ڕق و کینە هەبێ، خوای کاربەجێ (بە فریشتەکان) دەفەرموێ: وازیان لێ بێنن (گوناهەکانیان ڕەش مەکەنەوە) دوای بخەن هەتاکو ئاشت دەبنەوە، وە لە فەرمایشتێکی دیکەدا بەم شێوەیە هاتوە:
{عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «لاَ يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلاَثِ لَيَالٍ يَلْتَقِيَانِ، فَيُعْرِضُ هَذَا، وَيُعْرِضُ هَذَا، وَخَيْرُهُمَا الَّذِي يَبْدَأُ بِالسَّلاَمِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[١]

واتە: ئەبوو ئەییووبی ئەنصاری خوا لێی ڕازای بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دروست نیە بۆ پیاوی مسوڵمان زیاتر لە سێ شەو قسە لەگەڵ برای خۆی دابڕی، کاتێك بگەنە یەکدی ئەمیان ڕووی لێ وەرگێڕێ و ئەویان ڕووی لێ وەرگێڕێ، وە باشترینیان ئەوەیانە کە لە پێشدا دەست بە سەلام کردن دەکات لە براکەی خۆی.
{عَنْ ثَوْبَانَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ عَادَ أَخَاهُ لَمْ يَزَلْ فِي خُرْفَةِ الْجَنَّةِ» قِيلَ يَا رَسُولَ اللهِ! وَمَا خُرْفَةُ الْجَنَّةِ؟ قَالَ: «جَنَاهَا»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[٢]

واتە: ثەوبان خوا لێی ڕازی بێ، لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕێتەوە، کە فەرموویەتی: هەر کەسێك سەردانی برای مسوڵمانێکی بکات، ئەوە بەردەوام وەك ئەوەیە بچێ بۆ ڕنینی بەرهەمی میوەی بەهەشت، گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ! مەبەست لە ڕنینی بەرهەمی میوەی بەهەشت چییە؟ فەرمووی: لێکردنەوەی بەرهەمە پێگەیشتووەکانی دارەکانی بەهەشتە.
{عَنْ عَلِيٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَعُودُ مُسْلِمًا غُدْوَةً إِلاَّ صَلَّى عَلَيْهِ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ حَتَّى يُمْسِيَ، وَإِنْ عَادَهُ عَشِيَّةً إِلاَّ صَلَّى عَلَيْهِ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ حَتَّى يُصْبِحَ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[٣]

---

١) (رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ: (٥٧٢٧)، وَمُسْلِمٌ: (٦٦٩٧))
٢) (رَوَاهُ أَحْمَد: (٢٢٤٩٧)، وَمُسْلِمٌ: (٦٧١٩))
٣) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٩٦٩) وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٣٤٧٦))

واتە: هیچ مسوڵمانێك نیە كە بچێ سەردانی مسوڵمانێك بكات لە بەیانی، ئەوە حەتمەن حەفتا هەزار مەلائیكە دووعای بۆ دەكەن هەتا ئێواری، وە ئەگەر بەشەو سەردانی بكات، حەفتا هەزار مەلائیكە دووعای بۆ دەكەن هەتا بەیانی.

{عَنْ عَمْرِو بْنِ سَهْلٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «صِلَةُ الْقَرَابَةِ مَثْرَاةٌ فِي الْمَالِ، مَحَبَّةٌ فِي الأَهْلِ، مَنْسَأَةٌ فِي الأَجَلِ»} **حديثٌ صَحيحٌ**[1]

واتە: عەمری كوری سەهل خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: پەیوەندی خزمایەتی ڕزقو ڕۆزی زیاد دەكاتو بەرەكەتی تێدەخات، خۆشەویستی لە نێو خزمو كەسان دروست دەكات، تەمەنیش درێژ دەكاتو بەرەكەت دەخاتە تەمەنەوە.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ عَادَ مَرِيْضاً أَوْ زَارَ أَخاً لَهُ فِي اللهِ، نَادَاهُ مُنَادٍ أَنْ طِبْتَ وَطَابَ مَمْشَاك، وَتَبوَّأْتَ مِنَ الْجَنَّةِ مَنْزِلاً»} **حَديثٌ حَسَنٌ**[2]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازای بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك سەردانی نەخۆشێك، یان برایەكی خۆی بكات (بێ ئەوەی نەخۆش بێ) بانگبێژێك بانگ دەكاتو پێی دەڵێ: خۆشی بۆ خۆت، بە هۆی ئەم سەردانەتەوە، شوێنێكت لە بەهەشت بۆ خۆت مسۆگەر كرد.

{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ لَهَا: «اِنَّهُ مَنْ أُعطِىَ حَظَّهُ مِنَ الرِّفْقِ فَقَدْ أُعطِىَ حَظَّهُ مِنْ خَيْرِ الدُّنْيَا

---

١) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ في (الأَوْسَط): (٧٨١٠) وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٣٧٦٨))

٢) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٢٠٠٨) وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٢٥٧٨))

وَالآخِرَةِ، وَصِلَةُ الرَّحِمِ وَحُسْنُ الْخُلُقِ وَحُسْنُ الْجِوَارِ، يَعْمُرَانِ الدِّيَارَ وَيَزِيدَانِ فِي الأَعْمَارِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[١]

واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: هەر کەسێك بەشێکی لە نەرمو نیانی پێدرابێ ئەوە بە دڵنیایی چاکەی خۆی پێبەخشراوە لە دنیاو دواڕۆژدا، وە پەیوەندی خزمایەتییو ڕەوشت جوانییو باشبوون لەگەڵ دراوسێ، وڵات ئاوەدان دەکاو تەمەنیش درێژ دەکات.

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُعَظِّمَ اللهُ رِزْقَهُ، وَأَنْ يَمُدَّ فِي أَجَلِهِ، فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[٢]

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: هەر کەسێك حەز دەکات خوا ڕزقو ڕۆزی زۆربکات، وە تەمەنی درێژبێ، با پەیوەندی خزمایەتی جێبەجێ بکات.

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُمَدَّ لَهُ فِي عُمْرِهِ وَيُزَادَ لَهُ فِي رِزْقِهِ فَلْيَبَرَّ وَالِدَيْهِ وَلْيَصِلْ رَحِمَهُ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[٣]

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك حەز دەکات تەمەنیی درێژ بکرێتەوەو ڕزقو ڕۆزی بۆ زیادبێ، ئەوە با چاکە لەگەڵ دایكو بابی بکات، وە پەیوەندی خزمایەتی بەجێبهێنێ.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ، وَمَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيَقُلْ خَيْرًا أَوْ لِيَصْمُتْ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[٤]

---

١) (رَوَاهُ أَحْمَد: (٢٥٢٩٨)، وَصَحَّحَهُ العَلَّامَة الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٥١٩))

٢) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ: (١٩٦١)، وَمُسْلِمٌ: (٦٦٨٧)، وَأَحْمَد: (١٢٦١٠) وَاللَّفْظُ لَهُ)

٣) (رَوَاهُ أَحْمَد: (١٣٨٣٨)، وَحَسَّنَهُ العلامة الألباني)

٤) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٥٧٨٧))

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، با ڕێزی میوانی بگرێت، هەر کەسێك بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، با پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بگەیەنێ، هەر کەسێك بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، با قسەی خێرو چاك بکات یان بێ دەنگ بێ.**

{عَنْ أَبِي أَيُّوبَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ أَعْمَلُهُ يُدْنِينِي مِنَ الْجَنَّةِ، وَيُبَاعِدُنِي مِنَ النَّارِ، قَالَ: «تَعْبُدُ اللهَ لاَ تُشْرِكُ بِهِ شَيْئاً، وَتُقِيمُ الصَّلاَةَ وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ وَتَصِلُ ذَا رَحِمِكَ»، فَلَمَّا أَدْبَرَ، قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنْ تَمَسَّكَ بِمَا أُمِرَ بِهِ دَخَلَ الْجَنَّةَ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتە: ئەبوو ئەییوب خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: کارێکم پێ بڵێ: بیکەم پێی نیزیك ببمەوە لە بەهەشتیو دوورم بخاتەوە لە ئاگر، پێغەمبەر فەرمووی: خوا بپەرستەو هاوبەشی بۆ دامەنێ، نوێژ ئەنجام بدەو زەکاتی ماڵت بدە، پەیوەندی خزمایەتیت لەگەڵ نیزیکەکانت بە جێ بگەیەنە، دەڵێ: ئنجا کابرا هەڵساو ڕۆیی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئەوانەی فەرمانی پێکرا ئەنجامیان بداو دەستیان پێوە بگری، ئەوە دەچێتە بەهەشت.**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ أَصْبَحَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ صَائِمًا، قَالَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَا، قَالَ: «فَمَنْ تَبِعَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ جَنَازَةً»، قَالَ: أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَا، قَالَ: «فَمَنْ أَطْعَمَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ مِسْكِينًا»، قَالَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَا، قَالَ: «فَمَنْ عَادَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ مَرِيضًا»، قَالَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَا اجْتَمَعْنَ فِي امْرِئٍ إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (١١٥))
٢) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (١٠٢٨))

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: کێ لە ئێوە ئەمڕۆ بە ڕۆژوو بووە؟ ئەبوو بەکر خوا لێی ڕازی بێ گوتی: من، فەرمووی: ئەدی کێ لە ئێوە ئەمڕۆ بە دوای جەنازەی مردوویێك کەوتوە؟ ئەبوو بەکر خوا لێی ڕازی بێ گوتی: من، فەرمووی: ئەدی کێ لە ئێوە ئەمڕۆ نەدارێکی نان داوە؟ ئەبوو بەکر خوا لێی ڕازی بێ گوتی: من، فەرمووی: ئەدی کێ لە ئێوە ئەمڕۆ سەردانی نەخۆشێکی کردوە؟ ئەبوو بەکر خوا لێی ڕازی بێ گوتی: من، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: هەر کەسێك ئەو شتانەی تێدا کۆببنەوە ئەوە حەتمەن دەچێتە بەهەشتێ.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: «إِنَّ اللهَ تَعَالَى خَلَقَ الخَلْقَ، حَتَّى إِذَا فَرَغَ مِنْهُم، قَامَتِ الرَّحِمُ، قَالَتْ: هاذَا مَقَامُ العَائِذِ بِكَ مِنَ القَطِيعَةِ، قَالَ: نَعَمْ، أَما تَرْضَيْنَ أَنْ أَصِلَ مَنْ وَصَلَكِ، وَأَقْطَعَ مَنْ قَطَعَكِ؟ قَالَتْ: بَلَى يَا رَبِّ! قَالَ: فَذَلِكِ لَكِ» ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوٓا۟ أَرْحَامَكُمْ ﴿٢٢﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَىٰٓ أَبْصَـٰرَهُمْ ﴿٢٣﴾ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴿٢٤﴾﴾ محمد} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوای ئەوەی خوای بەرز دروست کراوەکانی دروست کرد، هەتا تەواوی کردن (رحم) هەڵسا (واتە: خزمایەتی هەڵستا) گوتی: ئێرە شوێنێکە، کاتێك پەنات پێ دەبردرێت لە پچڕاندن، پەنا دێنمە بەر تۆ لەوەی کە بپچڕێنرێم، خواش فەرمووی: بەڵێ، ئایا ڕازی نابی کە هەر کەسێك تۆ بگەیەنێ منیش

---

١) (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ: (٥٦٤١)، وَمُسْلِمٌ: (٦٦٨٢))

بیگەیەنم؟! (واتە: بیگەیەنم بەڕەحمەتی خۆم)، وە هەر کەسێك تۆ بپچڕێنێ منیش بیپچڕێنم (واتە: بەزەیی خۆمی لێ دوور بخەمەوە)؟! خزمایەتی گوتی: بەڵێ، خواش فەرمووی: ئەوە بۆ تۆ بێ، واتە: هەر کەسێك پەیوەندی خزمایەتی بگەیەنێ خوا ڕەحمەتی خۆی پێ دەگەیەنێ، هەر کەسێك پەیوەندی خزمایەتی بپچڕێنێ خوای بەرز بەزەیی لێ دادەبڕێنێ، دوایی فەرمووی: ئەگەر دەتانەوێ بزانن، ئەمە بخوێننەوە: ﴿ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ ﴿٢٢﴾ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَىٰ أَبْصَارَهُمْ ﴿٢٣﴾ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا ﴿٢٤﴾ ﴾.

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «ألاَّ أُخْبِرُكُم بِرِجَالِكُمْ فِي الجَنَّةِ»؟ قَالوا: بَلَى، يَا رسُولَ الله! فَقَالَ عَلَيْهِ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَمَ: «النَّبيُّ فِي الجَنَّةِ، وَالصِدِّيقُ فِي الجَنَّةِ، وَالرَّجُلُ يَزُورُ أَخَاهُ فِي نَاحِيَةِ المِصْر فِي الجَنَّةِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[1]

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا هەواڵتان نەدەمێ بە پیاوەکانتان لە بەهەشتێ؟ گوتمان: با، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: پێغەمبەر لە بەهەشتە، ڕاستگۆ لە بەهەشتە، وە پیاوێك سەردانی برایەکی کرد (لە پێناوی خوا) لە ناوچەی میصر ئەویش لە بەهەشتە، (واتە: بە هۆی ئەوەی سەردانی ئەو برا مسوڵمانەی کردوە چۆتە بەهەشت!).**

١) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي (الأوسط): (١٧٤٣)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٢٨٧))

# پایەو پاداشتی

## گریان لە ترسی خوا

پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو کەسێك زیاتر لە خوای باڵادەست ترساوە، لە کاتێکدا بەردەوام لە گوێڕایەڵی خواش دابووە، نوێژی کردوە، ڕۆژووی گرتوە، قورئانی خوێندوە، بەردەوامیش سەرگەرمی بانگەوازیو ئەنجامدانی کاری چاك بووە، داوای لێبوردنو لێخۆشبوونی لە خوا کردوەو دووعاشی کردوە، کەواتە: گریان لە ترسی خواو بە ئومێدی بەزەیی هاتنەوەو لێبوردنی خوا، شتێکی زۆر باشە، بەڵام چەند جۆرە گریانێك هەیە کە دەبێ لێك جیابکرێنەوە، ئەو گریانانەی باشن:

- گریان لە ترسو سامو هەیبەتی خوا.
- گریان لە کاتی گوێگرتنی قورئانو موچڕکە هاتن بە جەستەدا.
- گریان لە کاتی بیر کردنەوە لەو وەعدانەی کە خوا بە خراپەکارانی داوە بە سزای سەخت.
- گریان لە کاتی مردنی کەسێکی خۆشەویستو نیزیك.

ئەو جۆرە گریانانە هەموویان باشن، بەڵام گریانیش هەیە خراپە، وەك:

- گریانێکی دروست کراوو ڕیابازانە بۆ ئەوەی خەڵك ببینێ.
- گریانێك کە ڕەخنەگرتن لە قەدەری خوای تێدابێ.
- گریانێك کە دەنگ بەرزکردنەوەو هاوار کردنی لەگەڵ دابێ.

لە قورئانی بەپێزیشدا مەدحی ئەو بەندانە کراوە کە لە گوێڕایەڵی خوادانو بە ترسەوە بەندایەتیەکی ساغو صافو بێ خڵتە بۆ خوا دەکەن، خوا دەربارەیان دەفەرموێ:

﴿إِنَّ الَّذِينَ هُم مِّنْ خَشْيَةِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ ﴿٥٧﴾ وَالَّذِينَ هُم بِآيَاتِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٨﴾ وَالَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمْ لَا يُشْرِكُونَ ﴿٥٩﴾ وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوا وَّقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُمْ إِلَىٰ رَبِّهِمْ رَاجِعُونَ ﴿٦٠﴾ أُولَٰئِكَ يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَهُمْ لَهَا سَابِقُونَ ﴿٦١﴾﴾ المؤمنون

واتە: ئەوانەی لە ترسی پەروەردگاریان هەمیشە دەترسن، وە ئەو کەسانەش کە بە ئایەتەکانی پەروەردگاریان بڕوا دێنن، وە ئەو کەسانەش کە هاوبەش بۆ خوا دانانێن، وە ئەو کەسانەی کە لەوەی خوا پێی داون دەبەخشن، لە کاتێکدا کە دڵیان دەلەرزێو موچڕکەی پێدادێ لە ترسان چونکە دڵنیان کە بۆ لای پەروەردگاریان دەگەڕێنەوە، ئا ئەوانەن پەلە دەکەن لە ئەنجامدانی کاری چاک، وە ئەوانە بۆ ئەنجامدانی کاری چاک لە پێشن (و پێشبڕکێ دەکەن).

وە خوای پەروەردگار پایەو پاداشتێکی یەکجار گەورەی بۆ ئەو کەسە داناوە کە لە خوا دەترسێ، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾ الرحمن ﴾

واتە: وە بۆ کەسێك کە لە وەستانی بەر دەستی خوای پەروەردگار دەترسێ دوو باغی بۆ هەیە.

لە ڕاستیدا ترسان لە خوا کۆکەرەوەی هەموو سیفەتە باشەکانە لە ئینسان، چونکە ئەوە سیفەتی فریشتە زۆر نیزیکەکانە لە خوای پەروەردگار، وەك دەفەرموێ: ﴿ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴿٥٠﴾ النحل ﴾، واتە: (فریشتەکان) لە پەروەردگاریان دەترسن کە لەلای سەروویانەوەیە، وە هەر فەرمانێکیان پێبکرێ جێبەجێی دەکەن.

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «عَيْنَانِ لا تَمسهما النَّار أَبدًا عَيْنٌ بَكَتْ مِنْ خَشْيَةِ الله، وَعَيْنٌ بَاتَتْ تَحْرُسُ فِي سَبِيلِ الله»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دوو چاو ئاگر نایانگرێ: چاوێك بگرییێو، فرمێسکی لێبێ لە ترسی خوا، وە چاوێك شەوێ ئیشکگربێ لە پێناوی خوا.

١) (رَوَاهُ أَبُو يَعْلَى: (٤٣٤٦)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألبَاني فِي (صحيح الجامع): (٤١١٣))

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «لاَ يَلِجُ النَّارَ رَجُلٌ بَكَى مِنْ خَشْيَةِ اللهِ» } **حديثٌ صحيحٌ**[1]

واته: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرموویەتی: ناچێتە نێو ئاگر ئەو پیاوەی (یان ئەو ژنەی) لە ترسی خوا گریاوە.

{عَنْ أَبِي أُمَامَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «لَيْسَ شَيْءٌ أَحَبَّ إِلَى اللهِ مِنْ قَطْرَتَينِ وَأَثَرَينِ، قَطْرَةٌ مِنْ دُموعٍ فِي خَشْيَةِ اللهِ، وَقَطْرَةُ دَمٍ تُهْرَاقُ فِي سَبِيلِ اللهِ وَأَمَّا الأَثْرَانِ: فَأَثَرٌ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَأَثَرٌ فِي فَرِيْضَةٍ مِنْ فَرَائِضِ اللهِ» } **حديثٌ حسنٌ**[2]

واته: ئەبی ئومامە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هیچ شتێك نیە خۆشەویستربێ لای خوا لە دوو دڵۆپ‌و دوو شوێنەوار، دڵۆپە فرمێسکێك لە ترسی خوا، وە دڵۆپە خوێنێك كە بڕژێ لە پێناوی خوا، وە دوو شوێنەوارەكانیش: شوێنەوارێك لە جیهاد لە پێناوی خوادا، وە شوێنەوارێك كە لە ئەنجامی بەجێهێنانی یەكێك لە فەرزەكانی خوای پەروەردگار پەیدادەبێت.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللهُ فِى ظِلِّهِ يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ، الإِمَامُ الْعَادِلُ، وَشَابٌّ نَشَأَ بِعِبَادَةِ اللهِ، وَرَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ فِي الْمَسَاجِدِ، وَرَجُلاَنِ تَحَابَّا فِي اللهِ اجْتَمَعَا عَلَيْهِ وَتَفَرَّقَا عَلَيْهِ، وَرَجُلٌ دَعَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وَجَمَالٍ، فَقَالَ: إِنِّي أَخَافُ اللهَ، وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ فَأَخْفَاهَا حَتَّى لاَ تَعْلَمَ يَمِينُهُ مَا تُنْفِقُ شِمَالُهُ، وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللهَ خَالِيًا فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ» } **حديثٌ صحيحٌ**[3]

واته: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: حەوت جۆرە كەس هەن خوا دەیانخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە، لەو ڕۆژەدا هیچ سێبەرێك نیە

---

[1]) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٢٣١١)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٧٧٧٨))

[2]) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (١٦٦٩)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (١٣٢٦))

[3]) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٦٤٢١)، وَمُسْلِمٌ: (٢٤٢٧))

جگە لە سێبەری وی، (ئەوانیش:) پێشەواو دەسەڵاتدارێکی دادگەر، وە گەنجێك کە گەنجێتییەکەی لە عیبادەتی خوادا بەسەربردبێ، وە پیاوێك کە دڵی پەیوەست بێت بە مزگەوتەوە، وە دوو پیاو لەبەر خوا یەکدیان خۆشبوێ و لەبەر خوا کۆببنەوەو لەبەر خوا لەیەکدی جیاببنەوە، وە پیاوێك ئافرەتێکی جوان و خاوەن دەسەڵات بانگی بکات (بۆ مەبەستی ئەنجامدانی کاری خراپ)، ئەویش بڵێ: من لە خوا دەترسم، وە پیاوێك خێرو چاکە بکات بە جۆرێك کە لای ڕاستی نەزانێ لای چەپی چی بە خشیوە (لە گێڕانەوەی دیکە هاتوە: لای چەپی نەزانێ لای ڕاستی چی بەخشیوە)، وە پیاوێك بە تەنیابێ لە شوێنێکی چۆڵ زیکرو یادی خوا بکات و بگریێ و فرمێسك بە چاوەکانی دا بێنە خوار لە ترسی خوا (عَزَّ وَجَلَّ).

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ خَافَ أَدْلَجَ، وَمَنْ أَدْلَجَ بَلَغَ الْمَنْزِلَ، أَلا إِنَّ سِلْعَةَ اللهِ غَالِيَةٌ، أَلاَ إِنَّ سِلْعَةَ اللهِ الْجَنَّةُ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[1]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرموویەتی: هەرکەسێك بترسێ بەڕێ دەکەوێ و دەڕوات، هەرکەسێکیش بەڕێ بکەوێ دەگاتە مەنزلگا (واتە: بەهەشت)، ئاگاداربن کاڵای خوا بەرزو بە نرخە، وە ئاگاداریش بن کاڵای خوا بەهەشتە.

{عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، قَالَ: «لَقَدْ دَخَلَ الْجَنَّةَ رَجُلٌ مَا عَمِلَ خَيْرًا قَطُّ، قَالَ لأَهْلِهِ حِينَ حَضَرَتْهُ الْوَفَاةُ: إِذَا أَنَا مِتُّ فَأَحْرِقُونِي، ثُمَّ اذْرُونِي نِصْفِي فِي الْبَرِّ وَنِصْفِي فِي الْبَحْرِ، فَأَمَرَ اللهُ الْبَرَّ وَالْبَحْرَ فَجَمَعَاهُ، فَقَالَ: مَا حَمَلَكَ عَلَى مَا صَنَعْتَ؟ قَالَ: مَخَافَتُكَ قَالَ: فَغَفَرَ لَهُ لِذَلِكَ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

---

١) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٢٤٥٠)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٢٨٧))

٢) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ: (٣٢٩١)، وَمُسْلِمٌ: (٧١٥٧)، وَأَحْمَد: (١١١١١) وَاللَّفْظُ لَهُ، تعليق شعيب الأرنؤوط: حَدِيثٌ صَحِيحٌ)

واتە: ئەبوو سەعیدی خودری خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پیاوێك چووە بەهەشت بێ ئەوەی هیچ کارێکی چاکی کردبێ، پێش ئەوەی بمرێ بە منداڵەکانی گوت: ئەگەر مردم لاشەکەم بسووتێنن، دوایش خۆڵەمێشەکەشی نیوەی بخەنە نێو دەریاو نیوەی بخەنە بیابان، دوایی خوا فەرمانی بە وشکانیو دەریا کرد خۆڵەمێشەکەیان (کۆکردەوەو پیاوەکە دروست بۆوە) خوا پێی فەرموو: بۆچی وات کرد؟ گوتی: خوایە لە ترسی تۆ، خواش لێی خۆش بوو.

## گریانی پێغەمبەر ﷺ لە کاتی گوێگرتن بۆ قورئان

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ مَسعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، «اقْرَأْ عَلَيَّ سُورَةَ النِّسَاءِ»، قَالَ قُلْتُ: أَقْرَأُ عَلَيْكَ وَعَلَيْكَ أُنْزِلَ؟ قَالَ: «إِنِّي أُحِبُّ أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِي»، قَالَ: فَقَرَأْتُ عَلَيْهِ حَتَّى إِذَا انْتَهَيْتُ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ ﴾النساء، الآيَةَ حَسْبُكَ الآنَ، فَرَفَعْتُ رَأْسِي فَإِذَا عَيْنَاهُ تَهْمِلَانِ} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: قورئانم بەسەردا بخوێنە، دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! من بەسە تۆدا بخوێنم کە بە سەر تۆدا دابەزێنراوە؟! فەرمووی: بەڵێ، حەز دەکەم گوێم لێ بێ لە غەیری خۆمەوە، دەڵێ: قورئانم بەسەردا خوێند، تا گەیشتمە ئەو ئایەتە کە

١) (رَوَاهُ أَحْمَد: (٢٥٥٨٠)، وَالبُخَارِيُّ: (٤٣٠٦)، وَمُسْلِمٌ: (١٩٠٣))

دەفەرموێ: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ ﴾

دەڵێ: فەرمووی: ئێستا بەسە، ئنجا تەماشام کرد فرمێسک لە چاوەکانیدا دەهاتە خوارێ.

## گریانی پێغەمبەر ﷺ

## لە کاتی قورئان خوێندن

{عَنْ عَطَاء قَالَ: انْطَلَقْتُ أَنَا وَابْنُ عَمْرُ وَعُبَيْدُ بْنُ عُمَيْرٍ إِلى عَائِشَةَ، رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، فَدَخَلْنَا عَلَيْهَا وَبَيْنَنَا وَبَيْنَهَا حِجَابٌ، فَقَالَتْ: يَا عُبَيْدُ، مَا يَمْنَعُكَ مِنْ زِيَارَتِنَا؟ قَالَ: قَولُ الشَّاعِرِ: زُرْ غِبَّاً تَزْدَدْ حُبّاً ... فَقَالَ ابْنُ عُمَر: ذَرِيْنَا أَخْبِرِيْنَا بِأَعْجَبِ شَيْءٍ رَأَيْتِهِ مِنْ رَسُولِ الله ﷺ، فَبَكَتْ وَقَالَتْ: كُلُّ أَمْرِهِ كَانَ عَجَباً، أَتَانِي فِي لَيْلَتِي حَتَّى مَسَّ جِلْدُهُ جِلْدِي، ثُمَّ قَالَ: «ذَرِينِي أَتَعَبَّدُ لِرَبِّي عَزَّ وَجَلَّ»؟ قَالَتْ: فَقُلْتُ: وَاللهِ إِنِّي لأُحِبُّ قُرْبَكَ، وَإِنِّي أُحِبُّ أَنْ تَعَبَّدَ لِربِّك، فَقَامَ إِلى القِرْبَةِ فَتَوَضَّأَ وَلَمْ يُكْثِرْ صَبَّ الْمَاءِ، ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي، فَبَكَى حَتَّى بَلَّ لِحْيَتَهُ، ثُمَّ سَجَدَ فَبَكَى حَتَّى بَلَّ الأَرْضَ، ثُمَّ اضْطَجَعَ عَلَى جَنْبِهِ فَبَكَى، حَتَّى إِذَا أَتَى بِلاَلٌ يُؤْذِنُهُ بِصَلاَةِ الصُبْحِ قَالَتْ: فَقَالَ: يَا رَسُولُ الله، مَا يُبْكِيكَ؟ وَقَدْ غَفَرَ اللهُ لَكَ ذَنْبَكَ مَا تَقَدَّمَ وَمَا تَأَخَّر، فَقَالَ: «وَيْحَكَ يَا بِلاَلُ، وَمَا يَمْنَعُنِي أَنْ أَبْكِيَ وَقَدْ أُنْزِلَ عَلَيَّ فِي هَذِهِ اللَّيلَةِ: ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِّأُولِي الْأَلْبَابِ ﴿١٩٠﴾ آل عمران ﴾» ثُمَّ قَالَ: «وَيْلٌ لِمَنْ قَرَأَهَا وَلَمْ يَتَفَكَّرُ فِيهَا»} **حديثٌ حسنٌ**[1]

واتە: عەطاء ڕەحمەتی خوا لێ بێ دەڵێ: من و ئیبنو عەمر (واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص) وە عوبەیدی کوڕی عومەیر (خوا

١) (رَوَاهُ ابْنُ حِبَّان: (٦٢٠) وَالْمُنذِرِي وَحَسَّنَهُ العلامة الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٦٨))

لێیان ڕازی بێ) چووین بۆ لای عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، چووینە ژوور (دایکمان عائیشە بە عوبەیدی کوڕی عومەیری) گوت: چ شتێك ڕێت لێ دەگرێ کە زیاتر سەردانمان بکەی؟ ئەویش گوتی: قسەی شاعیر کە دەڵێ: (زُرْ غِبّاً تَزْدَدْ حُبّاً) واتە: کەم کەم سەردان بکە بۆ ئەوەی کە زیاتر خۆشەویستیت زیاد بکات، ئنجا ئیبنو عەمڕ گوتی: لێمانگەڕێ ئەی دایکی ئیماندااران، هەواڵمان پێبدە بە سەرسووڕهێنەرترین شت کە لە پێغەمبەری خوات ﷺ بینیوە؟ ئەویش گریاو گوتی: حاڵو ئیشو کاری پێغەمبەر ﷺ هەمووی جێی سەرسووڕمان بوو، شەوێکیان هاتە لام هەتاکو دەستم بە دەستی کەوتو پێستی بە پێستم کەوت، دوایی گوتی: ڕێگەم بدە با بچم پەروەردگاری پایەبەرزو مەزنم بپەرستم، دەڵێ: منیش گوتم: بە خوا حەز دەکەم لێم نیزیك بی (نیزیکی تۆم پێ خۆشە)، بەڵام پێشم خۆشە پەروەردگاریشت بپەرستی، ئیدی هەڵسا کوندەیەك، ئاو لەوێ بوو دەستنوێژی لێگرت، بەڵام زۆری لێ بەکارنەهێنا، پاشان هەڵسا شەونوێژی کرد بە پێوە گریا تا ڕیشی موبارەکی بە فرمێسکان تەڕ بوو، دوایی سەجدەی برد لە سەجدەش دا گریا هەتاکو زەوییەکەی تەڕ کرد، دوایی ڕاکشا لەسەر تەنیشت دیسان گریا (واتە: دوای ئەوەی کە شەو نوێژەکەی تەواو کردوە)، هەتا دوایی بیلال هات بۆ نوێژی بەیانی، دەڵێ: بیلال گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ چ شتێك تۆ دەگریەنێ، خۆ خوا لە هەموو گوناهەکانی ڕابردوو داهاتووت خۆشبووە؟ فەرمووی: سەلامەت بی بیلال چ شتێك ڕێم لێ دەگرێ کە بگریەم، وە ئەمشەو ئەم ئایەتەم بۆ هاتۆتە خوار: ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ آل عمران ﴾.

## بەسەرهاتێك لەمبارەیەوە (١)

{عَنْ أَفْلَح مَولى مُحَّمَد بْنِ عَلَيَّ قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ مُحَمَّد بْنِ عَلَي حَاجَاً، فَلَمَّا دَخَلَ إِلى الْمَسْجِدِ الحَرَامِ نَظَرَ إِلى البَيْتِ فَبَكَى حَتَّى عَلا صَوْتَه فَبَكَى النَّاس لِبكَائِهِ فَقِيلَ لَهُ: لَوْ رَفقتَ بنَفْسِكَ قَلَيلاً؟ فَقَالَ لَهُمْ: أَبْكَي لَعَلَّ الله يَنْظُر إِليّ مِنْهُ بِرَحْمَةٍ، فَأَفُوزَ بِهَا غَداً، قَالَ: ثُمَّ طَافَ بِالبَيْتِ حَتَّى جَاءَ فَرَكَعَ عِنْدَ الْمَقَام فَرَفَعَ رَأْسَهُ مِن سُجُودِهِ فَإِذَا مَوضِعَ سجُودِهِ مبتلا كُلّه مِنْ دمُوعِهِ}.

واتە: ئەفلەحی مەولای موحەممەدی كوڕی عەلی، دەڵێ: لەگەڵ موحەممەدی كوڕی عەلی چووینە حەجێ، كاتێك چووینە نێو مزگەوتی حەڕام، تەماشای كەعبەی كردو دەستی بە گریانێ كرد، (هێندە بە كوڵ) گریا هەتا دەنگی بەرز بۆوە، خەڵكەكەش بە هۆی گریانی ئەو دەستیان بە گریانێ كرد، پێیان گوت: خۆزگە هەندێك بەزەییت بە خۆتدا دەهاتەوەو (ئەوەندە زۆر نەدەگریای)؟ پێی گوتن: من بۆیە دەگریم تاكو خوای پەروەردگار بە چاوی بەزەییەوە تەماشام بكات‌و بەو هۆیەوە لە دوارۆژ پێی سەرفراز بم، (ئەفلەح) دەڵێ: پاشان تەوافی كرد بە دەوری كەعبە، هەتا لە شوێن پێی ئیبڕاهیم ڕكووعی بردو (دوایی سەجدە برد)، پاشان سەری بەرز كردەوە لە سەجدەكەی شوێنی سەجدە بردنەكەی تەڕ ببوو لەبەر فرمێسكەكانی.

---

١) المجالسة والجواهر العلم، ج١، ص٤٦٠.

# پایەو پاداشتی خۆشویستن لەبەر خوا

بێگومان خۆشویستنی نێوان بەندەکانی خوای پەروەردگار هۆکاری جیاوازی هەیە، هەر یەکێك بۆ مەبەستێك کەسێك دەکاتە دۆست‌و خۆشی دەوێ، ئنجا بەردەوام بوونی ئەم خۆشەویستی‌و برادەراتیەش پەیوەستە بە ئەسڵ‌و هۆکارەکانی دروستبوونی ئەم پەیوەندیە، وە بە دڵنیاییش تەنیا ئەو پەیوەندیانە بەردەوام دەبن کە بۆ خوای گەورە دروست دەبن‌و لە دنیا سەرکەوتوو سەرفراز دەبن، وە لە دوارۆژیش جێگای شانازی کردن بەیەکدی دەبن، چونکە هەریەکەیان بوونەتە هۆی چوونە بەهەشتی ئەویدیکەیان‌و لەو ڕۆژەشدا هیچ غەم‌و پەژارەیەکیش نایانگرێتەوە، وەك خوای پەروەردگار دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿ ٱلۡأَخِلَّآءُ يَوۡمَئِذِۭ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلۡمُتَّقِينَ ٦٧ يَٰعِبَادِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ ٦٨ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ مُسۡلِمِينَ ٦٩ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ أَنتُمۡ وَأَزۡوَٰجُكُمۡ تُحۡبَرُونَ ٧٠ يُطَافُ عَلَيۡهِم بِصِحَافٖ مِّن ذَهَبٖ وَأَكۡوَابٖۖ وَفِيهَا مَا تَشۡتَهِيهِ ٱلۡأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلۡأَعۡيُنُۖ وَأَنتُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٧١ وَتِلۡكَ ٱلۡجَنَّةُ ٱلَّتِيٓ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ٧٢ لَكُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ كَثِيرَةٞ مِّنۡهَا تَأۡكُلُونَ ٧٣ ﴾ الزخرف

واتە: دۆست‌و خۆشەویستەکان لەو ڕۆژەدا دوژمنی یەکترن جگە لە پارێزکاران . (پێیان دەگوترێ:) ئەی بەندەکانم ئەمڕۆ هیچ مەترسیەکتان لەسەر نیە، وە خەفەتیش ناخۆن . ئەوانەی ئیمانیان بە ئایەتەکانی ئێمە هێناوەو هەمیشە گەردن کەچن . (لەو ڕۆژە پێیان دەڵێن:) بچنە بەهەشتەوە ئێوەو هاوسەرەکانتان (ڕێز دەگیرێن‌و) دڵ خۆش دەکرێن . بە سینی‌و پەرداخی ئاڵتونی (خواردن‌و خوارنەوە) دەگێڕن بەسەریاندا وە لەو بەهەشتەدا هەیە ئەوەی دڵ حەزی لێ بکات‌و چاو لەززەت لە بینینی بکات، وە ئێوە بە هەتا هەتایی دەمێننەوە تێیدا . ئەوە ئەو بەهەشتەیە کە بۆ ئێوە ماوەتەوە (پێتان دراوە) بە هۆی ئەو کردەوانەی کە دەتانکرد . بۆ ئێوە هەیە تێیدا میوەجاتی زۆر کە لێیان دەخۆن.

ئنجا دەبێ ئینسانی مسوڵمان زۆر وریابێ له دەست نیشانکردنی برادەر، یان لەگەڵ دا بوونی هەر گروپ‌و تاقم‌و لایەنێك، لەبەر ئەم فەرمایشتانەی پێغەمبەر ﷺ: {عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُوْلِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فَقَالَ: يَا رَسُوْلَ اللهِ! كَيْفَ تَقُولُ فِي رَجُلٍ أَحَبَّ قَوْماً وَلَمْ يَلْحَقْ بِهِمْ؟ فَقَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «الْمَرءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: ئەبی وائیل دەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود خوا لێیان ڕازی بێ، گوتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! چی دەڵێی دەربارەی پیاوێك، کە قەومێکی خۆشدەوێ‌و لەگەڵیان نیە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مرۆڤ (له ڕۆژی دوایی) لەگەڵ ئەو کەسە دایە کە خۆشی دەوێ.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «الرَّجُلُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[2]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پیاو لەسەر دینی دۆست‌و برادەریەتی، جا با هەر یەك له ئێوە باش تەماشا بکات کێ دەکات بە دۆست‌و برادەری خۆی!

{عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «لاَ تُصَاحِبْ إِلاَّ مُؤْمِنًا وَلاَ يَأْكُلْ طَعَامَكَ إِلاَّ تَقِيٌّ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[3]

واتە: ئەبوو سەعید خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: برادەرایەتی کەس مەکە جگە لە ئیماندار، وە با نانیشت نەخوا جگە لە کەسی بە تەقواو پارێزکار.

---

١) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ: (٥٨١٧)، وَاللَّفْظُ لَهُ، مُسْلِمٌ: (٦٨٨٨))

٢) (رَوَاهُ أَبُودَاوُدَ برقم: (٤٨٣٧)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٩٢٧))

٣) (رَوَاهُ أَبُودَاوُدَ برقم: (٤٨٣٤)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٣٠٣٦)).

{عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «الْمُتَحَابُّونَ فِي اللهِ، فِي ظِلِّ الْعَرْشِ يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ، يَغْبِطُهُمْ بِمَكَانِهِمْ النَّبِيُّونَ وَالشُّهَدَاءِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: موعاذی کوڕی جەبەل خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: بیستم لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: ئەو کەسانەی لەبەر خوا یەکدیات خۆش دەوێ لە ژێر سێبەری عەرشی خوای بێ وێنە دان، لەو ڕۆژەدا هیچ سێبەرێك نیە جگە لە سێبەری عەرش، وە پێغەمبەران‌و شەهیدان خۆزگەیان پێ دەخوازن کە ئەوانیش شوێنیان وەك وان بایە.

{أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللهِ لأُنَاسًا مَا هُمْ بِأَنْبِيَاءَ، وَلاَ شُهَدَاءَ، يَغْبِطُهُمُ الأَنْبِيَاءُ وَالشُّهَدَاءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِمَكَانِهِمْ مِنَ اللهِ تَعَالَى»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! مَنْ هُمْ؟ قَالَ: «هُمْ قَوْمٌ تَحَابُّوا بِرُوحِ اللهِ عَلَى غَيْرِ أَرْحَامٍ بَيْنَهُمْ، وَلاَ أَمْوَالٍ يَتَعَاطَوْنَهَا، فَوَاللهِ إِنَّ وُجُوهَهُمْ لَنُورٌ وَإِنَّهُمْ عَلَى نُورٍ، لاَ يَخَافُونَ إِذَا خَافَ النَّاسُ وَلاَ يَحْزَنُونَ إِذَا حَزِنَ النَّاسُ»، وَقَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾﴾ يونس} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: لە نێو بەندەکانی خوا کەسانی وا هەن نە لە پێغەمبەران‌و نە لە شەهیدانن، کەچی پێغەمبەران‌و شەهیدەکان خۆزگەیان پێ دەخوازن لەبەر شوێنەکانیان لە لای خوای بەرز، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوانە کێن؟ فەرمووی: کەسانێکن لەبەر خوا یەکدیان خۆش دەوێ بێ ئەوەی خزمایەتیان لە نێوان بێ یاخود ماڵیان بەیەکدی دابێ، سوێند بە خوا دەم‌و چاویان نوورەو لەسەر نوورن، ئەو کاتەی خەڵك دەترسێ ئەوان ترسیان نیە، وە ئەو کاتەی خەڵك پەژارە دایان دەگرێ ئەوان دڵتەنگ نین، ئنجا ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾﴾ یونس

---

١) (رَوَاهُ ابْنُ حِبَّانَ: (٥٧٦)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٣٠١٩))

٢) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (٣٥٢٩)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٣٠٢٧))

واتە: ئاگاداربن بەڕاستی دۆستانی خوا نە ترسیان لەسەرە نە پەژارە دایان دەگرێ.

{عَنْ أنَسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُ عَنِ النَّبيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «ثَلاَثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلاَوَةَ الإيمَانِ: أنْ يَكُونَ اللهُ وَرَسُولُهُ أحَبَّ إلَيهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وأنْ يُحِبَّ المَرْءَ لايُحِبُّهُ إلاَّ للهِ، وأنْ يَكْرَهَ أنْ يَعُودَ في الكُفْرِ كَمَا يَكْرَهُ أنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ»} **حَديثٌ صَحيحٌ**(١)

واتە: ئەنەس خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سێ شت لە هەرکەسێ دا هەبن ئەوە شیرینی ئیمانی بە هۆی ئەو سێ شتانەوە چێشتوە، کە خواو پێغەمبەری خوای لە غەیری خۆیان خۆشتربوێ (هیچ شتێکی بە قەدەر خوا، وە پاشان بەقەدەر پێغەمبەر خۆشنەوێ)، وە کە کەسێکی خۆشویست تەنیا لەبەر خوا خۆشی بوێ، وە پێی ناخۆشبێ بگەڕێتەوە بۆ کوفر، دوای ئەوەی خوا دەربازی کردوە لێی، وەکو چۆن پێی ناخۆشە فڕێ بدرێتە نێو ئاگر.

{عَنْ سَهْلِ بْنِ مُعَاذِ بْنِ أَنَس الْجُهَنِيِّ، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ أَعْطَى للهِ وَمَنَعَ للهِ، وَأَحَبَّ للهِ وَأَبْغَضَ للهِ، وَأَنْكَحَ للهِ، فَقَدْ اسْتَكْمَلَ إِيمَانَهُ»} **حَديثٌ صَحيحٌ**(٢)

واتە: سەهلی کوڕی موعاذی کوڕی ئەنەسی جوهەنیی لە بابی دەگێڕێتەوە خوا لێی ڕازی بێ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك (ماڵو سامانو زانستو زانیاریی... هتد) بەخشی لەبەر خواو نەیبەخشی هەر لەبەر خوا، وە خەڵکی خۆشویست لەبەر خواو، ڕقی لە خەڵکی بوو لەبەر خوا، وە ژنی هێنا لەبەر خوا، ئەوە بە دڵنیایی ئیمانەکەی تەواوە.

{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لأَبِي ذَرٍّ: «أَيُّ عُرَى الإيمَانِ (أَظُنُّهُ قَالَ): أَوْثَقُ»؟ قَالَ: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ:

---

١) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (١٦)، وَمُسْلِم: (١٧٤))
٢) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٢٥٢١)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح سُنَن التِّرمِذِيّ))

«الْمُوَالاَةُ فِي اللهِ، وَالْمُعَادَاةُ فِي اللهِ، وَالْحُبُّ فِي اللهِ، وَالْبُغْضُ فِي اللهِ»} **حديثٌ حَسَنٌ**[١]

**واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بەئەبوو زەڕی فەرموو: کامە قوڵفەی ئیمان زۆر پتەوە؟ گوتی: خواو پێغەمبەری خوا زاناترن، فەرمووی: دۆستایەتی لەبەر خواو، دوژمنایەتی لەبەر خوا، وە خۆشویستن لەبەر خواو، ڕق لێبوونەوەش لەبەر خوا.**

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): مَتَى السَّاعَةُ يَا رَسُوْلَ اللهِ؟ قَالَ: «مَا أَعْدَدْتَ لَهَا»، قَالَ: مَا أَعْدَدْتُ لَهَا مِنْ كَثِيرِ صَلاَةٍ وَلاَ صَوْمٍ وَلاَ صَدَقَةٍ، وَلَكِنِّي أُحِبُّ اللهَ وَرَسُوْلَهُ قَالَ: «أَنْتَ مَعْ مَنْ أَحْبَبْتَ»} **حَديثٌ صَحيحٌ**[٢]

**واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێك لە پێغەمبەری ﷺ پرسی: کەی قیامەتە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: چیت بۆ ئامادە کردوە؟ گوتی: شتێکی زۆرم لە نوێژو ڕۆژووو صەدەقە ئامادە نەکردوە، بەڵام خواو پێغەمبەری خوام خۆش دەوێ! فەرمووی: تۆ لەگەڵ ئەو کەسە دای کە خۆشت دەوێ.**

{عَن مُعَاذُ بْنُ جَبَل رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، سَمِعْتُ رَسُولَ الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، يَقُولُ: «قَالَ الله تَعَالَى: وَجَبَتْ مَحَبَّتِي لِلْمُتَحَابِين فِيَّ، وَالْمُتَجَالِسِينَ فِيَّ، وَالْمُتَزَاوِرِينَ فِيَّ»} **حَديثٌ صَحيحٌ**[٣]

**واتە: موعاذی کوڕی جەبەل خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: بیستم لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: خوای بەرز فەرموویەتی: پێویست بوو خۆشەویستی من بۆ ئەو کەسانەی کە لەبەر من یەکدیان خۆش دەوێ، وە دادەنیشن لەگەڵ یەکدی لەبەر من، وە سەردانی یەکدی دەکەن لەبەر من.**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ، الإِمَامُ الْعَادِلُ، وَشَابٌّ نَشَأَ بِعِبَادَةِ اللهِ، وَرَجُلٌ

---

١) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي (الكَبِير): (١١٥٣٧)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٧٢٨))

٢) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ: (٥٨١٩)، وَمُسْلِمٌ: (٦٨٧٨))

٣) (رَوَاهُ أَحْمَد: (٢٢٠٨٣) وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (المشكاة): (٥٠١١))

قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ فِي الْمَسَاجِدِ، وَرَجُلاَنِ تَحَابَّا فِي اللهِ اجْتَمَعَا عَلَيْهِ وَتَفَرَّقَا عَلَيْهِ، وَرَجُلٌ دَعَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وَجَمَالٍ، فَقَالَ: إِنِّي أَخَافُ اللهَ، وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ فَأَخْفَاهَا حَتَّى لاَ تَعْلَمَ يَمِينُهُ مَا تُنْفِقُ شِمَالُهُ، وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللهَ خَالِيًا فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: حەوت جۆرە کەس هەن خوا دەیانخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە، لەو ڕۆژەدا هیچ سێبەرێك نیە جگە لە سێبەری وی، (ئەوانیش:) پێشەواوە دەسەڵاتدارێکی دادگەر، وە گەنجێك کە گەنجێتییەکەی لە عیبادەتی خوادا بەسەربردبێ، وە پیاوێك کە دڵی پەیوەست بێت بە مزگەوتەوە، وە دوو پیاو لەبەر خوا یەکدیان خۆشبوێو لەبەر خوا کۆببنەوەو لەبەر خوا لەیەکدی جیاببنەوە، وە پیاوێك ئافرەتێکی جوانو خاوەن دەسەڵات بانگی بکات (بۆ مەبەستی ئەنجامدانی کاری خراپ)، ئەویش بڵێ: من لە خوا دەترسم، وە پیاوێك خێرو چاکە بکات بە جۆرێك کە لای ڕاستی نەزانێ لای چەپی چی بە خشیوە (لە گێڕانەوەی دیکە هاتوە: لای چەپی نەزانێ لای ڕاستی چی بەخشیوە)، وە پیاوێك بە تەنیابێ لە شوێنێکی چۆڵ زیکرو یادی خوا بکاتو بگریێو فرمێسك بە چاوەکانی دا بێنە خوار لە ترسی خوا (عَزَّوَجَلَّ).**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَنَّ رَجُلاً زَارَ أَخاً لَهُ فِي قَرْيَةٍ أُخْرَى، فَأَرْصَدَ اللهُ لَهُ عَلَى مَدْرَجَتِهِ مَلَكاً، فَلَمَّا أَتَى عَلَيْهِ قَالَ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ قَالَ: أُرِيدُ أَخاً لِي فِي هَذِهِ الْقَرْيَةِ قَالَ: هَلْ لَكَ عَلَيْهِ مِنْ نِعْمَةٍ تَرُبُّهَا؟ قَالَ: لاَ غَيْرَ أَنِّي أَحْبَبْتُهُ فِي اللهِ (عَزَّ وَجَلَّ) قَالَ: فَإِنِّي رَسُوْلُ اللهِ إِلَيْكَ، بِأَنَّ اللهَ قَدْ أَحَبَّكَ كَمَا أَحْبَبْتَهُ فِيهِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

**واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پیاوێك سەردانی برایەکی (ئایینی) خۆی کرد لە گوندێکی دیکە، خوا فریشتەیەکی ناردە سەر ڕێگاکەی، کە دەگاتە لای (فریشتەکە) پێی دەفەرموێ: بۆ کوێ دەچی؟ دەڵێ: دەچم بۆ**

---

١) (رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (٦٤٢١)، وَمُسْلِمٌ: (٢٤٢٧))
٢) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٦٧١٤))

لای برایەکی (ئایینی خۆم) لەو گوندەیە، (فریشتەکە) پێی دەفەرموێ: هیچ نیازو داواکاریەکت پێی هەیە؟ دەڵێ: نەخێر، تەنیا ئەوەنەبێ کە لەبەر خوا (عَزَّ وَجَلَّ) خۆشم دەوێ، (فریشتەکە) فەرمووی: دە دڵنیابە من نێردراوی خوام بۆ لای تۆی ناردووم تا پێت بڵێم: خواش تۆی خۆشدەوێ چونکە تۆ ئەو برادەرەت لەبەر خوا خۆشدەوێ.

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَا تَحَابَّ اثْنَانِ فِي اللهِ، إِلاَّ كَانَ أَفْضَلَهُمَا أَشَدُّهُمَا حُباً لِصَاحِبِهِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ئەگەر دوو کەس لەبەر خوا یەکدیان خۆشبووێ، باشترینیان ئەوەیە کە هاوەڵەکەی خۆی زیاتر خۆش دەوێ.

{عَنْ رَبِيعَةَ بْنِ كَعْبِ الأَسْلَمِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: قَالَ: كُنْتُ أَبِيتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَأَتَيْتُهُ بِوَضُوْءِهِ وَحَاجَتِهِ، فَقَالَ لِي: «سَلْنِي»، فَقُلْتُ: أَسْأَلُكَ مُرَافَقَتَكَ فِي الْجَنَّةِ؟ قَالَ: «أَوَ غَيْرَ ذَلِكَ» قُلْتُ: هُوَ ذَاكَ، قَالَ: «فَأَعِنِّي عَلَى نَفْسِكَ بِكَثْرَةِ السُّجُودِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

واتە: ڕەبیعەی کوڕی کەعبی ئەسلەمیی خوا لێی ڕازی بی، دەڵێ: من لە شەو لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دەمامەوەو خزمەتم دەکرد، وە ئاوی دەست نوێژم بۆ دەهێنا، وە پێداویستییەکانم بۆ دەهێناو خزمەتم دەکرد، پێی گوتم: داوام لێ بکە چ شتێکت بۆ بکەم؟ منیش گوتم: داوات لێدەکەم لە بەهەشتێ هاوەڵی تۆبم، فەرمووی: جگە لەوە چی دیکە؟ گوتم: هەر ئەوە فەرمووی: کەواتە یارمەتیم بدە لەسەر خۆت بە زۆر سەجدە بردن.

{عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: مرَّ رَجُلٌ بِالنَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) وَعِنْدَهُ نَاسٌ، فَقَالَ رَجُلٌ مِمَّنْ عِنْدَهُ: إِنِّي لأُحِبُّ هَذَا للهِ، فَقَالَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «أَعْلَمْتَهُ؟»، قَالَ: لاَ، قَالَ: «فَقُمْ إِلَيْهِ

---

١) (رَوَاهُ البُخَارِي في (الأدب المفرد): (٥٤٤)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صَحيح الأدب المفرد): (٤٢٣))

٢) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (١١٢٢))

فَأعلِمهُ»، فَقَامَ إِلَيْهِ فَأعلمهُ، فَقَالَ: أَحَبَّكَ الذِّي أَحْبَبْتَنِي لَهُ، قَالَ: ثُمَّ رَجَعَ إِلى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): فَأخبَرهُ بِمَا قَالَ، فَقَالَ النَّبِيّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَّمَ): «أَنْتَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ، وَلَكَ مَا احْتَسَبْتَ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[١]

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێك (ی مسوڵمان) بە لای پێغەمبەر ﷺدا تێپەڕ بوو، وە هەندێ خەڵکیشی لەلابوو، (پیاوە مسوڵمانەکە سەلامی لێکردن)، یەکێك لەوانەی کە دانیشتبوو، گوتی: بەڕاستی من ئەو پیاوەم زۆر خۆشدەوێ لەبەر خاتری خوا، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: ئایا ئەو دەزانی تۆ خۆشت دەوێ، پێت گوتووە؟ گوتی: نەخێر، فەرمووی: ئێ دە هەڵسە بڕۆ لایو پێی بڵێ، کابراش هەڵساو چووە لای پێی گوت زۆم خۆشدەوێی لەبەر خوا، ئەویش پێی گوتەوە: ئەو کەسە تۆی خۆشبوێ، کە لەبەر ئەو منت خۆشدەوێ، دەڵێ: پاشان گەڕاوە لای پێغەمبەر ﷺ، وە هەواڵیشی پێدا دەربارەی ئەوەی گوتبوویان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تۆ لەگەڵ ئەو کەسەدای (واتە: لە ڕۆژی دوایی) کە خۆشت دەوێ، وە ئەو پاداشتەی چاوەڕێشی بە هۆی خۆشویستنی لەبەر خوا بۆت دەنووسرێ.

## کەی خەڵك خۆشیان دەوێی و کەی خۆشیان ناوێی؟

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «إِنَّ اللهَ إِذَا أَحَبَّ عَبْدًا دَعَا جِبْرِيلَ فَقَالَ: إِنِّي أُحِبُّ فُلَانًا فَأَحِبَّهُ، قَالَ: فَيُحِبُّهُ جِبْرِيلُ، ثُمَّ يُنَادِي فِي السَّمَاءِ،

---

١) (رَوَاهُ الطَّبَرَانيُّ في (الكَبير): (١٣٣٦١) عَنْ إِبْنُ عُمَر، وَالبَيْهَقِيُّ في (شعب الإيمان): (٩٠١١)، وَصَحَحَهُ العَلَّامَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٣٢٥٣))

فَيَقُولُ: إِنَّ اللهَ يُحِبُّ فُلاَنًا فَأَحِبُّوهُ، فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ، قَالَ: ثُمَّ يُوضَعُ لَهُ الْقَبُولُ فِي الأَرْضِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(١)

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر خوا بەندەیەكی خۆش بوێ بانگی جبریل دەكات‌و پێی دەفەرموێ: من فلانە بەندەم خۆش دەوێ، تۆش خۆشت بوێ، جبریلیش خۆشی دەوێ، جبریل بانگ دەكات لە نێو ئەهلی ئاسمان (واتە: لە نێو فریشتەكان) دەڵێ: خوا فلان بەندەی خۆش دەوێ ئێوەش خۆشتان بوێ، ئەهلی ئاسمان هەموو خۆشیان دەوێ، پاشان لەسەر زەویش (ئەم خۆشەویستیەی) لێ قبووڵ دەكرێ (ئیماندارانیش خۆشیان دەوێ).

## بەسەرهاتێك لەم بارەیەوە

{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: جَاءَ رَجلٌ إلى النَّبيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إنَّكَ لأَحَبُّ إليَّ مِن نَفسِي، وَإنَّكَ لأَحَبُّ إليَّ مِن وَلَدِي، وَإني لأَكُونُ في البَيتِ فأَذكُرُكَ فَمَا أَصبِرُ حتى آتِيَ فَأَنظُر إِلَيكَ، وَإِذَا ذَكَرتُ مَوتي وَمَوتَكَ عَرَفتُ أَنَّكَ إِذَا دَخَلتَ الجنةَ رُفِعتَ مَعَ النَّبِيِّينَ، وَإني إِذَا دَخَلتُ الجنةَ خَشِيتُ أَلا أَرَاكَ، فَلَم يَرُدَّ عَلَيْهِ النَّبِيُّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، شَيْئًا حتى نَزَلَ جبريلُ عَلَيْهِ السَّلامُ بهذِهِ الآيَةِ: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾﴾ النساء} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**(٢)

---

١) (مُتَّفقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ: (٣٠٣٧)، وَمُسْلِمٌ: (٦٨٧٣))

١) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي (الكبير): (١٢٥٥٩)، وإبن مردوية بسند لاباس بهِ، وَأَخْرَجَهُ الطَّبَرِيُّ: (٩٩٢٩) عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ مُرْسَلاً، وَالسُّيوطِي فِي (لُباب النقول) برقم: (٣١٠)، وَحَسَّنَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٢٩٣٣))

واتە: دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! تۆ لە لام خۆشەویستتری لە نەفسی خۆم، وە تۆ لە لام خۆشەویستتری لە منداڵەكانیشم، وە من جاری وایە لە ماڵێ دەبم یادی تۆ دەكەمەوە، خۆم ڕاناگرم هەتا دێم تەماشات دەكەم، هێندەم خۆش دەوێی، ئێستاش بیرم كردۆتەوە كە ئەگەر من و جەنابیشت مردین، دەزانم تۆ كە چوویە بەهەشتێ لەگەڵ پێغەمبەران بەرز دەكرێیەوە، بۆ شوێنە بەرزەكانی بەهەشت، وە منیش ئەگەر بچمە بەهەشتێ (لە پلەكانی خوارەوە دەبم)، دەترسیم كە نەتبینم، پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ وەڵامی نەدایەوە، هەتا جبریل دابەزیە خواری و ئەو ئایەتەی بۆ خوێندەوە كە دەفەرموێ: هەر كەسێك فەرمانبەریی خواو پێغەمبەریی خوا بكات ئەوە لەگەڵ پێغەمبەران و صیددیقان و شەهیدان و صاڵحان دایە، ئەوانەش باشترین هاوەڵ و برادەرن.

هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ گوتوویانە: بە هیچ شتێك دڵخۆش نەبووین هێندەی بەو ئایەتە دڵ خۆش بووین، واتە: دڵخۆشبوون بەوەی كە ئێمەش لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دەبین.

## سوودەكانی ڕەوشت جوانی

١)- زۆر لە خوای بەرز نیزیك دەبیەوە.

٢)- خۆشەویست دەبی لە لای خواو لە لای خەڵكی.

٣)- خەڵك هۆگرت دەبن و پێت سەرسام دەبن.

٤)- ڕێزێكی زۆر تایبەتت دەبێ، جیا لە هەموو خەڵكی.

٥)- پلەو پایەو پاداشتت بەردەوام زیاد دەکات.

٦)- خۆشەویست دەبی لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ.

٧)- لە ڕۆژی قیامەت زۆر نیزیك دەبی لە پێغەمبەر ﷺ.

٨)- کەسێکی زۆر سینگ فرەوان‌و پشوو درێژ دەبی.

٩)- وا لە دوژمن دەکەی ببێتە دۆست‌و هاوەڵت‌و خۆشتی بوێ.

١٠)- بەردەوام خوا عەفووت دەکات لە کەم‌و کورتی‌و هەڵەکانت دەبووری.

١١)- ڕەوشتە جوانەکان گوناح‌و تاوانەکانت دەسڕنەوە.

١٢)- پلەت دەگاتە کەسێك بە شەوان نوێژ دەکاو بەڕۆیش بەڕۆژووبێ.

١٢)- بە هۆی ڕەوشتی جوانتەوە چوونە بەهەشتت بۆ واجب دەبێ.

١٣)- تەرازووی کردەوە چاکەکانت زۆر قورس‌و گران دەبێ لە قیامەت.

١٤)- جەستەو پێستت حەڕام دەبێ لەسەر ئاگرو ئاگری نایسووتێنێ.

## هەندێ لە نیشانەکانی ڕەوشت جوانی

## ( عَلَامَات حُسْنُ الْخُلُق )

ئێستاش کاتی ئەوە هاتوە ئاماژە بە هەندێك لە نیشانەکانی ڕەوشت جوانی (حُسْنُ الْخُلُق) بکەین، بۆ سوودو بەرچاوڕوونیی زیاترو خۆ ڕازاندنەوەی باشتر، کە خاوەنی کتێبی: (إحياء علوم الدّين) هێناویەتی:

١- كَثِير الْحَيَاءِ: زۆر شەرمنیی‌و بە حەیایی.

٢- عَدَم الأذَى: نەبوونی ئازار بۆ خەڵك.

٣- كَثِير الإِصْلاَحِ: زۆر ئەنجامدانی چاكسازیی‌و ئاشتكردنەوەی نێوان خەڵك.

٤- صَدُوق اللِّسَانِ: ڕاستگۆیی زمان لە قسەكردن.

٥- قَلِيلَ الْكَلاَمِ: كەم قسە كردن. (نەك قسەی زۆری بریقەداری بێ كردار!!).

٦- كَثِير الْعَمَل: زۆر ئەنجامدانی كردەوەی چاك.

٧- قَلِيل الزَّلَل: كەم هەڵێخلسكان‌و هەڵە كردن (لە كردارو گوفتار).

٨- وَقُوراً صَبُوراً: گران‌و سەنگینی‌و ئارامگریی.

١٠- شَكُوراً رَضِيّاً: سوپاسگوزاریی‌و ڕازی بوون بە هەموو نیعمەتەكان.

١١- حَلِيماً رَفِيقاً: هێدیی‌و نەرم‌و نیانی.

١٢- عَفِيفاً: داوێن پاكیی.

١٣- شَفِيقاً: بە سۆزیی‌و دڵسۆزیی.

١٤- لا لَعَاناً وَلاَ سَبَّاباً: لەعنەت نەكردن‌و جوێن نەدان.

١٥- وَلاَ نَمَّامَاً: قسە نەهێنان‌و نەبردن لە نێوان خەڵكی (بۆ نانەوەی ئاشووب).

١٦- وَلاَ مُغْتَاباً: باس نەكردنی خەڵك لە پاشملە كە پێیان ناخۆشبێ.

١٧- وَلاَ عَجُولاً: زۆر پەلە پەل نەكردن.

١٨- وَلاَ حَقُوداً: نەبوونی ڕق‌و كینە لە دڵ‌و دەروون.

١٩- وَلاَ بَخِيلاً: ڕەزیل‌و چرووك نەبوون.

٢٠- وَلاَ حَسُوداً: نەبوونی حەسوودیی.

٢١- بَشَّاشاً هَشَّاشاً: هەمیشە زەردەخەنە لەسەر لێوو ڕووخۆشیی.

٢٢- يُحِبُّ فِي اللهِ: خۆشویستن لەبەر خوابێ‌و بەس.

٢٣- يُبْغِضُ فِي اللهِ: ڕق لێبونەوە لەبەر خوابێ‌و بەس.

٢٤- أَدَاءُ الأَمَانَةِ: دانەوەی ئەمانەت‌و دەست پاكیی.

٢٥- إِعْطَاءُ السَّائِلِ: بەخشین لە کاتی داوا لێکران لەلایەن کەسی ئاتاج.

٢٦- صِلَةُ الرَّحم: بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتی.

٢٧- قِرَى الضَيْفِ: ڕێزگرتنی میوان.

وە (ابْنُ حَجَر العَسْقَلاَنِي) لە (فَتْحُ البَارِي) ڕەوشتە جوان‌و پەسندەکانی بە شێوازێکی زۆر جوان تەرتیب کردوەو سەر ژمێری کردوون، وە گەیاندوونی بە شەست‌و نۆ سیفەت بەم شێوەیە:

## سیفەتەکانی پەیوەستن بە زمان

١. بە قسە گوتنی وشەی تەوحید، واتە: (لا إِلَه إِلاَّ الله).

٢. خوێندنەوەی قورئان.

٣. فێربوونی زانیاریی‌و زانست.

٤. فێرکردنی زانیاریی‌و زانست.

٥. پاڕانەوە لە خوای پەروەردگار.

٦. زیکری خوا، کە داوای لێ خۆشبوونیش دەگرێتەوە.

٧. خۆ پاراستن لە گوتنی قسەی زیادو بێ سوود.

## سیفەتەکانی پەیوەستن بە جەستە

١. خۆ پاککردنەوەی هەست پێکراوو، حوکمی واتە: لە ڕووی ئەحکامی شەرعیی، وە خۆ پاراستن لە پیسیەکان دەگرێتەوە نێو خۆی.

٢. داپۆشتنی عەیبەو شەرمگا.

٣. ئەنجامدانی نوێژە فەڕزو سوننەتەکان.

٤. وە هەروەها زەکات دان.

٥. وە ئازاد كردنی كۆیلە.
٦. سەخاوەتی، كە ناندان‌و ڕێزگرتنی میوان دەگرێتە خۆی.
٧. ڕۆژووە فەرزو سوننەتەكان.
٨. وە هەروەها ئەنجامدانی حەج‌و عومرە.
٩. سووڕانەوە بە دەوری كەعبە.
١٠. مانەوە لە مزگەوت بۆ خواپەرستی.
١١. گەڕان بە دوای شەوی قەدر، لە شەوانی ڕەمەزان.
١٢. ڕاكردن‌و هەڵاتن بە هۆی دینەوە، كە دیارە كۆچكردن لە شوێنی شیرك بۆ شوێنی خواپەرستی دەگرێتەوە.
١٣. وەفاكردن بە نەزر، یانی كە بەڵێنی بە خوا دا نەزر بكات، ئەنجامی بدات.
١٤. گەڕان بە دوای ئیمان، لەبەر ئەوەی ئیمان زیادو كەم دەكات ئینسان هەمیشە دەبێ هەوڵبدات هۆكارەكانی زیاد بوونی ئیمان بە دەستبێنێ.
١٥. كە كەفارەتی دەكەوێتە سەر بیدات، وەك: كەفارەتی ڕۆژوو، كەفارەتی سوێندو... هتد.

## شەش سیفەت تایبەتن بە گوێڕایەڵی

١. خۆپاكڕاگرتن بە هۆی نیكاحەوە، وە هەڵسان بە ئەنجامدانی هەقی ماڵ‌و خێزان.
٢. چاك بوون لەگەڵ دایك‌و باب، وە خۆ دوورگرتن لە خراپ بوون لەگەڵیان.
٣. پەروەردەكردنی منداڵ.
٤. بەجێ هێنانی پەیوەندی خزمایەتی.

٥. گوێڕایەڵی کردنی برا گەورە.

٦. بەبەزیی و نەرم و نیان بوون لەگەڵ کۆیلەو خزمەتکار.

## سیفەتە گشتیەکان:

١. هەڵسان بە ئەنجامدانی کاروباری خەڵك بە دادگەریی.

٢. هەمیشە لەگەڵ کۆمەڵ و تاقم دابوون، واتە: خۆ دوورگرتن لە بە تەنیا کارکردن، چونکە دیارە گورگ ئەو مەڕە دەخوات کە لە مێگەل دادەبڕێ.

٣. گوێڕایەڵی کردنی کاربەدەستان (لە شتی باش).

٤. ئاشتکردنەوەی نێوان خەڵك.

٥. هاوکاری یەکدی کردن لەسەر چاکە، کە ئەوەش فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە دەگرێتە خۆی.

٦. جێبەجێ کردنی سنوورەکانی خوا، یاسا شەرعییەکان.

٧. جەنگ و جیهاد کردن لە پێناوی خوا، کە ڕاوەستاوی لە جەنگیش دەگرێتە خۆی، (مُرَابَطَةُ) وەك (مُحَافَظَةِ) وایە، واتە: پارێزکاریی لێکردن و مانەوە لە شوێنی خۆ.

٨. تەسلیم کردنەوەی ئەمانەت و سپاردە.

٩. قەرزدان، وە وەفا پێکردنی.

١٠. ڕێزگرتن و باشبوون لەگەڵ دراوسێ.

١١. جوان هەڵسوکەوت کردن لە مامەڵەدا.

١٢. کۆکردنەوەی ماڵ بە ڕێگەیەکی حەلاڵ، وە خەرج کردنیشی بە شێوەیەکی شایستەو زێدەڕۆیی و نەکردن تێیدا.

١٣. وەڵامدانەوەی سەلام.

١٤. کەسێك کە بژمی‌و گوتی: (اَلْحَمْدُلله) پێی بڵێی: (يَرْحَمُكَ الله).

١٥. گرتنەوەی دەست لە ئەزیەتدانی خەڵك.

١٦. خۆ دوورگرتن لە قسەی ناشیرین.

١٧. لادانی ئەزیەت‌و ئازار لەسەر ڕێی خەڵکی.

# پایەو پاداشت لەسەر زانست‌و زانیاریی

## واتاو پێناسەی (العلم)

**(أ)- لە ئەسڵی زمان دا:**

(إبْنُ المَنظُور) گوتوویەتی: (العِلْمُ نَقيضُ الجَهْلِ)، واتە: زانین‌و هەبوونی زانیاریی هەڵوەشێنەرەوەی نەزانینە.

**(ب)- لە زاراوی شەرعدا:**

(الفَيْروز ابَادِيُّ) دەڵێ: (العِلْمُ ضَربَانِ: الأوَّلُ: إدرَاكُ ذَاتِ الشَّيءِ، والثَّانِي: الحُكْمُ عَلَى الشَّيءِ بِوجُودِ شَيءٍ)، واتە: (عِلْم) دوو حاڵەتی هەیە، یەکەمیان: بریتیە لەوەی هەست بە شتێك بکەی بە خودی خۆی نەك بە هۆی شتێکی دیکەوە. دووەمیشیان: بریتیە لەوەی حوکم لەسەر شتێك بدەی بە هۆی شتێکی دیکەوە.

(أَبُو حَامِد الغزَاليّ) دەڵێ: (العِلْمُ: هُوَ مَعْرِفَةُ الشَّيءِ عَلَى مَا هُوَ بِهِ) واتە: (عِلْم) بریتیە لە زانینی شتێك وەك ئەوەی کە هەیە.

بێگومان خوای پەروەردگار لە قورئان، وە پێغەمبەری سەرەوەرمان ﷺ لە فەرمایشتە بە پێزەکانی دا زۆر باسی پایەو ڕێزی زانست‌و زانایانیان کردوە، وە ڕێزی تایبەتی‌و پاداشت‌و پلەی تایبەتیان بۆ دانراوە، زانیاریی جگە لەوەی هۆکارە بۆ ناسینی پەروەردگارو چوونە بەهەشتی هەمیشەیی‌و، گرنگترین ڕێگاشە کە ئینسانی مسوڵمان بیگرێتە بەر بۆ سەفرازبوونی هەردوو دنیا، وە بێگومان ڕێگایەکی گرنگیشە کە بەندە بە هۆیەوە لە خوای خۆی نیزیك بکەوێتەوە، چونکە زانستی شەرعیی بەرچاوڕوونیە، کەسی زانا بەر چاوی خۆی پێ دەبینێ، ئەوەی هەق بێ بە دوای دەکەوێ‌و وەری دەگرێ، ئەوەی ناهەق بێ، خۆی لێ دوور دەگرێ،

بەمەش فەرمانی خوا بە جێ دێنێ، وەك فەرموویەتی: ﴿ قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ ... ﴿١٠٨﴾ ﴾ یوسف، چونکە بێگومان زانست ڕوونکەرەوەی ڕاستیەکانە.

بە دڵنیایش ئێمەی کە لەم سەردەمی پێشکەوتنی زانستو تەکنۆلۆجیای سەدەی بیستەم دا دەژین، دەبێ هەست بەو فەزڵو نیعمەتە زۆرە بکەین کە خوای بەخشەر بە ئێمەی بەخشیوەو، ئەو منەتەی خستووینە سەر، کە زۆر بە ئاسانی بتوانین هۆکارەکانی زانستو زانیاریی بەدەست بهێنین، کە ئەو فەزڵە بێگومان بە زانایانی پێشین تەنانەت زانایانی دوو سێ سەدە پێش ئێستا نەبەخشراوە، وە پێویستە ئێمەی مسوڵمان ئەم هەڵە بقۆزینەوەو سوودێکی زۆر چاك لەو زانستە وەربگرینو هەوڵی بوونە ئەهلی زانست بدەین، بۆ ئەوەی ببینە خاوەنی ئەو هەمووە فەزڵو ڕێزەی کە لە قورئانو سوننەت بۆیان دیار کراوە، سەرەتاش چەند ئایەتێك کە تێیدا خوای زاناوشارەزا باسی پلەو پایەی زانستو زانایانی فەرمووە، دەنووسین:

لە سوورەتی (المجادلة)دا خوای پەروەردگار بە پێناسەی ئیماندار مسوڵمانان دەدوێنێ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَكُمۡ تَفَسَّحُواْ فِي ٱلۡمَجَٰلِسِ فَٱفۡسَحُواْ يَفۡسَحِ ٱللَّهُ لَكُمۡۖ وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُواْ فَٱنشُزُواْ يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ  ﴾

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە کاتێك پێتان گوترا: لە کۆڕو مەجلیس فراوانی بکەن، ئێوەش فراوانی بکەن، خواش گوشادی بە ئێوە دەدات، وە کاتێك پێتان گوترا: هەستن، ئێوەش هەستن خواش پلەی ئەوانە بەرز دەکاتەوە لە ئێوە کە بڕوایان هێناوە، وە ئەوانەی کە زانستیان پێ بەخشراوە بە چەند پلەك (پلەیان بەرز دەکاتەوە) وە خواش بەوەی دەیکەن شارەزایە.

وە لە سوورەتی (آل عمران)دا خوای پەروەردگار زانایانو فریشتەکانی لەگەڵ خۆی کردۆتە شایەد لەسەر ئەوەی کە جگە لەو هیچ پەرستراوی دیکە بە هەق نین، وەك

فەرموویـــــەتی: ﴿ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلْعِلْمِ قَآئِمَۢا بِٱلْقِسْطِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٨﴾ ﴾

واتـە: خـوا شایەدیی دا کـە بێجگـە لـەو هیـچ پەرسـتراونین، هـەروەها فریـشتەکانو خاوەن زانییاران، خوا بە دادگەریی هەڵدەستێ جگە لەو هیچ پەرستراوی دیکە نین زاڵی کاربەجێ.

پاشان خوا (عَزَّوَجَلَّ) لێ ترسانی خۆی تایبـەت دەکات بـە بەنـدە زاناکانی، چونکە دیـارە تـەنیا زانایـان وەك پێویـست خـوای پـەروەردگار دەناسـنو لێـی دەترسـن بـە هـۆی وردبوونەوەیان لە ناوە جوانو سیفەتە بـەرزەکانی، وەك فەرموویـەتی: ﴿ ... إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴿٢٨﴾ ﴾فاطر

واتە: بە دڵنیاییو بێگومان لە ناو بەندەکانی خوادا تەنیا زانایان (وەك پێویست) لە خوا دەترسن، وە خوا زاڵی لێبوردەیە.

وە ئەگـەر سـەیری هـەموو قورئـانیش بکـەین نـابینین لـە هـیچ شـوێنێك خـوای پەروەردگار بە پێغەمبەری خۆی ﷺ فەرمووبێ داوای فلاَنە شت بکە بۆت زیاد بکەم، جگـە لـە زانـستو زانیـاریی، وەك لـە سـوورەتی (طـه)دا هـاتوە دەفـەرموێ: ﴿ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّۗ وَلَا تَعْجَلْ بِٱلْقُرْءَانِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰٓ إِلَيْكَ وَحْيُهُۥۖ وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا ﴿١١٤﴾ ﴾

واتە: بەرزو بڵندە ئەوە خوایەی کە دەسەڵاتدارێکی (پادشایەکی) هەقو ڕاستە، (ئەی موحەممەد ﷺ، وە هەرکەسێکیش کە قورئان دەخوێنی) پەلە مەکە لە (خوێندنی) قورئان دا لە پێش ئەوەی سرووش کردنەکەی بۆت تەواو بێت، وە بڵێ: ئەی پەروەردگارم زانستو زانیارییم زیاد بکە.

لە سوورەتی (الزمر)یشدا کـە بـە شـێوەی پرسیارکردنێکی نکوولێی لـێ کردنـەوە دەفەرموێ: ﴿ ... قُلْ هَلْ يَسْتَوِي ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٩﴾ ﴾

واتە: (ئەی موحەممەد ﷺ) بلێ: ئایا ئەوانەی دەزانن (و خاوەن زانیارییـن) یەکسانن لەگەڵ ئەوانەی کە نازانن (و بێ زانیارییـن)؟! بەڕاستی تەنیا خاوەن عەقڵان ئامۆژگاری وەردەگرن. مەبەستی خوا لێرەدا ئەوەیە نەخێر، هەرگیز وەك یەکدی نین!!

وە بێگومان گرنگترین خاڵیش لە زانست وەرگرتنو بەخشین دا بریتیە لە پاراستنی ئەمانەتی زانستیو، قسە نەکردن لەسەر شتێك کە ئینسان زانیاریی پێ نەبێت دەربارەی ئەو شتەی قسەی لەسەر دەکات، وەك خوای زاناوشارەزا فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ﴿٣٦﴾ الإسراء ﴾

واتە: بە دوای شتێك مەکەوەو قسەی لێ مەکە کە زانیارییت دەربارەی نیە، وە جگە لەوەش پێغەمبەری خوا ﷺ لە چەندین فەرمایشتی خۆی مەترسی ئەم بابەتەی دەمکوتانە شتێكو زانیاریی پێنەبوونەی ڕاگەیاندوە، بۆ نموونە:

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ أَفْتَى النَّاسَ بِغَيرِ عِلْمٍ، كَانَ إِثْمُهُ عَلَى مَنْ أَفْتَاهُ»} **حديثٌ حسَنٌ**(1)

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك فەتوایەك بدات بەبێ زانیاریی، ئەوە گوناهی هەموو ئەوانەی لەسەرە کە کار بەو فەتوایەی دەکەن!! وە دەربارەی گێڕانەوەو قسە کردن بە ناوی پێغەمبەری خوا، لە فەرمایشتێکی دیکەدا هاتوە: {عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعبَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «إِنَّ كَذِباً عَلَيَّ لَيْسَ كَكَذِبٍ عَلَى أَحَدٍ، فَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّداً، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ»} **حديثٌ صحيحٌ**(2)

واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: درۆ کردن بەسەر زاری من وەك ئەو درۆیە نیە کە بەسەر زاری کەسێکی دیکەوە دەکرێ، وە هەر کەسێك بە ئەنقەست درۆ بە زاری منەوە بکات، ئەوە با شوێنێك بۆ خۆی لە ناو ئاگر ئامادە بکات.

---

١) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُد: (٣٦٥٩) وَحَسَّنَهُ العلامة الألباني في (صحيح الجامع): (٦٠٦٨))

٢) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، رَوَاهُ البُخَارِيُّ: (١٢٢٩)، ومُسْلِمٌ: (٥)، وَاللَّفْظُ لَهُ)

## بەردەوام پاداشتت بۆ دێ

{عَن أَنَس بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «سَبْعٌ يَجْرِي لِلْعَبْدِ أَجْرَهُنَّ وَهُوَ فِي قَبْرِهِ بَعْدَ مَوْتِهِ: مَنْ عَلَّمَ عِلْماً، أَوْ أَجْرَى نَهْراً، أَوْ حَفَرَ بِئْراً، أَوْ غَرَسَ نَخْلاً، أَوْ بَنَى مَسْجِداً، أَوْ وَرَّثَ مُصْحَفاً، أَوْ تَرَكَ وَلَداً يَسْتَغْفِرُ لَهُ بَعْدَ مَوْتِهِ» } **حَديثٌ حسَنٌ**[1]

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: حەوت جۆر کردار هەن پاداشتەکەیان بۆ خاوەنەکانیان دەچێت لە نێو گۆڕەکەشی لە دوای مردنی: کەسێك زانیارییەکی فێری کەسێك کردبێ، یاخود جۆگایەکی کردبێ ئاوی پێدا بڕوات (بۆ سوودی خەڵکی)، یاخود بیرێکی هەڵکەندبێ، یاخود دارێکی خورمای ڕوواند بێ، یاخود مزگەوتێکی دروست کردبێ، یاخود موصحەفێکی قورئانی لە دوای خۆی جێهێشتبێو خەڵك بیخوێننەوەو سوودی لێ ببینن، یاخود مندالێکی صالحو چاکەکاری لە دوای خۆی جێهێشتبێو داوای لێخۆشبوونی بۆ بکات پاش مردنی.

{عَنْ أَبِي قَتَادَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُوْلُ: «خَيْرُ مَا يُخَلِّفُ الرَّجُلُ بَعْدَهُ ثَلَاثٌ: وَلَدٌ صَالِحٌ يَدْعُو لَهُ، وَصَدَقَةٌ تَجْرِي يَبْلُغُهُ أَجْرُهَا، وَعِلْمٌ يُنْتَفَعُ بِهِ مِنْ بَعْدِهِ» } **حَديثٌ صَحيحٌ**[2]

واتە: ئەبوو قەتادە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو: چاکترین شتانێك کە کەسێك لە دوای خۆی بەجێ بهێڵێ سێ شتن: مندالێکی صالح کە دووعای بۆ بکات، وە صەدەقەیەك کە پاداشتەکەی بەردەوام پێی بگاتەوە، وە زانستێك کە سوودی لێ وەربگیرێ دوای خۆی.

---

١) (رَوَاهُ البزَّارَ: (٧٢٨٩)، وَحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع): (٣٦٠٢))

٢) (رَوَاهُ ابْنُ حِبَّانَ: (٩٣)، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ صَحِيح)

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ»} **حَديثٌ صَحيحٌ**(١)

**واته: ئه‌بوو هوره‌یره‌ خوا لێی ڕازی بێ، ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: هه‌ر كه‌سێك خوا بیه‌وێ چاكه‌ی له‌گه‌ڵ بكات له‌ ئایین شاره‌زای ده‌كات‌و تێی ده‌گه‌یه‌نێ.**

{عَنْ عَبدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «نَضَّرَ اللهُ [وَجْه] امْرَءاً سَمِعَ مِنَّا حَدِيثاً، فَبَلَّغَهُ كَمَا سَمِعَهُ»} **حَديثٌ صَحيحٌ**(٢)

**واته: عه‌بدوڵڵای كوڕی مه‌سعوود خوای لێ ڕازی بێ، ده‌ڵێ: گوێم له‌ پێغه‌مبه‌ری خوا بوو ﷺ ده‌یفه‌رموو: خوا ده‌م‌و چاوی ئه‌و كه‌سه‌ جوان‌و ڕه‌ونه‌قدار ده‌كات‌و (خۆشی ده‌خاته‌ دڵی) كه‌ گوێبیستی فه‌رمووده‌یه‌ك ده‌بێ له‌ ئێمه‌، وه‌ ڕایده‌گه‌یه‌نێت، وه‌ك چۆن ده‌یبیستێ ئاوا به‌ هه‌مان شێوه‌ وه‌كو خۆی ڕایده‌گه‌یه‌نێ.**

## دووعای پێغه‌مبه‌ر ﷺ بۆ زانست خواز

{عَنْ عَبدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «رَحِمَ اللهُ مَنْ سَمِعَ مِنِّي حَدِيثاً، فَبَلَّغَهُ كَمَا سَمِعَهُ»} **حَديثٌ صَحيحٌ**(٣)

**واته: عه‌بدوڵڵای كوڕی مه‌سعوود خوای لێ ڕازی بێ، ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: ڕه‌حمه‌تی خوا له‌و كه‌سه‌بێ كه‌ گوێبیستی فه‌رمووده‌یه‌ك بووه‌ له‌ من، وه‌ ڕایبگه‌یه‌نێت به‌و شێوه‌یه‌ی كه‌ گوێی لێ بووه‌.**

---

١) (مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: البُخَارِيُّ: (٧١)، وَمُسْلِمٌ: (١٠٣٧))
٢) (رَوَاهُ إبْنُ حِبَّان: (٦٩)، واللَّفْظُ لَهُ، وصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع))
٣) (رَوَاهُ إبْنُ حِبَّان: (٦٨)، وصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني)

# پاداشتێكی زۆر گه‌وره

{عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «وَاللهِ لأَنْ يُهْدَى بِهُدَاكَ رَجُلٌ وَاحِدٌ، خَيْرٌ لَكَ مِنْ حُمْرِ النَّعَمِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[(١)]

واته‌: سه‌هلی كوڕی سه‌عد خوا لێی ڕازی بێ، ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: وه‌ڵڵاهی ئه‌گه‌ر به‌ هۆی تۆوه‌ یه‌ك پیاو ڕێی ڕاست بگرێ‌و هیدایه‌ت بدرێ، بۆ تۆ چاكتره‌ له‌ حوشتری سوور (كه‌ ئه‌م حوشتره‌ كاتی خۆی زۆر گرانبه‌هاو به‌ نرخ بووه‌ له‌ نێو عه‌ره‌ب، وه‌ك باشترین سه‌یاره‌ی سه‌رده‌می خۆمان بووه‌).

{عَنْ مُعَاذِ بْنِ أَنَسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ عَلَّمَ عِلْماً فَلَهُ أَجرُ مَنْ عَمِلَ بِهِ لا يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِ الْعَامِلِ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[(٢)]

واته‌: موعازی كوڕی ئه‌نه‌س خوای لێ ڕازی بێ، ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: هه‌ر كه‌سێك یه‌كێك فێری زانست بكات، ئه‌وه‌ هه‌مان پاداشتی بكه‌ره‌كه‌ی هه‌یه‌، وه‌ له‌ پاداشتی بكه‌ره‌كه‌ی هیچ كه‌م نابێته‌وه‌.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ دَعَا إِلَى هُدًى كَانَ لَهُ مِنَ الأَجْرِ مِثْلُ أُجُورِ مَنْ تَبِعَهُ، لا يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[(٣)]

واته‌: ئه‌بوو هوره‌یره‌ خوا لێی ڕازی بێ، ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رموویه‌تی: هه‌ر كه‌سێك خه‌ڵكی به‌ره‌و هیدایه‌ت بانگ بكات به‌ ئه‌ندازه‌ی هه‌موو ئه‌وانه‌ی كه‌ شوێنی كه‌وتوون پاداشتی هه‌یه‌و، هیچ له‌ پاداشتی ئه‌وانیش كه‌م ناكاته‌وه‌.

---

١) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ: (٢٧٨٣)، وَمُسْلِمٌ: (٦٣٧٣)، وَأَبُو دَاوُدَ: (٣٦٦١)، وَاللَّفْظُ لَهُ)

٢) (رَوَاهُ ابْنُ مَاجَهْ: (٢٤٠)، وحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الجامع): (٦٣٩٦))

٣) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٦٩٨٠))

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ سَنَّ فِي الإسلامِ سُنَّةً حَسَنَةً، فَلَهُ أَجْرُهَا، وَأَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِها بَعْدَهُ مِنْ غَيْرِ أن يُنْقَصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيءٌ»} **حَديثٌ صَحيحٌ**[1]

**واته: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك چاکەیەك دابێنێ، ئەوە پاداشتی خۆی هەیە، وە پاداشتی هەموو ئەوانەی هەیە کە کار بەو چاکەیە دەکەن (کە ئەو دایهێناوەو ئەو دەست پێشخەریی بۆ کردوە) بەبێ ئەوەی لە پاداشتی ئەوان کەم بێتەوە، (بە قەدەر هەمووان پاداشتی هەیە).**

## پایەو پاداشتی کۆڕی زانست‌و زانیاریی

{عَنْ سَهْلِ بْنِ حَنْظَلَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «مَا جَلَسَ قَوْمٌ مَجْلِساً يَذْكُرُونَ اللهَ (عَزَّ وَجَلَّ) فِيهِ فَيَقُومُونَ، حَتَّى يُقَالُ لَهُمْ: قُومُوا قَدْ غَفَرَ اللهُ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ، وَبُدِّلَتْ سَيِّئَاتُكُمْ حَسَنَاتٍ»} **حَدِيثٌ صَحيحٌ**[2]

**واتە: سەهلی کوڕی (حَنْظَلَة)ە، خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کۆمەڵە خەڵکێك کە لە کۆڕێك دانیشتوون، تێیدا یادی خوای زاڵی خاوەن شکۆیان تێدا کرد هەڵناستن، هەتا پێیان دەگوترێ: هەڵسن، بێگومان بوردران لە گوناهەکانتان، وە خراپەکانیشتان بۆ گۆڕدرا بە چاکە!**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَأَبِي سَعِيدِ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّهُمَا شَهِدَا عَلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَنَّهُ قَالَ: «لاَ يَقْعُدُ قَوْمٌ يَذْكُرُونَ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ إِلاَّ حَفَّتْهُمُ الْمَلاَئِكَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَنَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ»} **حَدِيثٌ صَحيحٌ**[3]

**واتە: هیچ کۆمەڵێك نیە دابنیشن لە ماڵێك لە ماڵەکانی خوا، قورئان بخوێنن و یەکدی فێربکەن، ئەوە حەتمەن خوا فریشتە دەنێرێتە**

---

١) (رَوَاهُ مُسْلِمٌ: (٢٣٩٨))

٢) (رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ في (الكَبير): (٦٣٩)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٢٢١٠))

٣) (رَوَاهُ مُسْلِم برقم: (٢٧٠٠)، وابْنُ حِبَّانَ برقم: (٨٥٢)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني)

سەریانو، بە ڕەحمەتی خوێ دایان دەپۆشێو چوار دەوریان بە فریشتە دەگرێتو سەکینەتیان بۆ دێتە خوارو، خوا باسیان دەکات لای ئەوانەی لای خۆین (واتە: فریشتەکان).

## پایەو پاداشتی مامۆستاو قوتابی

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَنْ جَاءَ مَسْجِدِي هَذَا، لَمْ يَأْتِهِ إِلاَّ لِخَيْرٍ يَتَعَلَّمُهُ أَوْ يُعَلِّمُهُ، فَهُوَ بِمَنْزِلَةِ الْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللهِ، وَمَنْ جَاءَ لِغَيْرِ ذَلِكَ فَهُوَ بِمَنْزِلَةِ الرَّجُلِ يَنْظُرُ إِلَى مَتَاعِ غَيْرِهِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: ئەبوو هوڕەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێك هاتە ئەم مزگەوتەی من، وە نەهات تەنها بۆ کاری خێرو فێرکردنی کەسێك یان فێربوون نەبێت، ئەوە ئەو کەسەی کە هاتووە پلەی وەك پلەی موجاهیدێکە کە لە پێناوی خوا دەجەنگی، وە هەر کەسێك بۆ مەبەستێکی دیکەی جگە لەوە بێت ئەوە ئەو کەسە پلەی وەك ئەو پیاوە وایە کە سەیری شت ومەکی کەسێکی دیکە دەکات!!

{عَنْ أَبِي أُمَامَةَ رَضِي اللهُ عَنْهُ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: «مَنْ غَدَا إِلَى الْمَسْجِدِ لا يُرِيدُ إِلا أَنْ يَتَعَلَّمَ خَيْرًا أَوْ يُعَلِّمَهُ، كَانَ لَهُ كَأَجْرِ حَاجٍّ تَامًّا حِجَّتُهُ»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[2]

واتە: لە ئەبی ئومامەوە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك بڕوات بۆ مزگەوت هیچ مەبەستێکی نەبێت جگە لەوە

---

١) (رَوَاهُ ابن ماجه برقم: (٢٢٧)، وصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني)

٢) (رَوَاهُ الطَّبَرانِي في (الكبير): (٧٤٧٣)، وحَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٨٦))

کە بیەوێ فێرە شتێکی چاك بێ، یان خەڵك فێرە شتی چاك بکات، ئەوە پاداشتی حاجیەکی بۆ دەنووسرێ کە حەجەکەی بە تەواوی ئەنجام دابێ.

{عَنْ صَفوَانِ بْنِ عَسَّال رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَا مِنْ خَارِجٍ يَخْرُجُ مِنْ بَيْتِهِ يَطْلُبُ الْعِلْمَ، إِلاَّ وَضَعَتْ لَهُ الْمَلاَئِكَةُ أَجْنِحَتَهَا رَضاً بِمَا يَصْنَعُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

واتە: صەفوانی کوڕی عەسسال خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو: هیچ کەسێك نیە کە لە ماڵەکەی بێتە دەرەوە بۆ فێربوونی زانستی شەرعیی، ئەوە حەتمەن فریشتە باڵەکانی بۆی ڕادەخەن وەك ڕێزو ڕەزامەندی بۆ ئەو کارەی کە دەیکات.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «الدُّنْيَا مَلْعُونَـةٌ مَلْعُونٌ مَا فِيهَا، إِلاَّ ذِكْرَ اللهِ، وَمَا وَالاَهُ أَوْ عَالِماً، أَوْ مُتَعَلِّماً»} **حَدِيثٌ حَسَنٌ**[2]

واتە: ئەبوو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو: بێگومان دنیا نەفرین لێکراوە، وە ئەوەی تێشیدایە نەفرین لێکراوە، جگە لە یادی خواو ئەوەی پەیوەندی بە یادی خوا هەیە، وە جگە لە زانایەك کە لە دینی خوا شارەزایە، یان کەسێك دەیەوێ زانیاریی بە دەستبێنێ و شارەزابێ.

---

١) (رَوَاهُ إِبْنُ مَاجَةْ: (٢٢٦)، وصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٨٥))

٢) (رَوَاهُ إِبْنُ مَاجَةْ: (٤١١٢)، حَسَّنَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (٢٧٩٧))

## دووعای دروستکراوەکانی خوا بۆ زانستخواز

{عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «الْخَلْقُ كُلُّهُمْ يُصَلُّونَ عَلَى مُعَلِّمِ الْخَيرِ، حَتَّى نِينَانُ الْبَحْرِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتە: عائیشە خوا لێی ڕازی بێت، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دروستکراوەکانی خوا هەموویان دووعا بۆ فێرکاری چاکە (واتە: یەکێك خەڵکی فێرە کاری چاك بکات) دەکەن، هەتا نەهەنگەکانی دەریاش.**

{عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «إِنَّهُ لَيَسْتَغْفِرُ لِلْعَالِمِ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ، حَتَّى الْحِيتَانُ فِي الْبَحْرِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

**واتە: ئەبوو دەرداء خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: بێگومان خواو فریشتەکانیو خەڵکی ئاسمانەکانو زەویش تەنانەت مێروولە لە کونەکەی داو هەتا نەهەنگیش لە دەریادا صەڵاوات لەسەر ئەوانە دەدەن کە مامۆستانو چاکە فێری خەڵکی دەکەن.**

{عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «طَلَبُ الْعِلْمِ فَرِيضَةٌ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ، وَإِنَّ طَالِبَ الْعِلْمِ يَسْتَغْفِرُ لَهُ كُلُّ شَيْءٍ حَتَّى الْحِيتَانُ فِي الْبَحْرِ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[3]

**واتە: ئەنەس خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: داواکردنی زانست پێویستە لەسەر هەموو کەسێکی مسوڵمان، وە هەموو شتێك داوای لێخۆش بوون بۆ داواکاری زانست دەکەن هەتا ماسییەکانیش لە ناو دەریادا.**

---

١) رَوَاهُ الديلمي: (٢٩٩٦)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (السلسلة الصحيحة): (١٨٥٢))

٢) (رَوَاهُ ابْنُ مَاجَهْ: (٢٣٩)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح إبْنُ مَاجَهْ): (١٩٥))

٣) (جامع بيان العلم وفضله، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٣٩١٤))

{عَنْ أَبَا الدَّرْدَاءِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَطْلُبُ فِيهِ عِلْمًا سَلَكَ اللَّهُ بِهِ طَرِيقًا مِنْ طُرُقِ الْجَنَّةِ، وَإِنَّ الْمَلاَئِكَةَ لَتَضَعُ أَجْنِحَتَهَا رِضًا لِطَالِبِ الْعِلْمِ، وَإِنَّ الْعَالِمَ لَيَسْتَغْفِرُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَمَنْ فِي الأَرْضِ وَالْحِيتَانُ فِي جَوْفِ الْمَاءِ، وَإِنَّ فَضْلَ الْعَالِمِ عَلَى الْعَابِدِ كَفَضْلِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ عَلَى سَائِرِ الْكَوَاكِبِ وَإِنَّ الْعُلَمَاءَ وَرَثَةُ الأَنْبِيَاءِ وَإِنَّ الأَنْبِيَاءَ لَمْ يُوَرِّثُوا دِينَارًا وَلاَ دِرْهَمًا وَرَّثُوا الْعِلْمَ فَمَنْ أَخَذَهُ أَخَذَ بِحَظٍّ وَافِرٍ»} **حديثٌ صحيحٌ**[1]

**واتە: ئەبوو دەرداء خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کەسێك ڕێگەیەك بگرێتە بەر بۆ فێربوونی زانستێك، خوا ڕێگایەك لە ڕێگاکانی بەهەشتی پێ دەگرێتە بەر، وە بێگومان فریشتە باڵەکانی دادەنێت بۆ داواکاری زانست، وەك ڕەزامەندیی بەو کارەی، وە بێگومان زانا بۆی دەپارێتەوە هەرچی ئەو کەسانەی لە ئاسمانەکانداو ئەوانەی لەسەر زەوین، وە ماسییەکان لە ناو ئاودا، وە بەڕاستی پایەو ڕێزی زانا بەسەر کەسی خواناس دا وەك پایەو ڕێزی مانگی چواردەیە بەسەر هەموو ئەستێرەکاندا، (چونکە لەوان ڕۆشنترو بە شەوقترە)، وە بێگومان تەنیا زانایان میراتگری پێغەمبەرانن، وە بێگومان پێغەمبەرانیش دینارو دەرەمیان بەمیرات بەجێ نەهێشتوە، جا هەر کەسێك ئەو میراتەی پێ بڕابێ ئەوە بێگومان بشكو بەشێكی زۆری وەرگرتوە.**

{عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُوْلُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «فَضْلُ الْعَالِمِ عَلَى الْعَابِدِ، كَفَضْلِي عَلَى أَدْنَاكُمْ»} **حديثٌ صحيحٌ**[2]

**واتە: ئەبی ئومامەی باهیلیی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پایەی زانا بەسەر خوا پەرستی بێ زانیاری دا وەك پایەی من وایە بەسەر کەم پایە ترینتان دا.**

---

١) (رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: (٣٦٤١)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٦٢٩٧))

٢) (رَوَاهُ الطَّبَرانِيُّ في (الكبير): (٧٩١١)، وصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (المشكاة): (٢١٣))

{عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: «فَضْلُ الْعِلْمِ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ فَضْلِ الْعِبَادَةِ، وَخَيْرُ دِينِكُمْ الوَرَعُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[1]

**واتە: سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: پایەو (پاداشتی) زانست لەلام خۆشەویستترە لە پایەو (پاداشتی) عیبادەت، وە باشترین کاری ئایینەکەتان خۆ پاراستنە لە گومان‌و حەڕام.**

{عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: ذُكِرَ لِرَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): «رَجُلَانِ أَحَدُهُمَا عَابِدٌ وَالآخَرُ عَالِمٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): فَضْلُ الْعَالِمِ عَلَى الْعَابِدِ كَفَضْلِي عَلَى أَدْنَاكُمْ»، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): إِنَّ اللهَ وَمَلَائِكَتَهُ وَأَهْلَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ حَتَّى النَّمْلَةَ فِي جُحْرِهَا وَحَتَّى الْحُوتَ لَيُصَلُّونَ عَلَى مُعَلِّمِ النَّاسِ الْخَيْرَ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[2]

**واتە: ئەبوو ئومامەی باهیلیی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: باسی دوو پیاو کرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ: یەکێکیان خواپەرست بوو (زانیاریی کەم بوو) ئەودیکەیان زانا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پلەو پایەی زانا بەسەر پلەو پایەی خواپەرستێکی بێ زانیاری، وەك پلەو پایەی من وایە بەسەر کەم پایەترینتان، پاشان فەرمووی: بێگومان خواو فریشتەکانی‌و خەڵکی ئاسمانەکان‌و خەڵکی زەویش تەنانەت میروولە لە ناو کونەکەی داو، وە هەتا نەهەنگیش (لە ناو ئاودا) هەموویان صەڵاوات لەسەر ئەوانە دەدەن کە چاکە فێری خەڵکی دەکەن.**

---

١) (رَوَاهُ الحَاكِمُ: (٣١٤)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الجامع): (٤٢١٤))
٢) (رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ: (٢٦٨٥)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَةُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب): (٨١))

{عَنْ أَبَا عِنَبَةَ الْخَوْلانِيَّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ يَقُولُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «لا يَزَالُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ يَغْرِسُ فِي هَذَا الدِّينِ بِغَرْسٍ يَسْتَعْمِلُهُمْ فِي طَاعَتِهِ»} **حديثٌ حسنٌ**[1]

**واته: ئەبا عینەبەی خەولانی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم له پێغەمبەری خوا ﷺ بوو فەرمووی: خوای زاڵی پایەدار بەردەوام لەم دینەدا نەمام دەنێژێ، وه له فەرمانبەریی خۆیدا بەکاریان دێنێ.**

**که لێرەدا مەبەست له فێربوونی زانستو زانیارییه لەلایەن بەنده تایبەتیەکانی خوای بەرزەوه.**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنْ رَسُولِ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، قَالَ: «تَجِدُونَ النَّاسَ مَعَادِنَ، خِيَارُهُمْ فِي الْجَاهِلِيَّةِ خِيَارُهُمْ فِي الإِسْلاَمِ، إِذَا فَقِهُوا»}[2]

**واته: ئەبوو هوڕەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: خەڵك دەبینن وەك کانزایەکانن، بەڵام ئەوانەیان له سەردەمی نەفامیی چاك بوون، دوای ئەوەی دێنه نێو ئیسلامو شارەزای دین دەبن، هەر چاکیی خۆیان دەپارێزن.**

---

١) (رَوَاهُ أَحْمَد: (١٧٨٢٢)، حَسَّنَهُ العَلاَّمَة الألباني في (السلسة الصحيحة): (٢٤٤٢))
٢) (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ: (٣٣٠٤)، وَمُسْلِمٌ: (٦٦١٥))

## سوودەكانی بە دەستهێنانی زانست‌و زانیاریی

١)- خوای خۆت چاكتر دەناسی‌و خواپەرستیەكی باشتر ئەنجام دەدەی.

٢)- بناغەیە بۆ دامەزراندنی عەقیدەو چەسپاویت لە بەندایەتی كردن.

٣)- هەوڵدانت بۆ فێربوون بە عیبادەت بۆ دەنووسرێ.

٤)- ڕێگەی چوونە بەهەشتت بۆ ئاسان دەبێ.

٥)- ترسی خوا لە دڵت زیاد دەبێ.

٦)- ئیش‌و كارەكانی دنیات بۆ خڕدەكرێتەوە.

٧)- سوودت بۆ خۆت‌و بۆ غەیری خۆت دەبێ.

٨)- پاداشتت بۆ دێ بەردەوام دوای مردنیشت.

٩)- بە جێگرو میراتگری پێغەمبەران هەژمار دەكرێی.

١٠)- هەمیشە سەرگەرمی كاری چاك دەبی‌و لەلات خۆشەویست دەبێ.

١١)- دەبیە خاوەن ڕەوشتێكی زۆر بەرزو كەسایەتیەكی ناوازە.

١٢)- فریشتەكان باڵی ڕەزامەندیت بۆ ڕادەخەن‌و كارئاسانیت بۆ دەكەن.

١٣)- بەردەوام دووعات بۆ دەكرێ لەلایەن دروستكراوەكانی خوا.

١٤)- چاك‌و خراپ‌و حەڵاڵ‌و حەڕام‌و ئەرك‌و مافەكانت دەزانی.

دیارە ئەوە لە حاڵێكدا دەبێ ئەگەر ئەو زانستە ئیخلاص‌و كردەوەی لەگەڵ دابێ.

## بەسەرهاتێك لەمبارەیەوە[١]

بەسەرهاتێك دەربارەی ئەم فەرمایشتە: {عَنْ صَفْوَانِ بْنِ عَسَّال رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُوْلَ اللهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَقُولُ: «مَا مِنْ خَارِجٍ يَخْرُجُ مِنْ بَيْتِهِ يَطْلُبُ الْعِلْمَ، إِلاَّ وَضَعَتْ لَهُ الْمَلاَئِكَةُ أَجْنِحَتَهَا رَضاً بِمَا يَصْنَعُ»} **حَدِيثٌ صَحِيحٌ**[٢]

واتە: صەفوانی کوڕی عەسسال خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو: هیچ کەسێك نیە کە لە ماڵەکەی بێتە دەرەوە بۆ فێربوونی زانستی شەرعیی، ئەوە حەتمەن فریشتە باڵەکانی ڕادەخەن وەك ڕێزو ڕەزامەندی بۆ ئەو کارەی کە دەیکات.

ئیمامی نەوەوی (ڕەحمەتی خوا لێ بێ) بە بۆنەی ئەم فەرمایشتەوە، لە زانایەك دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئێمە کۆمەڵێك قوتابی بووین، لە بەسرە دەچووین بۆ لای مامۆستایەك کە زانستی شەرعیی لێوەربگرین، یەکێکمان لەگەڵ دابوو کەسێکی فاسق‌و بێ بەندوبار بوو، گاڵتەی بە دین‌و شەرع دەهات‌و پێمان پێدەکەنی، گوتمان بۆچی پێمان پێدەکەنی؟! گوتی: ئەوەی ڕاستی بێ، پەرۆشی ئەو مەلائیکەتانەمە کەوا بە خێرایی پێ لە باڵیان دەنێن! دەڵێ: جا ئێمە ڕۆیشتین ئەومان بەجێهێشت، لێمان پرسی بۆ نایەی کەچی لە شوێنی خۆی چەقی بوو! کە گەڕاینەوە لای هەردوو پێی شەلەل بوو بوون!!

دیارە لێرەدا کە دەفەرموێ: فریشتەکان باڵی خۆیان ڕادەخەن، مەرج نیە بەو شێوەیە باڵی خۆیان ڕابخەن تاکو فەقێ‌و قوتابی بەسەریاندا بڕۆن، بەڵکو لێرەدا مەبەستی ئەوەیە کە فریشتە ڕێز دەگرن لە فەقێ‌و

---

١) قوتابیانی زانیاری شەرعیی‌و چەند سەرنجێك، علی باپیر.

٢) (رَوَاهُ إِبْنُ مَاجَة: (٢٢٦)، وَصَحَّحَهُ العَلاَّمَة الألباني )

قوتابی‌و زانستی شەرعیی مادام سەرگەرمی ئەوەبێ کە لە دینی خوا شارەزابێ، بۆ ئەوەی بەو شارەزاییەی دوایی خەڵکی دیکەش شارەزا بکات‌و ئەرکی پێغەمبەری خوا لە نێو ئۆممەتەکەی جێبەجێ بکات، جا لەبەر ئەوەی فریشتەکان هاوەڵ‌و هاودەمی ئەهلی ئیمانن، بۆیە بە طاعەتیان دەڵخۆش دەبن، وەك چۆن بە خراپەو سەرپێچیشیان ناڕەحەت دەبن‌و تووڕە دەبن.

٤٧٠ گوێ گشتی

٢٦ فەرموودە

## سوپاسنامە:

زۆر سوپاس بۆ هەموو ئەوانەی هاوکارم بوون بۆ هاتنە کۆتایی ئەم بەرگی یەکەمەی ئەم زنجیرە، خوا بە باشترین شێوە پاداشتیان بداتەوە، بە تایبەتی بەڕێزان:

١)- مامۆستا مەلا عەبدوڵلایی گردەپانیی، کە ئەرکی پێداچوونەوەی گرتە ئەستۆی خۆی، خوا تەمەن درێژو لەش ساغی بکات.

٢)- کاک ئەحمەد صلاح عەبدوڵڵاو کاک ڕزگار ڕەمەزان عوسمان و کاک جەلال سەعید، کە هەر یەکەو بە جۆرێك هاوکارم بوون، خوا سەربەرزی دنیاو دواڕۆژیان بکات، هەموو کارێکیان بۆ ئاسان بکات.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ
وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ
وَالحَمْدُ للهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

سیروان کاکە ئەحمەد

٤ /٤ / ٢٠١٣

هەولێر

## سەرچاوەکان:

١): (القرآن الكريم)
٢): (صحيح البخاري): الجامع الصحيح المختصر، تأليف: محمد بن إسماعيل أبو عبدالله البخاري، دار ابن كثير، اليمامة، بيروت، الطبعة الثالثة، ١٤٠٧ - ١٩٨٧، تحقيق: د. مصطفى ديب البغا أستاذ الحديث وعلومه في كلية الشريعة، جامعة دمشق عدد الأجزاء: ٦.
٣): (صحيح مسلم): الجامع الصحيح، تأليف: أبو الحسين مسلم بن الحجاج بن مسلم القشيري النيسابوري، دار الجيل بيروت + دار الأفاق الجديدة، بيروت، عدد الأجزاء: ثمانية أجزاء في أربع مجلدات.
٤): (صحيح ابن حبان بترتيب ابن بلبان): تأليف: محمد بن حبان بن أحمد أبو حاتم التميمي البستي الناشر: مؤسسة الرسالة، بيروت، الطبعة الثانية، ١٤١٤ - ١٩٩٣، تحقيق: شعيب الأرنؤوط، عدد الأجزاء: ١٨.
٥): (صحيح ابن خزيمة): تأليف: محمد بن إسحاق بن خزيمة أبو بكر السلمي النيسابوري الناشر: المكتب الإسلامي، بيروت، ١٣٩٠ - ١٩٧٠، تحقيق: د. محمد مصطفى الأعظمي، عدد الأجزاء: ٤.
٦): (صحيح الأدب المفرد للإمام البخاري): المؤلف: محمد ناصر الدين الألباني، دار الصدّيق، الطبعة: الأولى: ١٤٢١هـ.
٧): (صحيح الترغيب والترهيب): تأليف: الشيخ محمد ناصر الدين الألباني، مكتبة المعارف، الرياض، الطبعة: الخامسة، عدد الأجزاء: ٣.

٨): **(صحيح وضعيف الجامع الصغير)**: المؤلف: محمد ناصر الدين الألباني، مصدر الكتاب: برنامج منظومة التحقيقات الحديثية.

٩): **(سنن أبي داود)**: تأليف: أبو داود سليمان بن الأشعث السجستاني، دار الكتاب العربي، بيروت، عدد الأجزاء: ٤.

١٠): **(سنن الترمذي)**: (الجامع الصحيح)، تأليف: محمد بن عيسى أبو عيسى الترمذي السلمي، دار إحياء التراث العربي، بيروت، تحقيق: أحمد محمد شاكر وآخرون، عدد الأجزاء: ٥.

١١): **(سنن النسائي)**: تأليف: الامام أبي عبد الرحمن أحمد بن شعيب النسائي، مكتب المطبوعات الإسلامية – حلب، الطبعة الثانية، ١٤٠٦ – ١٩٨٦، تحقيق: عبدالفتاح أبو غدة، عدد الأجزاء: ٨

١٢): **(السنن الكبرى)**: تأليف: الامام أبي عبد الرحمن أحمد بن شعيب النسائي، تحقيق: دكتور عبد الغفار سليمان البنداري وسيد كسروي حسن الجزء الاول دار الكتب العلمية بيروت، لبنان جميع الحقوق محفوظة لدار الكتب العلمية بيروت، لبنان الطبعة الاولى ١٤١١ هـ - ١٩٩١م.

١٣): **(سنن ابن ماجه)**: تأليف: محمد بن يزيد أبو عبدالله القزويني، دار الفكر - بيروت، تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي عدد الأجزاء: ٢.

١٤): **(سنن الدارقطني)**: المؤلف: علي بن عمر أبو الحسن الدارقطني البغدادي، الناشر : دار المعرفة، بيروت ، ١٣٨٦ – ١٩٦٦، تحقيق: السيد عبد الله هاشم يماني المدني، عدد الأجزاء: ٤.

١٥): **(سنن الدارمي)**: المؤلف: عبدالله بن عبدالرحمن أبو محمد الدارمي، دار الكتاب العربي، بيروت، الطبعة الأولى: ١٤٠٧، تحقيق: فواز أحمد زمرلي، خالد السبع العلمي، عدد الأجزاء: ٢ الأحاديث مذيلة بأحكام حسين سليم أسد عليها.

١٦): **(سنن سعيد بن منصور):** المؤلف: أبو عثمان سعيد بن منصور بن شعبة الخراساني الجوزجاني، دار العصيم، رقم الطبعة:الأولى: ١٤١٤، اسم المحقق: د.سعد بن عبد الله بن عبد العزيز آل حميد، عدد الأجزاء: ٥.

١٧): **(مسند أبي يعلى):** المؤلف: أحمد بن علي بن المثنى أبو يعلى الموصلي التميمي، دار المأمون للتراث دمشق، الطبعة الأولى: ١٤٠٤، ١٩٨٤، تحقيق: حسين سليم أسد، عدد الأجزاء: ١٣، الأحاديث مذيلة بأحكام حسين سليم أسد عليها.

١٨): **(مسند الشاميين):** المؤلف: سليمان بن أحمد بن أيوب أبو القاسم الطبراني، مؤسسة الرسالة، بيروت، الطبعة الأولى: ١٤٠٥ – ١٩٨٤، تحقيق: حمدي بن عبد المجيد السلفي، عدد الأجزاء: ٤.

١٩): **(مسند البزّار):** تأليف: البَزَّارُ أَبُو بَكْرٍ أَحْمَدُ بنُ عَمْرِو البَصْرِيُّ الشَّيْخُ، الإِمَامُ، الحَافِظُ الكَبِيْرُ، أَبُو بَكْرٍ أَحْمَدُ بنُ عَمْرِو بنِ عَبْدِ الخَالِقِ البَصْرِيُّ، البَزَّارُ، صَاحِبُ (المُسْنَدِ) الكَبِيْرِ، الَّذِي تَكَلَّمَ عَلَى أَسَانِيدِهِ.

٢٠): **(المُسند): للإمام أحمد بن حنبل**، تأليف: أحمد بن حنبل أبو عبدالله الشيباني، الناشر: مؤسسة قرطبة، القاهرة، عدد الأجزاء: ٦، الأحاديث مذيلة بأحكام شعيب الأرنؤوط عليها.

٢١): **(الموطأ):** تأليف: مالك بن أنس، الناشر: مؤسسة زايد بن سلطان آل نهيان الطبعة: الاولى ١٤٢٥هـ-٢٠٠٤م، تحقيق: محمد مصطفى الأعظمي عدد الأجزاء: ٨.

٢٢): **(المستدرك على الصحيحين):** تأليف: محمد بن عبدالله أبو عبدالله الحاكم النيسابوري، دار الكتب العلمية، بيروت، الطبعة الأولى: ١٤١١ – ١٩٩٠، تحقيق: مصطفى عبد القادر عطا، عدد الأجزاء : ٤، مع الكتاب: تعليقات الذهبي في التلخيص.

٢٣): **(المعجم الكبير):** تأليف: سليمان بن أحمد بن أيوب أبو القاسم الطَّبَرَانِي، مكتبة العلوم والحكم، الموصل، الطبعة

الثانيـة، ١٤٠٤ ـ ١٩٨٣، تحقيـق: حمـدي بـن عبدالمجيـد السلفي عدد الأجزاء: ٢٠.

٢٤): **(المعجم الأوسط)**: تـأليف: أبـو القاسـم سليمان بـن أحمد الطَّبَرَانـي، دار الحرمين، القاهرة، ١٤١٥ تحقيق: طـارق بن عوض الله بن محمد، عبد المحسن بن إبراهيم الحسيني، عدد الأجزاء: ١٠.

٢٥): **(المعجم الصغير)**: (الـروض الداني)، تـأليف: أبـو القاسـم سليمان بـن أحمـد الطَّبَرَانـي، المكتب الإسلامي، دار عمار، بيروت، عمـان، الطبعـة الأولـى، ١٤٠٥ ـ ١٩٨٥ تحقيـق: محمد شكور محمود الحاج أمرير، عدد الأجزاء: ٢.

٢٦): **(مكارم الأخلاق)**: **تأليف**: الإمام أبي بكر عبدالله بن محمد بن أبـي الدنيا القرشـي البغدادي، دار صـادر بيروت، الطبعة الأولى ١٩٩٩.

٢٧): **(مشكاة المصابيح)**: تـأليف: محمـد بـن عبدالله الخطيب التبريـزي، تحقيـق: محمـد ناصـر الـدين الألبـاني، المكتب الإسلامي، الطبعة الثانية ١٤٠٥هـ = ١٩٨٥ م.

٢٨): **(مفـردات ألفـاظ القـرآن)**: تـأليف: العلامـة الراغـب الأصفهاني، تحقيـق: صـفوان عـدنان داوودي، دار القلـم، دمشق، الطبعة الثانية: ١٤٢٣ هـ -٢٠٠٢م.

٢٩): **(موسـوعة نـضرة النعيم فـي مكـارم أخـلاق الرسـول الكريم)**: إعداد: مجموعة من المختصين، بإشراف: صـالح بـن عبدالله بن حُمَيد، وعبدالرحمان بن محمد بن عبدالرحمان بن ملُّوح، المملكة العربيـة السعودية، جدة، الطبعـة الثامنـة: عدد الأجزاء: ١٢.

٣٠): **(الأدب المفرد)**: المؤلـف: محمـد بـن إسماعيل أبـو عبدالله البخـاري الجعفـي دار البـشائر الإسـلامية، بيـروت الطبعـة الثالثـة، ١٤٠٩ ـ ١٩٨٩، تحقيق: محمد فؤاد عبدالباقي عدد الأجزاء: ١، الأحاديث مذيلة بأحكام الألباني عليها.

٣١): (أعظم الحسنات عندالله): تأليف: جاسر بركات، مكتبة الصَّفَا، القاهرة، الطبعة الأولى ١٤٢٩ ـ٢٠٠٨م.

٣٢): (خُلُق الْمُؤمن): تأليف: د. مصطفى مراد، دار الفجر التراث، القاهرة، الطبعة الثانية: ١٤٣١ هـ ـ٢٠١٠م.

٣٣): (شعب الإيمان): تأليف: أبو بكر أحمد بن الحسين البيهقي، دار الكتب العلمية، بيروت الطبعة الأولى، ١٤١٠ تحقيق: محمد السعيد بسيوني زغلول عدد الأجزاء: ٧.

٣٤): (فضائل سور القرآن الكريم دراسة ونقد): تأليف: الدكتور: إبراهيم علي سيد علي عيسى، الطبعة الخامسة، دار السلام، ١٤٣١ ـ ٢٠١٠م.

٣٥): (فضل الصلاة على النبي صلى الله عليه وسلم): المؤلف: إسماعيل بن إسحاق الجهضي القاضي المالكي، المكتب الإسلامي، بيروت، الطبعة: الثالثة ـ ١٩٧٧، تحقيق: تحقيق العلامة المحدث محمد ناصر الدين الألباني، عدد الأجزاء: ١.

٣٦): (مختصر صحيح البُخاري المسمى بالتجريد الصريح): دانراوى: أبي العباس زين الدين الزبيدي، بە كوردى كردنو لێكۆڵینەوەی: نوری فارس حەمەخان، چاپی یەکەم، کتێبخانەی ئارام ٢٠٠٢.

٣٧): (المتجر الرابح في ثواب العمل الصالح): للإمام الحافظ عبدالمؤمن بن خلف الدمياطي، تخريج أيمن بن عارف الدمشقي-مكتبة التراث الإسلامي القاهرة.

٣٨): (پوختەی سەحیحی موسلیم): وەرگێڕانی لێژنەیەك، ساڵی چاپ ٢٠١١.

(التاج الجامع الأصول في أحاديث الرَّسول)، دانراوى: مامۆستا شێخ مەنصور على ناصف، وەرگێڕانی نوری فارس حەمەخان، چاپی چوارەم، دار المعرفة، ٢٠٠٨.

٣٩): (إقتـران النيـرين فـي مجمـع البحـرين): تەرجەمـەی حەدیسەکانی موسلیم‌و بوخاری دانراوی: مامۆستا مەلا ڕەشید بەگی بابان، لێکۆڵینەوەی محمد علی قەرەداغی، ١٤١٠ — ١٩٩٠.

٤٠): (خواپەرستی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان‌و سوننەت دا)، نووسینی: علی باپیر، چاپی یەکەم، نووسینگەی تەفسیر ١٤٣٠-٢٠٠٩.

٤١): (تەفسیری قورئـانی بـەرزو بـەپێز): نووسینی: علی بـاپیر، تەفسیری سووڕەتەکانی فاتیحەو بەقەڕەو ئالی عیمڕان...، چاپی یەکەمی بەقەڕەو ئالی عیمڕان، دار المعرفة.

٤٢): (پوختەی تەفسیری قورئان): نووسینی: محمد مەلا صالح، چاپی چوارەم.

٤٣): (ڕێگای صالح بوون‌و بەرەو خوا چوون): نووسینی: عەلی باپیر، چاپی پێنجەم، نووسینگەی تەفسیر.

٤٤): (قـەڵای مـسوڵمان لـە زیکـری ڕۆژنـەو شـەوانە): ئامـادەکردنی: حەمزە بەرزنجی.

٤٥): (جوانترین داستان چیرۆکی قورئان): نووسینی: شێخ محمد شێخ تاها بالیسانی، چاپخانەی نارین، چاپی یەکەم ٢٠١٣.

# ناوەڕۆك

بابەت
لاپەڕە

